


زنجیرە کتێبی گۆڤاری کۆچ

ژمارە ( ٢٢ )

# کفری و شێخی نەمر..

# نەوەد ساڵەی جاڕدانی حکومەتی کوردی

ئامادەکردنی

م. عەلی

٢٠١٣

پێناسەی کتێب

**ناوی کتێب: کفری و شێخی نەمر...**
**نەوەد ساڵەی جاڕدانی حکومەتی کوردی**
**بابەت: وتار و لێکۆڵینەوە**
**ئامادەکردنی: م. عەلی**
**تایپ: نووسەر**
**دیزاینی بەرگ و ناوەڕۆك: حیکمەت مەعروف**
**چاپخانە: بینایی**
**تیراژ: ٥٠٠ دانە**
**ژ. سپاردن: لە بەڕێوەبەرێتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارە ( ١٧٩٨ ) ی ساڵی (٢٠١٣) ی پێدراوە.**

بە چاودێری بەڕێز (هێرۆ خان) خانمی یەکەمی عێراق و بە دروشمی (کفری لانکی شۆڕشگێڕییە، با بە زیندوویی رابگیرێت)، بەڕێوەبەرایەتی شوێنەواری گەرمیان و فەرمانگەی رۆشنبیری کفری فیستیڤاڵی (کفری و یادی ٩٠ ساڵەی جاڕدانی حکومەتی کوردی لەلایەن شێخی نەمرەوە) بەڕێوەدەبەن.

## ئامانج لەم فیستیڤاڵە

یادهێنانەوەی مێژووی پرشنگداری شاری کفرییە کە پێگەیەکی گرنگی لەڕووی سیاسی و ئابوورییەوە هەبووە و وێستگەیەکی یڕبایەخی هەوڵ و تێکۆشانەکانی شێخی نەمریش بووە کە شایەنی ئەوەیە ئەم فیستیڤاڵەی تیادابکرێت.

بە دەرفەتیشی دەزانین ساڵانە رۆژی (٢٢)ی ئەیلول وەکو رۆژی کفری بناسرێت و بەرپرسانی هەرێمی کوردستانیش لایەکی بسۆزانە لەم شارە پڕشکۆی مێژوویی و سیاسی و خاوەن سەروەرییانە بکاتەوە و بایەخی پێبدرێت.



**گەر مانیعی حەقی میللەتی کورد بن عەرەب**

**بێشـــك نوێژەکانم بە کـــوردی قـەزا ئەکەم**

**شێخی نەمر**

**کـە ڕۆیشتی، بەجاریێ من دڵێ و جـەرگ و هـەنـاوم کــەوت**
**کە چوویتە (تانە)، تانەی سەر گلێنەی هەردوو چاوم کەوت**
**دەڵێن هـاتوویتە (کوێت) قـوربان، بڵێ قوربانی کوێتی کەم**
**کـــە نۆبەت بەر ســـەری نەحسی شکاوی بێکڵاوم کـەوت**

**حەمدی**



## پەیڤێک

کفری مەڵبەندی شۆڕشگێڕانە، هەرگیز لەبەردەم پلانە نگریسەکانی دوژمناندا نەچەمیوەتەوە، بەڵکو دیرۆکێکی پڕ لە ئازایەتی هەیە و رۆڵە چاونەترس و گیانبازەکانی هەمیشە لەهەموو قۆناغە جیاجیاکانی خەباتی نەتەوایەتی و نیشتمانیدا لە خۆبەختکردندا درێغییاننەکردووە.

١٩٢٢/٩/٢٢ رۆژێکی پرشنگدارە لە مێژووی شاری کفریدا، پەیوەندی بە بۆنەیەکی گرنگی نەتەوایەتییەوە هەیە کە شێخ مەحمودی مەلیکی کوردستان دێتە ئەم شارە و کۆنگرە دەگرێ و جاڕی حکومەتی کوردی دەدات.

بەمبۆنەیەوە رۆژی ٢٠١٢/٩/٢٢ بە چاودێری بەڕێز خانمی یەکەمی عێراق "هێرۆ برایم ئەحمەد" لە یادی ٩٠ ساڵەی شکۆی ئەو هاتنەی شێخی نەمر و جاڕدانی حکومەتی کوردیدا، فیستیڤاڵێك لە شاری کفری بەڕێوەچوو.

ئەم فیستیڤاڵە دوو رۆژی خایاند.. تیایدا جگەلە رێوڕەسمی ئەتەکێتیی وتارخوێندنەوە و چالاکی هونەری، کۆمەڵێك بابەت و لێکۆڵینەوە لەلایەن کۆمەڵێك توێژەرەوە لەبارەی مەلیکی کوردستان و

هەلومەرجی جاڕدانی حکومەتی کوردی و رۆڵی گەرمیانییەکان لە جووڵانەوەکانی شێخی نەمردا پیشکەشکران.

لیژنەی باڵای فیستیڤاڵ بەباشیزانی کەوا ئەو بابەت و لێکۆڵینەوانەی لە فیستیڤاڵەکەدا پێشکەشکران بکرێتە کتێب و بڵاوبکرێتەوە و بکەوێتە بەردەستی خوێنەران.

بەو ئومێدەی لە یۆبیلی زێڕیندا بتوانرێ بەشێوەیەکی شایستە و ئاستێکی باڵاتر و بابەتی بەپێزتری شایانی شکۆی مەلیکی کوردستان و کفریش ئەم یادە مەزنە بڕازێنرێتەوە.

مایەی نیگەرانییە هەندێ کەموکوڕی بەتایبەتی لە تۆمارکردنی بابەتەکانی فیستیڤاڵەکەدا روویدا کە ئەمەش کاریگەرێتی لەسەر دواکەوتنی چاپکردنی کتێبەکە هەبوو.. بەداوای لێبووردنەوە وتاری هەردوو بەڕێزان جێگری سەرۆکی حکومەتی هەرێم و بەڕێز سکرتێری حیزبی سۆسیالیست دیموکراتی کوردستان دوای چاوەڕوانییەکی زۆریش هەر بەردەست نەبوون و نەتوانرا بخرێنە ناو دوو بەرگی ئەم کتێبەوە.
بە گەورەیی خۆتان ببانبوورن.

**لیژنەی باڵای فیستیڤاڵ**



## وتاری فیستیڤاڵ

**م. عەلی**

بەڕێز هێرۆ خان خانمی یەکەمی عێراق

بەڕێز نوێنەری وەزیری ڕۆشنبیری حکومەتی هەرێمی کوردستان

بەڕێزان نوێنەرانی حیزب و لایەن و دەزگا حکومییەکان

بەڕێزان نوێنەرانی بنەماڵەی حەفید

رووناکبیران و نوێنەرانی میدیاکان

میوانە ئازیزەکان

دانیشتوانی شاری کفری خۆشەویست

زۆر بەخێربێن بۆ ئەم فیستیڤاڵە..

٩٠ ساڵ پێش ئێستا لە هەلومەرجێکی دایساودا شێخی نەمر لەلایەن ئینگلیزەکانەوە ئازادکرا و گەڕێنرایەوە کوردستان، لە یەکەم وێستگەی گەڕانەوەکەیدا لایدایە شاری کفری.. ئەمەش لەخۆیدا واتایەکی گرنگ و بایەخداری هەبوو.

ئێمە لە سۆنگەی ئەو بایەخەوە دەڕوانینە ئەو مێژووە و بەچاکمانزانی کە ئەم بۆنە گرنگە جارێکیتریش بخەینەوە بەر زەینی خەڵکیی تا چەندساتێك لەگەڵ یادەوەری رابردووی ئەم گەرمیانەدا و بەتایبەتی شاری کفری بژین کە تۆمارێکی پڕ لە جموجووڵ و کاری شۆڕشگێڕی و بەگژاچوونەوە هەبووە.

بەڕێزان..

کفری شارێکی دێرینە و لە سەرچاوە مێژووییەکاندا ناوی هاتووە، لە سەردەمی عوسمانیدا ناوەندی قەزای سەلاحییە بووە و لە سەردەمی دەسەلاتی تازەی عێراقدا بووەتە کفری و سەر بە لیوای کەرکوك بووە. شوێنی ئەم شارە پێشتر بە چەند کیلۆمەترێك لە خواراوای ئێستادا بووە و پێیوتراوە ئاسکی کفری و هێڵی شەمەنەفەری (بەغدا-کەرکوك)ی بەلاداتێدەپەڕی و لەڕووی ئابوورییەوە سەرەڕێی کاروانی (بەغدا - سلێمانی) بووە و جموجوولێکی بازرگانی زۆری تێدابووە و خەڵکێکی زۆری لەملاولاوە بۆ هاتووە و

ئاوەدانیانکردووەتەوە.. ئاسەواری مێژوویی کۆنی تێدایە و سەرچاوەی نەوت و قیر و هەندێ کانزایتری لێیە. بەلاّم رژێمە یەك لەدوای یەکەکانی عێراق لەڕووی گەشەپێدان و ئاوەدانکردنەوە بایەخیانپێنەداوە و هیچ دیمەنێکی پێشکەوتووی پێنەبەخشراوە.. سەرەڕای ئەوەی لەهەموو سەردەمەکاندا کەوتووەتەبەر شالاّوی زەبروزەنگی داگیرکەران و سەرکوتکراوە، هەر لە سەردەمی عوسمانی و بەریتانی و دەسەلاّتی تازە دروستکراوی عێراق تا رۆژگاری بەعسی لەناوچوو بەتۆپزی مامەڵەی دانیشتوانەکەی کراوە تادەگاتە هێنان و نیشتەجێکردنی عەرەب کە لە سەروبەندی راپەڕینی ١٩٩١دا بەجێیانهێشت.

هەر لە کۆنەوە ئەنجامی چەوسانەوە وای لە خەڵکی ئەم شارە کردبوو هەمیشە بیر لە شۆڕش و بەرەنگاربوونەوە بکەنەوە و دژی ئەو دەسەلاّتە بن کە داگیریکردوون. هەرئەمەش سروشتی خەڵکی کفری بووە کە هەرگیز ئامادەنەبوون بچنە ژێرڕکێفی داگیرکەرانەوە و بێدەنگ دانەنیشتوون، ئەگەرچی بەپێی هەڵکەوتی ناوچەکە لەڕووی رۆشنبیری و ئابووری و کۆمەلاّیەتییەوە لەگەڵ شوێنەکانیتردا کە لەپێشترن بەراوردناکرێ، لەگەڵ ئەوەشدا ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کە ئەم ناوچەیە بە گردەنشینی لەدایکبووبێ و لە چاڵی دواکەوتوویدا نێژرابێ و توانای هەڵسوکەوت و جموجوولّی شۆڕشگێڕانەی نەبووبێ، بەپێچەوانەوە هەر بزاوتێکی شۆڕشگێڕی لەکوردستاندا بەرپابووبێ کاری لەم ناوچەیەش

کردووە و بەشێوەیەك لەشێوەکان خەڵکەکەی پشکدارییانکردووە بەتایبەتی لە شۆڕشەکانی شێخ مەحمودی مەلیکدا چ لەڕووی دۆستایەتی و سۆزدارییەوە بێ یان بەکردەوە لەگەڵێدابوون یان خۆیان کارێکیان ئەنجامدابێ. جگەلەمەش خەڵکێکی باش پەیوەندییان بە حیزبی هیواوە هەبووە و لە سەروبەندی شۆڕشی ئەیلول و شۆڕشی نوێشدا قوربانی زۆریانداوە.

چونکە پەیوەندی نێوان گەرمیان و شێخ مێژینە بووە، هەرکە شێخی نەمر ئالآی شۆڕشی هەڵکردووە، خەڵکی گەرمیان بەپەرۆشەوە پشتیوانییان نیشانداوە و پردی دۆستایەتی و هاوکارییان بەستووە.. یەکەم هەنگاوی بەشداریکردنیش شەڕی شوعەیبە بووە کە ئەوکاتە کفری ناوەندی سەرەکی گەرمیان بووە، هەروەکو عومەر مەعروف بەرزنجی لە لاپەڕە ٥٢ی کتێبی (مەحمود خانی دزڵی)دا نووسیویەتی: (تەنانەت خەڵکی گەرمیان لە شەڕی شوعەیبەدا هاوکاری شێخ بوون لە دژی هێزەکانی ئینگلیز لە ساڵی ١٩١٥).. کە شێخ لەم بەشداریکردنەدا مەبەستی سیاسی هەبووە نەك ورووژاندنی هەستی ئایینی رووت..

کاتێکیش شێخ دەگیرێ و لە وڵات دووردەخرێتەوە، ئەمە خەڵکیی تووڕەدەکات و لە هەلێك دەگەڕان بۆ تۆڵەکردنەوە بەتایبەتی دەسەڵاتدارێتی ئینگلیز لەناو شاری کفریدا توندوتیژی دەنواند، ئەو

ستەم و زۆرەی لەو خەڵکە دەکرا و ئەو هەڵوێستەی ئینگلیز بەرامبەر بە شێخ، وایکرد پێکهاتەکانی خەڵکی کفری بە رابەرایەتی برایم خانی دەلۆ هەڵبکوتنەسەر بارەگای ئینگلیز و سەلەمۆنت بکوژرێ و کفری بەتەواوی بکەوێتە دەست شۆڕشگێڕان، تەنانەت ژنانیش لەمەدا نەخشی بەرچاویان هەبووە.

ئەنجامی پەرەسەندنی ناڕەزاییەکانی کورد وایکرد ئینگلیز بەرنامە خۆی بگۆڕێ و بەپێی قسەکانی دێڤید ماکداوڵ: (بریتانیا بەمەبەستی رووبەڕووبوونەوەی هەڕەشەی تورکەکان لە شێخ خۆشبوو و هێنایەوە کوردستان).. شێخ لەگەڕانەوەیدا لایدایە شاری کفری.. بەپێی قسەکانی شێخ لەتیفی حەفید کە لەیاداشتەکانیدا هاتووە: (شێخ لە بەغداوە گەیشتە کفری و ژمارەیەکی زۆر هاولاتی کورد و عەرەب لەتەکیدا هاتن، کفری لەوڕۆژەدا جمەیدەهات، کەژاوەی شێخ لە ئێزگەی شەمەندەفەری کفرییەوە بۆ ناوشاری کفری جوولا.. دانیشتوانی کفری بە هەژار و دەوڵەمەندیەوە لە سەروویانەوە محسن ئاغا بۆ ئەم پێشوازییەی شێخ و هاوڕێکانی خۆیان ئامادەکردبوو).

بەپێی قسەکانی شێخ لەتیفی حەفید کە لەیاداشتەکانیدا هاتووە شێخ لە کفریدا دوو کۆنگرەی بەستووە، لە کۆنگرەی یەکەمدا کە کۆمەڵێك پیاوی گەورەی وەکو مستەفا پاشا یامولکی بەشداربووە، کۆمەڵێك بڕیاری گرنگی تێدادەدرێت وەکو:

- دانانی شێخ مەحمود بە مەلیکی کوردستان و باوەڕپێکردنی.
- بەرزکردنەوەی برووسکەی سوپاسنامە بۆ حکومەتی بەریتانیا بە بۆنەی دانانی شێخ مەحمود بە مەلیکی کوردستان.
- بەرزکردنەوەی برووسکەی سوپاسنامە جارێکیدی بۆ حکومەتی بریتانیا بە بۆنەی دامەزراندنی حکومەتی کوردییەوە و هەستی بەسۆزدەربڕینیان بەرامبەر بە گەلەکەی.

کۆنگرەی دووەمیش بۆ چۆنیەتی رۆیشتنەوەی شێخ بوو بۆ سنووری سلێمانی کە بڕیاروابوو لەڕێگەی کەرکوکەوە بڕوات، بەڵام کۆنگرە وای بەچاکزانی لەناو قووڵایی گەرمیانەوە بچێتەوە و دوای چەند رۆژێك لە گەیشتنەوە سلێمانی خۆی وەکو مەلیکی کوردستان راگەیاند و حکومەتی دامەزراند.

لەمڕووەوە هەندێك وادەزانن ئێمە مەبەستمان دامەزراندنی حکومەتە لە کفریدا، کەچی ئێمە دەڵێین یادی ٩٠ ساڵەی جاڕدانی حکومەتی کوردی کە دیارە باسکردن و جاڕدانەکەی لەو کۆنگرەیەی کفریدا بووە و دامەزراندنەکەی لە سلێمانی بووە.

ئەوەی گرنگە لێرەدا ئاماژەی بۆبکرێت ئەوەیە کە کەرکوك و کفری - کە کفری ناوەندی سەرەکی گەرمیان بووە - وێستگەیەکی گرنگی پڕبایەخی هەوڵ و تێکۆشانەکانی شێخی نەمر بووە و داگیرکەران هەوڵیانداوە ناوچەی کەرکوك و کفری لە قەڵەمڕەوی شێخی نەمر دابڕن،

چونکە شێخ ئامانجی ئەوەبووە کە کۆنترۆڵی هەموو کوردستان بکات.. هەروەکو دێڤید ماکداوڵ دەڵێت: (شێخ مەحمود کە ئێستا پلەی پێشووی وەدەستکەوتبووەوە، زۆرتر بیری لە دابینکردنی دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردی دەکردەوە، کەمکەم خەریکی راکێشانی سەرەکهۆزەکان و هەتا ژمارەیەك سەرۆکی ناوچەی کەرکوك بوو کە لە دەرەوەی قەڵەمڕەوی سلێمانی بوو، بەو مەبەستە کە ئەوان رازیبکا وەکو سەرۆکی کوردستانێکی سەربەخۆ دانیپێدابنێن، داخوازییەکانی کوردەکانی دەرەوەی ناوچەی سلێمانی بخرێتەناو قەڵەمڕەوەکەی و لە تشرینی دووەم خۆی بە مەلیکی کوردستان دانا)، بەلاّم پیلانەکان لەوە گەورەتربوو.

بەڕێزان..

بەرنامەی کاری ئەم فیستیڤاڵە بریتییەلە دوو ئاست:

- تیۆری کە کۆمەڵێك توێژینەوە لەلایەن توێژەرانەوە پێشکەشدەکرێت کە پەیوەستن بە گەرمیان و شێخی نەمرەوە.

- چالاکی هونەری و پیشانگایەك لە ماڵی سەید محسن ئاغا کە قۆناغی شێخی نەمر بووە و ئەو شتانەی شێخ بەکاریهێناوە تائێستا پارێزراون.

ئومێددەکەین ئەم دوو رۆژەی فیستیڤاڵ ماوەیەکی بەپێزبن و ئێمەش توانیبێتمان تیشکێك بخەینەسەر ئەو رۆژگارەی کفری و پەیوەندی خەڵکی گەرمیان و کفری بە شۆڕش و تێکۆشانەکانی مەلیکی کوردستان.

ئەو شارەی سەردەمانەی ناوەندێکی بازرگانی و شارێکی پڕ جموجووڵی سیاسی و کۆمەلایەتی و رووناکبیری و هونەری و پێگەیاندنی گەورە پیاوان بووە تا ئەوڕادەیەی کۆمەڵێك کەسایەتی بوونەتە وەزیر و دواتر بە شاری وەزیران ناوبراوە، بەلاّم بەهۆی ئەو گۆڕانکارییانەی لە دیمۆگرافیای ناوچەکەدا روویداوە و هەندێ شوێنیتر ئاوەدانکراونەتەوە ئیتر کفری ئەفەرۆزکراوە و ئەو بایەخە جوگرافییەی جارانی نەماوە و تەنیا وەکو شوێنێکی نیشتەجێبوونی رووت ماوەتەوە.. ئێمە دەزانین لەسایەی ئەو ئازادییەی بە رەنج و ماندووبوونی تێکۆشەران و خەڵکی ئازای کوردستان دەستەبەربووە، ئاوەدانی هەموو لایەکی گرتووەتەوە کە دیارە بێکەموکوڕیش نییە، کفریش لەورووەوە کاری تێداکراوە، شتی بۆ کراوە، بەلاّم دیسانەوە کفری زۆر گوناحە.. بۆیە ئەرکی حکومەتی هەرێمی کوردستان و دەزگا و لایەنە بەرپرسەکانە ئاوڕێکی جیدیتر لەم شارە بدەنەوە و باشتر خزمەتیبکەن و پرۆژەیتری بۆ بکرێ تا رووی گەشی دەربکەوێ و هەندێك لە پرشنگیی جارانی بۆ بگەڕێتەوە.. ئەوەتا هوتێل، چێشتخانە، بازاڕی مۆدیرن، شوێنی گەشتیاری تێدا نییە کە ئەمانە لە زۆر لە شارەکانیتر بە ئاسایی هەن.. داوادەکەین کفری وەکو شارێکی کەلەپووری تەماشابکرێ و بودجەیەك بۆ مشتومالّکردن و ئیستیملاککردنی ئەو شوێنەوارانە تەرخانبکرێ.. خوازیارین ئەمە بە رەخنە نەزانرێ و تەنیا رووی ناز و گلەییمان هەیە و حکومەت بەبەری

ڕەنجی خۆمان دەزانین بۆیە ڕوویتێدەکەین و داوایلێدەکەین.. چاوەڕوانین.

خۆشەویستان..

لێرەدا بەپێویستی دەزانین کە زۆر سوپاسی بێپایانی دادە هێرۆ خان بکەین کە دڵسۆزانە بودجەی ئەم فیستیڤالەی بۆ دابینکردین.. هەمیشە پایەداربن بۆ خزمەتکردنی ئەم کوردستانە.

سوپاسی ئەو کەس و لایەنانە دەکەین کە ئامادەبوون یارمەتیمانبدەن، هەروەها سوپاس بۆ هاوکاریکردنی دامودەزگاکانی ئیدارەی کفری.

سوپاسی ئەو توێژەرە بەڕێزانە دەکەین کە لە کاتی خۆیان گرت و سەرقاڵی ئامادەکردنی بابەتەکانیان بوون بۆ ئەم بۆنە گەورەیە.

فرە سوپاس بۆ ئامادەبوونی هەموو لایەکتان.. ئەرکتانکێشا.

هەر خۆشبن.

**لیژنەی باڵای فیستیڤاڵ**

**کفری**

**٢٠١٢/٩/٢٢**



## وتاری جێگری سەرۆکی
## حکومەتی هەرێمی کوردستان

### لەلایەن بەڕێز زیرەك کەمالەوە

ئامادەبووانی بەڕێز و خۆشەویست،

بەشداربووانی فیستیڤاڵ،

ئەو کاتەتان باش..

سەرفرازین و خۆشحاڵین کە ئەمڕۆ لە کفری خۆشەویست و سەرزەوینی گەرمیان، پایتەختی تراژیدیاکان و هەواری تەحداکردنی ئەنفال و سیاسەتی پاکتاوکردنی رەگەزی ڤیستیڤاڵ بۆ شێخ مەحمودی

نەمر، یەکەم مەلیکی کوردستان و حکومەتەکەی سازدەکرێ.. ئەو سەرکردە قارەمان و بلیمەتەی توانی بە پاڵپشت بە گەلە قارەمانەکەی توانی حکومەتی کوردستانی جنوبی رابگەیەنێت و بەمەش بۆ هەموو لایەك بیسەلمێنێت کە گەلی کورد تینووی ئازادی و بونیاتنانی قەوارەی نیشتمانی و نەتەوەیی خۆیەتی.

هەروەها دەستخۆشی لە رۆڵەکانی گەرمیان دەکەین کە بەم ڤیستیڤاڵە دیسان تەئکیدیان لەوە کردەوە کە جگەلەوەی تەحداکاری ئەنفال و سەرجەم تراژیدیاکان بوون، لەهەمانکاتدا دەیسەلمێنن کە نەوە و رۆڵەی مەلیك مەحمودی نەمرن و بەرێز و بەوەفا و ئەمەکناسییەوە لە رۆڵ و خزمەت و قوربانی داهێنانی مەلیکی سەرکردەیان دەڕوانن و بەمەش ئەو راستییە بەرجەستەدەکەنەوە کە ئێستای ئازادی بەرهەمی خەبات و تێکۆشانی وەکو مەلیك مەحمودی نەمر و چەندین سەرکردە و قوربانیتری بزووتنەوەی رزگاریخوازی گەلەکەمانە.

ئازیزان..

لای هەمووان روون و ئاشکرایە کە سەدەی بیستەم سەدەی گەشەکردنی هەست و هوشیاری نیشتمانی و نەتەوەیی بوو، سەدەی رابوون و شۆڕشی گەلانی ژێردەست بوو لەبەرامبەر زوڵم و ستەم و بێدادی.. دیارە لە نیوەی یەکەمی ئەو سەدەیەشدا شێخ مەحمودی

سەرکردە و کوردپەروەر بەسوودوەرگرتن لەو گۆڕانکاری و هاتنەئارایەی هەلومەرجێکی نوێی جیهانی کە خۆی لە کۆتایی جەنگی جیهانی یەکەم و تێکشکاندنی دەوڵەتی عوسمانی و سەرکەوتنی شۆرشی ئوکتۆبەر و بلاّوبوونەوەی بەیاننامەی هاوبەشی بەریتانیا و فەرەنسا کە داوای سەربەخۆیی گەلانی ژێدەستی حوکمڕانی عوسمانییەکانی دەکرد بەپشتبەستن بە گەلەکەی خۆی توانی شۆڕشێکی پڕ لە ئیرادەی پۆلاّیینی بەرپا کرد و دوای هەوراز و نشێو و قوربانییەکی زۆر، توانی ئەو شۆڕشە بگەیەنێتە ئەو وێستگەیەی کە لە ١٩١٨/١١/١ لە مەراسیمێکی نەتەوەیی گەورەدا ببێتە مەلیکی کوردستان و دوای ئەوەش بەمەبەستی ئیدارەدان و رێکخستنی ژیانی سیاسی و ئیداری و کۆمەلاّیەتی لە سنووری دەسەلاّتی خۆی لە ١٩٢٢/١٠/١٠ شێخی نەمر یەکەمین کابینەی حکومەتی بە سەرۆکایەتی شێخ قادر دامەزراند کە کۆمەڵێك وەزارەتی وەکو: فەرهەنگی، بەرگری، دارایی، ناوخۆ، ئابووری، دادی لەخۆگرتبوو.. ئەوەبو ئەو حکومەتەی لەماوەیەکی کەمی دیاریکراودا توانی چەندین دەستکەوت و خزمەتگوزاری گرنگ پێشکەشی میللەتەکەی بکات.

هەڵبەت زۆرن ئەو بەرهەم و دەستکەوت و داهێنانەی کە مەلیك مەحمود و حکومەتەکەی بۆ قۆناغی ئەوکاتە لەسەر زەمین و واقیعدا چەسپاندیان کە لەسەر ئاستی سیاسیدا بریتیبوولە پێکهێنانی حکومەت

و کە بۆ ئەوکات لەسەر ئاستی عیراق و کوردستان ئەزمونێکی نوێبوو، هەروەها لەسەر ئاستی کوردستانیش بۆ یەکەمینجار بوو لە مێژووی ئەم وڵاتەدا بزووتنەوەی سیاسی شۆڕشگێڕ ئەزمورونی حوکمڕانی لەسەر بنەمایەکی مۆدێرنە دابمەزرێنێ، مەلیك مەحمودی نەمر شانبەشانی خەبات و ڕەنێوهێنانی دەستکەوتی سیاسی بۆ گەلەکەمان، هەروەها لەسەر ئاستی کلتوری و فەرهەنگیشدا بزووتنەوەیەکی ڕۆشنبیری فراوانی دەستپێکرد.. بانگی هەق، بانگی کوردستان، ئۆمێدی ئیستیقلال و چەندین کەناڵێتری ڕۆژنامەگەری و چاپەمەنی گەواهیدەری ئەو ڕاستییەن کەوا سەرکردەی بەوەج و کوردپەروەر مەلیك مەحمود کە چەند تینووی ئەوەبووە کە گەلەکەی لە زوڵم و ستەم و بێدادی رزگاربکات ئەوەندەش لە هەوڵی ئەوەدابووە کە وشیاری کۆمەڵگاکەی لەسەر ئاستی کەلتوری و فیکری و کۆمەڵایەتیش بەرەو پێشەوە ببات.

خۆشەویستان..

ئەگەرچی دوژمنانی گەلی کورد توانیان لە سەرەنجامدا چرای گەشی ئەو شۆڕش و حکومەتە خامۆشبکەن، مەلیك مەحمودی نەمریش چەندینجار دووچاری بریندارکردن و ئاوارەیی و دەربەدەری بکەن، بەڵام دواتر هەر ئەو داهێنان و دەستکەوت و ڕەهەندە بنچینەییەکانی ئەو حکومەت و شۆڕشە بوون کە دواتر بوونە ژێرخانی بەردەوامیدان بە

شۆڕش و بزووتنەوەی ئازادیخوازی گەلی کورد لە کوردستانی باشور و بگرە لە سەرجەم پارچەکانیتری کوردستان، هەروەها ئەم ڤیستیڤاڵەی کە ئێستا لە شاری خۆشەویستی کفری سازدەکرێت وەفا و ئەمەکی ئەم شارە بەرامبەر رابردووی پڕ لە سەرەوەی مەلیك مەحمودی نەمر و سەرجەم سەرکردە و تێکۆشەرانی رێگای ئازادی و دیموکراسی و بەختەوەری گەلی کورد نیشاندان.

هەر شاد و سەرکەوتووبن..

**عیماد ئەحمەد**

**جێگری سەرۆکی حکومەتی هەرێمی کوردستان**



## وتاری ئیدارەی کفری

### لەلایەن بەڕێز شێرکۆ حسێن
### قایمقامی کفرییەوە

خوشکی گەورە و بەڕێزمان هێرۆ خان

میوانە بەڕێزەکان،

لێپرسراوە حیزبی و حکومییەکان لەهەر ئاستێکدا بن،

بنەماڵەی بەرێزی شێخی حەفید،

هەموو لایەکتان بەخێربێن.

بەناوی قائیمقامییەتی قەزا و جەماوەری بە شەرەف و شۆڕشگێڕی کفرییەوە بەگەرمی بەخێرهاتنانەدەکەم.. سوپاسی ئامادەبوونتان دەکەم لە یادی (٩٠) ساڵەی سەردانی مەلیکی کوردستان شێخ مەحمودی حەفید بۆ کفری و جاڕدانی دەوڵەتی کوردی.

سەرەتا و پێش هەموو شت بەپێویستی دەزانم دەستخۆشی لە خاوەن بیرۆکەی ئەم یادە و هەموو ئەو کەسانە بکەم کە ماندوونەناسانە و خۆبەخشانە کاریان بۆ سەرکەوتنی کردووە، نموونەیان زۆربێ و دەستی ماندووییان دەگوشین.

دیارە گەورەیی و سەختی بەلا و نەهامەتییەکان هێندەی گەورەیی کەسەکان و شوێنەکانە، شارێکی وەکو کفری کە کاروانسەرای رێگاکانی ناوچەکە بووە و خاوەنزەوییەکی بەپیتبووە، حاشاهەڵنەگرە دوژمنان چاوی تەماعی تێدەبڕن و کارەساتی گەورەی بەسەردا دەهێنن، لەهەمانکاتدا گەورەیی رووداوە مێژووییەکان و بۆنەکان هێندەی گەورەیی کەسەکان و شوێنەکانە.

دیارە هەڵبژاردنی کفری لەلایەن شێخ نەمرەوە بۆ جاڕدانی حکومەتی کوردی هەر لەخۆوە نەبووە، دیارە پاش تاوتوێکردن و لێکۆڵینەوەی ورد ئەو بڕیارە مێژووییە پڕ لە حیکمەتە لەلایەن شێخی نەمرەوە دراوە، دیارە بەشێکی ئەو بڕیارەش پەیوەندی

بەگرنگیی و بایەخی کفرییەوە هەیە، خۆزگە کەسانی شارەزا و تایبەتمەند لێکۆڵینەوەی وردیان لەوبارەیەوە دەکرد و لایەنە شاراوەکانی ئەو بڕیارە مێژوویەیان بۆ ئێمە و بۆ نەوەکانی دوای خۆمان دەستنیشاندەکرد.

بەداخەوە کفری بەو هەموو مێژووە پڕ سەروەری و خەبات و بەو رابردووە جوانەیەوە، تاڕادەیەکی زۆر گرنگی خۆی لەدەستداوە و ئەمەش پەیوەندی بە هەڵکەوتەی جوگرافی شارەکەوە هەیە، ئێستا وەك خەڵکی کفری دەڵێن لە پەراوێزی کوردستانە.. ئەمەش دەسەڵاتی کەسی تێدانییە، چونکە پێشتر تاکە شاری ئەم ناوچەیە بووە و رێگای شەمەندەفەری لەسەربووە و بەدروستبوونی شاریتر و رێگای قیرتاوی زۆروزەبەند، ئاشکرایە کفری گرنگی خۆی تاڕادەیەك زۆر لەدەستدەدات.. بۆیە ئەرکی هەموو لایەکە وەك وەفایەك بۆ مێژووی کفری، هەوڵی چڕوپڕ بدەین بۆ بووژاندنەوە و گەشەکردنی.

راستە لەئێستادا شانبەشانی شار و شارۆچکەکانیتر سالآنە بودجەی بەپێی ژمارەی دانیشتووان بۆ تەرخاندەکرێ، بەلآم گەلێك شت هەن کە لە توانای بودجە تەرخانکردا نییە نۆژەنیانبکاتەوە، بۆ نموونە: خانووی مەجید پاشای بابان و بازاڕی کۆنی کفری کە دوو شوێنەواری پڕبایەخن و ئێستا بەرەو داڕمان دەچن.. بێگومان ئەگەر کارەکە وابڕوات ئەوا لەچەند ساڵی داهاتوودا ئەگەر بڕیاردرا

درامایەك لەسەر ئەم بۆنەیە بەرهەمبهێنرێت ئەوا جێگایەکی کۆمان دەستناکەوێت کە بۆ ئەوکارە دەستبدات.

بەداخەوە نە بودجەی ئێستای کفری لە پێویستییە هەنووکەییەکان زیاترە تا شوێنەواری پێنۆژەندەکرێنەوە و نە ئەندازیار و وەستا و کرێکاری شارەزامان هەیە لەو بوارەدا کە ئەو ئەرکە رابپەڕێنن.. لێرەدا ئەم دەرفەتە دەقۆزمەوە و داوا لە خوشکی ئازیز و بەرێزمان هێرۆخان و وەزارەتی رۆشنبیری بکەم کە هەوڵ و توانای خۆیان بۆ ئەم مەبەستە بەگەڕبخەن و ئەو شوێنەوارانە لەفەوتان بپارێزن.

لەکۆتاییدا لەبری هەموو ئەو بەڕێزانەی کە بەشداری ئامادەکردنی ئەو بۆنەیان کرد، داوای لێبوردن دەکەم لەهەر کەموکورییەك کە بێگومان روودەدات، نەك لەبەرئەوەی خوانەخواستە کەمتەرخەم و نەشارەزابوون، بەڵکو یادەکە ئەوەندە گەورەیە کە هەرچەندیان کردبێت بێگومان حەقی خۆیان نەداوەتێ و بەهیوای ئەوەی ئەگەر عومر باقیبێت و لە ڤیستیڤاڵی یادی سەد ساڵەدا ئەو کەمورتییانەش نەمێنن. جارێکیتر بەخێربێن و سەرچاومان هاتن.




## وتـــەی بنـــەماڵەی حـــەفید
## مەحمود شێخ کاوە حەفید

بەناوی خودای گەورە و میهرەبانەوە
ئامادەبووانی بەڕێز، خوشك و برایان،
میوانانی ئازیز..

ئەمرۆ یادی رۆژێکی مێژووییە یادی ٩٠ ساڵەی دامەزراندنی حکوومەتی باشووری کوردستانە، یادی شەهیدانی کوردستانە، یادی سەرکردەیەکی ئەم نەتەوەیە کە هەموو تەمەن و ژیانی خۆی لە بەربەرەکانی دوژمناندا بەسەربرد، یادی شێخ محمودی حەفیدە کە هیوا و ئاواتی رزگاری کوردستان و دامەزراندنی دەوڵەتێکی سەربەخۆ گەلەکەی.. ئەمڕۆ رێزدەگیرێت لە مێژووی نەتەوەیەك لە قوربانیدانی گەلێك لە شەهیدان و تێکۆشەران.

بەڕێزان..

سەبارەت بە شێخی نەمر وەك لە چەندین سەرچاوەدا ئاماژەپێکراوە کە لە زۆر بۆنەدا باسی ئەوەی کردووە کە هەر لە منداڵییەوە بیری لە ئازادی و لە سەربەخۆیی کوردستان کردووەتەوە، شێخ مەحمود لە تەمەنی منداڵیدا لەگەشتێکدا بۆ ئەستنبوڵ کە لە خزمەت شەهید شێخ سەعیدی حەفیدی باوکی دەبێت  و لەلایەن سوڵتانی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانلییەوە پێشوازیانلێدەکرێت.. باس لەو گەشتە دەکات و دەگێڕێتەوە کاتێك کە سەرنجیداوە لە ژیان و گوزەرانی دانیشتوانی شاری ئەستنبوڵ و ئەو دیمەنانەی کە بەچاوی خۆی بینیویەتی زۆر جیاوازبوون بەبەراورد لەگەڵ ژیان و گوزەرانی خەڵکی کوردستان دەڵێت: لە باوکمم پرسی لەبەرچی ئەم نەتەوەیە وا لە شادی و خۆشگوزەرانیدا دەژین و بەشی ژیانی گەلی ئێمەش برسیەتی و هەژاری و دەردەسەرییە ؟ شێخ مەحمود دەڵێت لەوەلامدا باوکم گوتی کوڕم ئەمان بۆ خۆیان دەژین و ئێمەش خۆراکی ئەوانیین و بۆ ئەوان دەژین . شێخ مەحمود دەڵێت لەوساتەوە هەستم بەو زوڵم و زۆردارییە کرد کە بەرامبەر گەلی کورد دەکرێت.. دەڵێت هەمیشە لە فیکری ئەوەدابووم رۆژگارێك بێتەپێش، ولاّت و گەلەکەم لە چنگی زۆرداران رزگاربکەم.

لە ساڵی ١٩٠٩ شێخ مەحمود هێشتا لاوێکی تازەپێگەشتووبوو کە لە پیلانێکی نەخشە بۆکێشراودا لە شاری موسڵ دەربازیدەبێت کە مخابن لەو پیلانەدا شێخ سەعیدی باوکی و شێخ ئەحمەدی براگەورەیی و

ژمارەیەکی بەرچاو لەلایەنگرانیان کە مەزندەدەکرێت بە ٤٠ شەهیدی قارەمان شەهید دەکرێن.

شێخ مەحمود بە موعجیزە رزگاریدەبێت ئەم رووداوە بە کارەساتی موسڵ لەمێژوودا تۆمارکراوە، پاش دەربازبوونی شێخ مەحمود و گەڕانەوەی بۆ کوردستان لەلایەن جەماوەر و هەموو عشیرەتەکانی کوردستانەوە پێشوازییەکی گەرمی لێدەکرێت و ئامادەیی نیشاندەدرێت بۆ هێرشکردنەسەر شاری موسڵ و تۆڵەسەندنەوەی خوێنی شێخ سەعید و شەهیدانی کارەساتی موسڵ، ئەگەرچی شێخ مەحمود لەوکاتەدا کە زۆریش دڵگەرمبووە و رووبەڕووی ئازار و ژانی ئەو کارەساتە گەورەیە بووبووەوە، بەڵام دووربینی و ژیری شێخ وایکرد کە ددانبەخۆیدابگرێت و داوا لە رۆڵەکانی گەلی کوردستان و عشیرەتەکانی کوردستان بکات کە ئارامبگرن و ئەو هێرشە رابگیرێت. مەبەستی شێخ مەحمود ئەوەبوو بەهێرشکردنەسەر شاری موسڵ قەتڵوعام دروستدەبێت و خەڵکانێکی زۆری بێتاوان دەکوژرێت و پاشان بۆ هەتاهەتایە شەڕ لەنێوان دوو نەتەوەی کورد و عەرەبدا روودەدات کە ئەوەش بەزیانێکی گەورە بۆ کورد دەگەڕێتەوە، شێخ مەحمود دەیزانی ئەو پیلانە لەکوێوە سەرچاوەیگرتووە ئەنجامدەرانی کێن و چ ئامانجێکیان هەبووە .

بەڕێزان..

شێخی نەمر بە هاوکاری تێکۆشەرانی رێبازی کوردایەتی هەرگیز سەنگەری خەبات و مقاوەمەتی بەرنەداوە و هەمیشە لە ریزی پێشەوەی

بەرەکانی جەنگدا سنگی بەگولەوەناوە و بەهیچ جۆرێك لە دوژمن نەسڵەمیوەتەوە، ئامانجی شێخ مەحمودیش تەنهاوتەنها رزگاری و سەربەستی کورد و کوردستان بوو جگەلەو ئامانجە پیرۆزە هیچ مەبەستێکیتری نەبووە، ئەو بنەما ئابوورییەی کە لە باپیرانیەوە بۆی بەجێمابوو دەستی بە شۆڕش و خەبات کرد و هەرچییەکی هەبوو خستییە پێناوی پڕۆژەیەکی نەتەوەیی مەزنەوە کە دامەزراندنی دەوڵەتێکی سەربەخۆ بوو بۆ گەلەکەی، هیچ لایەنێکی هەرێمی و نێودەوڵەتی پاڵپشتی سیاسی و هاوکاری دارایی لە شۆڕش و شێخ مەحمود نەکردووە لە ساڵی ١٩١٩ سەرەتای سەرهەڵدانی ناکۆکییەکان.. شێخ مەحمود و کەسایەتییە سیاسی و رۆشنبیرەکانی ئەو سەردەمە زۆر هەوڵیاندا بە ئاشتی و بە گفتوگۆ چارەسەری کێشەکانی نێوان کورد و ئینگلیزەکان بکەن و خوێن نەرێژرێت تەنانەت پێش بەرپاکردنی شۆڕش و داستانی دەربەندی بازیان شێخ مەحمود لەڕێگەی نوێنەرێکی تایبەتی خۆیەوە پەیامێك دەنێرێت بۆ حاکمی گشتی بریتانیا لە بەغداد زۆر بەڕاشکاوانە پێیاندەڵێت ئەگەر ئەوان ئارەزوویانە دەوڵەتێك بۆ کوردستان دابمەزرێنن و لە شێخ مەحمود رازینین ئەوە سوپاسگوزاری بریتانیا دەکات هەرکەسێکیان پێباشبێت لە باوەرپێکراوەکانی خۆیان ئەوە با بەبێ دوودڵی دەستنیشانیبکەن و شێخ مەحمود ئامادەیە یەکەم کەس بێت کە پیرۆزباییلێدەکات و قبوڵی فەرمانڕەواییەکەی دەکات و فەرمانەکانیشی جێبەجێدەکات.. سوپاسی هەڵوێستی بریتانیا دەکات، بەلاّم ئینگلیزەکان چونکە ئامانجیان نەبوو

پاڵپشتی لە دامەزراندنی دەوڵەتێك بۆ كورد بكەن لەو قۆناغەدا گوێیان بەو پێشنیارەی شێخ مەحمود نەدا.. گریمان ئەگەر ئینگلیزەكان ئامانجیان دامەزراندنی دەوڵەتی كوردستان بوایە لە سیاسەت و هەڵوێستی شێخ مەحمود رازینەبوون بێگومان دۆستان و لایەنگرانیان و تەنانەت مووچەخۆرەكانیان كەم نەبوون؟ بۆ یەكێك لەو دڵسۆزانەیان؟ دەكرێت ئەو پرسیارەبكرێت، پاش بەدیلگیرانی شێخ مەحمود بە برینداری لە بەرەكانی جەنگدا لەگەڵ شێخ **محەممەد** غەریب وەزیری ناوخۆی حكومەتی كوردستان لە دەربەندی بازیان و دادگاییكردنیان و دوورخستنەوەیان بۆ وڵاتی هیندستان و مانەوەیان بۆ ماوەی **٣** ساڵ لەزینداندا، ئایا بۆ ئینگلیزەكان بەڵێنەكانی خۆیان نەبردەسەر؟ بۆ كەسێكیان نەهێنا وەك فەیسەل و لەسەر عەرشی پاشایەتی دایبنێن؟ بەڵگەنامەكان سەلماندیان كە لەو سەردەمەدا لە ئەجیندای ئینگلیزدا هەرگیزنەبووە پاڵپشتی لەو دەوڵەتە بكات كە شێخ مەحمود و دڵسۆزانی نەتەوەی كوردستان رایانگەیاند و دایانمەزراند، بەڵام ئینگلیزەكان رووخاندیان و لەناویان برد پاشانیش لە سەردەمێكی جیاوازدا چارەنووسی كۆماری كوردستان لە مەهاباد بەهەمان چارەنووسی حكومەتی باشووری كوردستان گەیشت و هەروەها و بۆ جاری سێهەم لە مێژووی هاوچەرخی گەلەكەماندا لە پیلانێكی نێودەوڵەتیدا هەرەسیان بە شۆڕشی مەزنی ئەیلول هێنا.

بەڕێزان.. ئامادەبوانی خۆشەویست

بۆ بەرزڕاگرتنی یادی (٩٠) ساڵەی دامەزراندنی حکومەتی کوردستان و گەڕانەوەی شێخ مەحمودی نەمر و لە ولاّتی هیندستانەوە بۆ زێدی خۆی بەناوی بنەماڵەی حەفیدەوە سوپاسگوزاری خۆمان ئاراستەی سەرپەرشتیار و دەستەی ئامادەکاری و هەموو بەشداربووانی بەڕێزی ئەم ڤیستیڤاڵە دەکەین.. جێگەی شانازییە لای هەمووممان کە ئەم دەڤەرە بەتایبەت شاری کفری و ناوچەی گەرمیان بەگشتی بەدرێژایی شۆڕشەکانی کورد پاڵپشت و لانکەی شۆڕش و کوردایەتی بوون.. قوربانییەکی لەڕادەبەدەریان پێشکەش بە خاکی پیرۆزی نیشتمان کردووە، لە مێژووی خوێناویماندا هەمیشە پشکی شێر لە فیداکاری لە بەرۆکی ئەم دەڤەرە دراوە، لە سەرەتاکانی سەدەی بیستەمیشدا کاتێك هەستی ئازدیخوازنەی گەلی کورد لە جۆش و سەرهەڵداندا بوو، شاری کفری کوانووی خەباتی کوردایەتی و کۆڵنەدانبووە، خەڵکە شۆڕشگێڕەکەی چارەنووس و خواست و ئامانجەکانیان بە ئامانج و چارەنووسی شۆڕشەکانی شێخ مەحمودەوە گرێداوە وەك بەشێکی دانەبڕاو وەك ئەڵقەیەکی پێکەوەبەستراو سەربەرزانە هاتوونەتە کۆڕی خەباتی کوردایەتییەوە تەنانەت لە راپەڕینی ئیبراهیم خانی دەلۆدا خواست و داخوازییەکانی ئیبراهیم خانی دەلۆ هیچ جییاوازی نەبوو لەگەڵ ئەو ئامانجە پیرۆزەی کە شێخ مەحمود و گەلی کورد خەباتی بۆدەکرد ئەو هەڵوێستەش جێگەی شانازی هەمووانە و لەمێژوودا هەرگیز لەیادناکرێت .

بەڕێزان..

وەك سەرچاوە مێژووییەکان باسیدەکەن، لەکاتی گەڕانەوەیدا لە ئەسارەت و دوورخراوەییدا، شاری کفری یەکەمین وێستگەی شێخ مەحمود بووە هەر لەگەڵ گەیشتنی بۆ ئەم شارە لەلایەن جەماوەر و کەسایەتی و سەرۆك هۆز و عەشیرەتەکانی ئەم ناوچەیەوە بەشێوەیەك پێشوازیان لێکردووە و لەئامێزیانگرتووە کە بە نووسین ئەو دیمەنانە زەحمەتە لە چەند دێڕێکدا بتوانرێت بگێڕدرێنەوە و بنووسرێت مامۆستا ئەحمەد خواجە و مامۆستا رەفیق حیلمی لەیاداشتەکانیاندا بەدووردوودرێژی باسیان لەورۆژە مێژووییە کردووە سەبارەت بەم رووداوە و گەڕانەوەی شێخ مەحمود هەر لە شاری کفرییەوە بۆ شاری هەڵەبجە و قوربانی، مامۆستا رەفیق حیلمی دەڵێت: ئەو پێشوازییە بەجۆرێك بوو کە هەرگیز لەیادمناچێت جەماوەر فرمێسکی شادی لەچاوانیان دەتکا تەمەننای بۆئەوە کردووە کە حەیف لەورۆژگارەدا کامێرەی سینەمایی لەبەردەستنەبووە کە ئەو دیمەنانە تۆماربکات، هەروەها هەر لەکاتی گەڕانەوەیدا ژمارەیەك لە کاربەدەستە سیاسییەکانی ئینگلیز کە هاوڕێیەتیانکردووە سەرسامبوون بۆ ئەو پێشوازییەو لەبیرەوەریەکانیاندا ئاماژەیان بۆکردووە.

سەروەرییەکیتری ئەم شارە تێکۆشەرە لەکاتی گەڕانەوەیدا لە کۆبوونەوەیەکی فراوان و مێژوویدا بڕیار لە سەردامەزراندنی دەوڵەتی کوردستان درا کە ئەم شانازییەش هەر بە بالآی ئەم شارەدا بڕاوە، شاری کفری خاوەنی زۆر هەڵویستی جوامێرانە بووە پاش دوورخستنەوەی شێخ

مەحمودی نەمر بۆ ناوەڕاست و باشووری عێراق و بەسەربردنی ماوەی ١٠ ساڵ دوور لە کوردستان و نیشتمانەکەی لە ساڵی ١٩٣١ تا ١٩٤١ لەگەڵ راپەڕینی رەشید عالی گەیلانی دژی دەستەلاّتداری ئەو سەردەمەی حوکمی پاشایەتی لە عێراق هەلی دەربازبوونی شێخ مەحمود دەڕەخسێت هەر خەڵکی ئەم ناوچەیە بوو کە شێخ مەحمودیان دەربازکرد و لە شاری بەغدادەوە گەیاندیانەوە بۆ کوردستان بە سەلامەتی تاکو پشکۆی شۆڕش هەر لەگەشانەوەدا بێت.

بەڕێزان، ئامادەبووانی بەڕێز..

ناوچەی گەرمیان نەك هەر لە شۆڕشی شێخ محموددا پێشەنگی کاروانی کوردایەتی بوون، بەڵکو لە شۆڕشی مەزنی ئەیلولدا رۆڵێکی گرنگ و بنچینەییان هەبوو، هەزاران رۆڵەی قارەمانیان کردە قوربانی ئازادی و سەرفرازی گەلەکەمان، هەروەها لە پاش نسکۆی ساڵی ١٩٧٥ سەرهەڵدانەوەی شۆرشی نوێ خەڵکی تێکۆشەری ئەم ناوچەیە رۆڵێکی بەرچاویان بینی و هەزارەها رۆڵەی قارەمانیان لەو شۆڕشانەدا بوونە شەهیدی رێگای سەرفرازی وسەربەستی و ئازادی کورد و کوردستان.

بەڕێزان..

سوپاس بۆ خودای مەزن و میهرەبان پاش بەرگری و مقاوەمەتێکی کەموێنە و پاش نەپسانی ٩٠ ساڵ شۆڕشی بەردەوام، پاش بەخشینی دەریایەك لە خوێنی شەهیدان، پاش ئەنفال و جینوساید و کیمیاباران، ئیرادەی پۆلاّیینی گەلی کوردستان نەڕووخا و هێزی پێشمەرگەی کوردستان

لە کۆڕی تێکۆشان و خەبات دەستیانبەرنەدا و سەرئەنجام ئەم ئازادی و سەربەستییەی لێهاتەبەرهەم کە ئەمڕۆ هەموومان سەربڵند و سەربەرزین کە لەژێر سایە و ئالآی پیرۆزی کوردستان و حکومەتی کوردستاندا ژیان بەسەردەبەین.، بۆیە ئەرکی سەرشانی هەمووومانە قەدر و قیمەتی ئەم ئازادییە لەبەرچاوبگرین و هەمیشە سەری ڕێزونەوازش بۆ شەهیدان و خانەوادە بەڕێزەکانیان نەویبکەین و حورمەتی تێکۆشەران و بەها و شکۆی پێشمەرگە گیانبازەکان و ڕەنجی سەرکردەکانمان لەبەرچاوبگرین و بزانین کە ئەم ڕۆژگار و ئەم ئازادییەی کوردستان هەروا لەخۆوەنەهاتووە پێویستە بەگیان و ڕۆحی خۆمان ئەم دەستکەوتانە بیپارێزین و ئەرکی سەرشانی هەمووانە کە پابەندبین بە برایەتی و یەکڕیزی نێوانمان، چونکە وەك مێژوو دەیسەلمێنێت هەموو ماڵوێرانی و لەدەستدانی چەندین هەل و فرسەتی زۆر کە لەڕابووردوودا لەدەستماندەرچووە تەنهاوتەنها هۆکارەکانی نەبوونی یەکهەڵوێستی و شپرزەیی ریزەکانمان بووە.. تاقیکردنەوەکانیش دەیسەلمێنن کاتێك ریزەکانی شۆڕشی کورد یەکگرتووبووە سەرکەوتنی گەورە بەدەستهاتووە، بۆ نموونە بەرەی کوردستانی کە سەرئەنجام ڕاپەڕینی بەهاری ساڵی ١٩٩١ی لێهاتەبەرهەم و کوردستان ئازادبوو، هەروەها ڕێکەوتنی ستراتیژی نێوان هەردوو پارتی دەستەڵاتداری کوردستان بە شاکارێکی کەموێنە لە مێژووی گەلەکەماندا تەماشادەکەم، چونکە توانییان بەم ڕێکەوتنە ئیرادەی گەلەکەمان یەکبخەن و هەرەس بە ئاواتی دوژمنانی کورد و کوردستان بهێنن.. تەمەننای ئەوە دەکەم لە هەوڵەکانیان

بەردەوامبن تا ئەو ڕێکەوتنە فراوانتربکرێت و هەڵکشێ بەرەو لوتکە و هەموو پارتە سیاسییەکانی کوردستان بگرێتەوە تابتوانیین بە یەکهەڵوێستی و بەقورسایی و سەنگێکی زیاترەوە بەرامبەر هەموو ئەو تحدییاتانەی کە ڕووبەڕووماندەبێتەوە لەئاییندەدا بووەستینەوە و بتوانین پێگەی سیاسی کوردستان بەهێزتر و کاراتر بکەین و خەون و ئاواتەکانی نەتەوەکەمان و سەرکردە مێژووییەکانمان و شەهیدان بەیەکجاری بهێنینەدی کە ئەویش سەربەخۆیی کوردستانە کە ئینشاڵڵا زۆر نزیکە.

داواکارم لە حکوومەتی هەرێمی کوردستان بایەخێکی زۆر زیاتربدات بە دەڤەری گەرمیان و شاری کفری قارەمان لەهەموو بوارەکانی ژیان و خزمەتگوزاریدا.

لەکۆتاییدا سوپاس و پێزانینمان بەناوی ساداتی کوردستان و بنەماڵەی شێخانی حەفید ئاراستەی دەستەی سەرپەرشتیاری ئەم ڤیستیڤاڵە دەکەین و دەستخۆشییان لێدەکەین، ئومێدەوارین ئەمجۆرە ڤیستیڤاڵانە بەردەوامبن تا نەوەی نوێ زیاتر ئاشنابن بە مێژووی خۆیان و باوك و باپیرانیان.

ئومێدی سەرکەوتنتان بۆ دەخوازین.

لەگەڵ ڕێزدا.




## وتاری بەڕێز محەممەدی حاجی مەحمود
## سکرتێری (ح. س. د. ک.)

بەناوی خوای گەورە و میهرەبان

ئامادەبووانی بەڕێز..

پێمخۆشبوو ئەمڕۆ لە خزمەتی ئێوەی بەڕێزدا لە شاری کفری و لە گەرمیانی خەبات و تێکۆشان و فیداکاریدا ئەمڕۆ یادی تێکۆشەرێکی دێرین و پیاوێکی هەڵکەوتووی میللەتەکەمان و خەبات و تێکۆشانی ئەو نەتەوەیە دەکەینەوە.

شێخی نەمر رەنگە لەدوای ئەمارەتەکانی کوردەوە یەکەم بزووتنەوەی رزگاریخوازی گەلەکەمان بێت دەستیپێکردبێ، هێشتا تەپوتۆزی شەڕی یەکەمی جیهانیی نەنیشتبووەوە، هێشتا لایەنی هاوپەیمانی و سەرکەوتووەکان لە دابەشکردنی بڕیاری سایکس بیکۆدا بوون، هێشتا شۆڕشی ئوکتۆبەر تازە سەریهەڵدابوو، لەوکاتەدا شێخی نەمر لەگەڵ هەلومەرجەکاندا هاتە مەیدانی خەبات و تێکۆشان و فیداکاری.. بۆیە من پێموایە ئەو بزووتنەوەیە، ئەو شۆڕشە، ئەو خەبات و تێکۆشانە کردنەوەی دەرگای یەکەم شۆڕش و یەکەم بزووتنەوەی کوردایەتی لەدوای ئەمارەتەکان بووبێ.. هەرئەوەش بوو وایکرد کە میللەتەکەمان لەهەموو لایەکەوە چاوی تێببڕن و لەهەموو لایەکەوە هەوڵ و تەقەلاکان یەکبخەن بۆ ئەوەی بتوانن ئەو بزووتنەوەیە بەرەوپێش بەرن.

شێخی نەمر، هەروەکو شۆڕشەکانیتری میللەتەکەمان دووچاری زۆر کەموکوڕی و دەردیسەری دەربەدەری و ئاوارەیی زۆر بووەوە، بەڵام بێسڵکردنەوە لە خەبات و تێکۆشان بەردەوام کاریکرد تا ئەوساتانەی کە توانی بۆ یەکەمجار زمانی کوردی لەقوتابخانەکاندا یان لەکوردستاندا بخوێندرێ و لەدوای

ئەوەش لە نزیکی سییەکاندا بۆ یەکەمجار زمانی کوردی بوو بە دووەم زمان لەعێراقدا. واتە نەك تەنها لەڕووی نەتەوایەتی و نیشتمانی ، لەڕووی رۆشنبیری، لەڕووی پەروەردە، لەڕووی باری ئیقتیسادی، لە زۆر باریتردا گۆڕانکاری بەسەراهات، هەرئەوەش بوو وایکرد کە شۆڕش

جارێکیتر رۆشنبیرانی گەلەکەمان لە شاخەوە بیگوازنەوە بۆ شار واتە رۆژی رەشی شەشی ئەیلول لەکاتێکدا شێخی نەمر لە پیرانی بناری سۆرێن بوو، ئەو رۆژە جارێکیتر هاندانێکی گرنگ بوو شێخی نەمر کە بیرلەوەبکاتەوە بۆ تۆڵەی شەهیدەکان لە بەردەرکی سەرا، روو لە ناوچەی دووز بکات، بەلاّم لەکاتێکدا گەیشتە ئاوباریك بۆ خۆئامادەکردن لەگەڵ رەئیس عەشیرەتەکان و خەڵکی تێکۆشەری گەرمیان، ئەوەبوو دوژمن پەلاماریدان و شەڕی بەناوبانگی ئاوباریکی لێکەوتەوە کە بوو بە دەرسێك بۆ دوژمن، ئەو شەڕەش بوو بە شەڕێکی مێژوویی بۆ میللەتەکەمان.

بۆیە جێگەی خۆیەتی خەڵکی کفری، خەڵکی ئەو ناوچەیە ئەو یادە بکەنەوە، چونکە ئەو لەکاتێکدا شێخی نەمر لە هیندستان بوو، بەلاّم شۆڕش بەردەوامبوو، هێشتا دوژمن

نەیتوانیبوو هەموو شتەکان دامرکێننەوە، هەرئەوە ناچاریکردن جارێکیتر شێخ بگەڕێتەوە، بەلاّم ئەوکاتە کە خەڵکی گەرمیان و کفری هەستیانکرد شێخ لەو قیتارەدایە کە بەرەو ئەو ناوچەیە کەوتووەتەڕێ هەموو خەڵکی ئەو شارە، ئەو ناوچەیە ڕۆیشتنە سکەی قیتار و پێشوازییەکی گەرمیان لە شێخ کرد، ئەوەش دەستپێکی جارێکیتر حکومەتی شێخی نەمر بوو.

خەڵکی تێکۆشەری ئەو ناوچەیە نەك تەنها هەر لەو شۆڕشەدا بەڵکو ڕاپەڕینی برایم خانی دەلۆ و شۆڕشی نوێ ئەمانە هەمووی خەبات و تێکۆشانی وفیداکاری چ لە شەڕەکانی قاتەکانی کفری، هەروەها تێکۆشەرانی هۆمەربل هەروەها چەندین داستانیتری ئەو ناوچەیە و سەدان شەهیدی تێکۆشەر کە خالید و شەهید قاسم نموونەیەکیانن.. واتە خەڵکی ئەو ناوچەیە هەمیشە سەرەنێزەی خەبات و تێکۆشان و پاراستن بووە، هەر ئەوەش بووە لە خەتی تەماسدا هەمیشە گیروگرفتی ڕووبەڕوویبووەتەوە دوژمن هەوڵیداوە زۆرجار ناوچەکەیان کەمبکاتەوە یاخود بیگوازێتەوە جارێك لە کەرکوك بۆ دیالە یاخود بۆ شوێنێکیتر.. ئەوانە هەمووی شوێنەواری ئەوەن، جگەلە ئاخرجاریشدا لەکاتی ئازادی عێراقدا چەند مەترێك

خەڵکی دانیشتووانی کفری و دوژمن لەیەکەوە دووربوون، بەڵام ئازادانە، بوێرانە لە خەبات و تێکۆشاندا بەردەوامبوون.. بۆیە ئێمە پێمانوایە تا ئەوکاتەی رژێمی بەعس ما خەڵکی ئەو ناوچەیە لە فیداکاری و خەبات و تێکۆشان درێغییاننەکرد.. بۆیە ئێستاش هەقی خۆیانە ئاوڕیان لێبدرێتەوە، هەقی خۆیانە ئێستاش من کە بەناو ئەو شاردا تێپەڕیم هێشتا کۆمەڵێ شوێنەواری پێوەدیارە کە پێویستی بە ئاوڕدانەوە هەیە.. بۆیە هیوادارم کاربەدەستانی حکومەت و حیزبی کە جەنابیان حزووریان هەیە لێرە بەتایبەتی خوشکی بەڕێز هیرۆ خان و هەموو مەسئولینیتر ئاوڕێکی زیاتر لە شاری کفری بدرێتەوە، هەوڵی بۆ بدرێ بۆ ئەوەی ئەو شارە وانەکرێ کە خەڵکەکەی بیر لەوە بکاتەوە لێرەوە بگوازێتەوە بۆ شارەکانیتر یان ئێرە ژیانی تیاکەمبووەتەوە، چونکە ئەو شارە شارێکی مێژووییە، ئەو شارە لەبیستەکاندا زیاتر لە سێسەد و پەنجا ئەوەندە گوند سنووری ئێرە بووە واتە سنووری کفری، شارەزوور، قادرکەرەم، حەویجە، دووزخورماتوو، سنووری دیالە بووە.. بۆیە پێویستە ئێستاش ئاوڕلێبدرێتەوە، هەوڵی بۆ بدرێ، بۆ ئەوەی ئەو شارە وەکو شارەکانیتری کوردستان بڕازێنرێتەوە،

چونکە شاری تەماسە، شارێکە پێویستی بە ئاوڕدانەوەی زیاتر هەیە و مافی خۆشیانە هەوڵی زیاتریان بۆ بدرێت، چونکە ئەو شەڕ و قارەمانێتییەی لەو ناوچەیە کە لاموایە ئاخرجار شەڕی سەرقەڵا بوو، ئەو هەموو دەبابەیە لەو ناوچەیە سووتابوو، ئەوانە هەمووی هەوڵ و تێکۆشانی خەڵکی ئەم ناوچەیەیە.. بۆیە من نامەوێ وەختی زیاترتان لێبگرم، چونکە ئەو تۆژینەوە ئەوانە هەرکەسێك بواری خۆی هەیە بۆی، من هەر پێمخۆش بوو ئەمڕۆ لە خزمەتی ئێوەی بەڕێزدا، لەو شارە تێکۆشەرەدا، لەو شارە دێرینەدا بەشداریتانبکەم.

زۆر زۆر سوپاستاندەکەم و سوپاسی ڕێکخەری ئەو ئاهەنگە ئەو فیستیڤاڵە دەکەم.. سوپاسی ماندووبوون و ئامادەبوون هەموو لایەك دەکەم.

هەر شاد و سەرکەوتوو و سەرفراز بن.




## وتەی بنەماڵەی سەییدەکانی کفری

بەڕێزان ئامادەبووانی فیستیڤاڵ
میوانە خۆشەویستەکان..

ئەمڕۆ بۆنەیەکی گەورەیەلە ژیانی گەلی کورد و بەتایبەتی گەرمیان و بۆ دانیشتووانی شاری کفریش.. پێش ٩٠ ساڵ سەرکردەیەکی مەزنی وەکو شێخ مەحمودی مەلیکی کوردستان هاتە ئەم شارە و ماڵی سەیید محسن ئاغای کردە قۆناغی مانەوەی خۆی.

بەرێزان..

بەپێی بەڵگەنامەکان بنەماڵەی سەییدەکانی کفری لە بنەچەدا لەگەڵ بنەماڵەی شێخانی بەرزنجەدا خزمایەتی و پەیوەندی کۆمەلاَیەتییانیمان هەیە.. بنەماڵەی سەییدەکان لەگەڵ تیرە و هۆزەکانیتری ناوچەی گەرمیان لە سەرهەڵدانی بزووتنەوەی رزگاریخوازی نەتەوەی کورددا لە گۆڕەپانی خەباتدا کاریانکردووە بەتایبەتی لە شۆڕشی شێخ مەحمودی نەمردا.

هەرئەمەش وایکرد کە لە هەڵوێستە سیاسییەکاندا ئەو پەیوەندییە بەردەوامدەبێت.. کاتێك کە شێخ مەحمودی مەلیك نامە دەنێرێ لەبارەی بکوژی شێخ سەعید و شێخ ئەحمەدی کوڕی کە لە ساڵی١٩٠٨دا لە شاری موسڵ بەدەستی بەهای عەبدوڵلاَ ئەفەندی شەهیددەکرێن کە باوکی ئەو بەها ئەفەندییە لە کفری بووە.. بنەماڵەی سەییدەکان و خەڵکی کفری، عەبدوڵلاَ ئەفەندی باوکی بەها ئەفەندی بەسزای گەل دەگەیەنن، هەروەها خەڵکی کفری بەسەرۆکایەتی برایم خانی دەلۆ لە ساڵی ١٩٢٠دا شۆڕشیان لە دژی ئینگلیز بەرپاکرد وەکو پشتیوانییەك بۆ شۆڕشی شێخ مەحمود.

بەهۆی ئەو هەڵوێستانەی خەڵکی گەرمیان و کفری کە بەوپەڕی دڵسۆزییەوە پشتیوانی شێخ و جووڵانەوەکەی بوون.. کاتێك شێخ لەلایەن ئینگلیزەکانەوە ئازاددەکرێ و بۆ کوردستان دەگەڕێتەوە لە رۆژی

١٩٢٢/٩/٢٢ دەگاتە کفری و چەند رۆژێك دەمێنێتەوە و کۆنگرە دەبەستێ و کۆمەڵێك بڕیاری گرنگ دەدات کە وەکو سەروەرییەکی مێژوویی بۆ کفری و دانیشتووانەکەی تۆماردەکرێ.. ئێمەش پریشکی ئەو سەروەرییەمان بەردەکەوێ و هەمیشەش شانازی بەو رابردووەی خۆمان و ئەو مێژووە و مانەوەی شێخ و ئەو کۆنگرەیەی کە جاڕی حکومەتی تیادرا، دەکەین.

بەڕێزان..

لەسۆنگەی ئەم یاد و بۆنەیەدا داوا لەلایەنە بەرپرسەکان دەکەین زیاتر ئاوڕ لە شاری کفری بدرێتەوە کە لەڕووی مێژوویی و شوێنەوارەوە بایەخی خۆی هەیە.. بۆیە داوادەکەین بەهای ئەو شوێنەوارانە بپارێزێ و ئەم بۆنەیە بکرێتە رۆژی کفری کە ساڵانە کۆمەڵێك چالاکی دەربارەی ئەم شارە و مێژووە پرشنگدارەکەی بکرێت.

جارێکیتریش بەخێربێن و سەرکەوتووبن.

**میقداد حەسەن ئاغا**

**لەجیاتی بنەماڵەی سەییدەکانی کفری**

## فیلمی دیکۆمێنتاری "کفری.. لانکی شۆڕشگێڕییە، با بە زیندوویی رابگیرێت"

من بازاڕ و قەیسەری کۆنی کفریم کە سێ سەدە پێش ئێستا جمەم دەهات لە کاروانی و کاروانچییان.. بازرگان و گەشتیارەکان ئێرەییانپێدەبردم، چونکە قۆناغیان من بووم و لای من دەحەوانەوە و بارگەیان لای من دەخست.

جێگا ستراتیژییەکەی من بوو ئاسیا و ئەوروپای پێکەوەدەبەست و هەموو کالاّ و شتومەکێکیان لای من ئالْوگۆڕدەکرد.. بچن باسی من لە یاداشتی ریچ و گەشتیارەکان بخوێننەوە، بەلاّم ئەفسوس هەزار ئەفسوس، ئێستا گەردی تەریکی و فەرامۆشیم لێنیشتووە و کەس ئاوڕێکم لێناداتەوە.. ئەوەش خەوشێکی گەورەیە بۆ ئێوە، چونکە من بەشێکم لە شارستانییەتی کفری و بنەمایەکی گرنگی رەسەنایەتی کفریم و ئێوەش قەرزاری کفرین، چونکە کفری بەشێکە لە ئێوە.

مێژووی خۆم و شارەکەم بخوێننەوە و خۆتان و ویژدانتان.. دەسا غیرەتێ با لەناونەچم، زوو فریام کەون ماندووم ، هیلاکم، بۆ خزمەتی کورد بمێنم چاکم.

(هەندێ وێنە.. وەکو لە ڤیدیۆکەدا هاتووە.. قەیسەری و بازاڕی کفری..)

ئامادەکردنی: سامان کەریم و تەلەفزیۆنی ئاییندەی گەرمیان.





## فیلمێکی دیکۆمێنتاری لەسەر کفری و شێخی نەمر
## ئامادەکردنی: جەمال لۆلۆ

ئەگەر بەوردی لە مێژووی کورد بکۆڵێتەوە دەگەیتە ئەو ڕاستییەی لە زۆربەی شۆڕشە کوردییەکاندا ناوچەی گەرمیان ڕۆڵی بەرچاو و پێشەنگی بینیوە لە ڕووبەڕووبوونەوەی داگیرکەراندا، لەم پێناوەشدا خوێنێکی زۆری داوە.

ئەگەر ڕاستەوخۆ بێینەسەر زەمەنێکی دیاریکراو و باس لە ناوچەکە بکەین لەسەروبەندی هەڵگیرسانی شۆڕشەکەی خوارووی کوردستان بە ڕابەرایەتی مەلیك مەحمود، ئینگلیزەکان ڕۆژی ١١ی مانگی ٣ی ساڵی ١٩١٧ شاری بەغدایان داگیرکرد، هێزەکانی بەریتانیا بەردەوامییان دا بە گرتنی عێراق، سوپای بەریتانیا سێ هێزی بە سێ قۆڵدا:

١. قۆڵی دیالا بەرەو زنجیرە چیای حەمرین
٢. قۆڵی فورات
٣. قۆڵی دیجلە

قۆڵی دیالا بەرەو سەرەوە و لەهەموویان پڕمەترسیتربوو، لەبەرئەوەی هێزی عوسمانی بەچڕی رۆژی ١٩١٧/٤/٢٦ سەرۆکی ئەرکانی سوپای بەریتانی فەرمانی پێشڕەوی دەرکرد بۆ جەنەراڵ مارشاڵ، مارشاڵ لە جێگای جەنەڕاڵ مۆد کە بە نەخۆشی کولێرا مردبوو دانرابوو.

## شەماڵ خورشید:

قۆناغی یەکەمی حوکمداری شێخ مەحمودی حەفید لە مانگی حوزەیرانی ساڵی ١٩١٧ کۆتاییپێهات لە شەڕی بەردەقارەمان، هەروەهادەتوانین بڵێین لە ساڵی ١٩٢٢ قۆناغی دووەمی حکومەتی شێخ مەحمود دامەزرا.. لەنێوان ئەم دوو بەروارەدا یان ئەم دوو مێژووەدا قۆناغێکی هەستیار لەسەر باشووری کوردستان رەتبوو، ئەوەبوو هاتنی تورکەکان بۆ ناوچەی رەواندز و دامەزراندنی وەکو قایمقامییەتێك لە رەواندز و بەدەستهێنانی پشتگیری لە هۆزە کوردییەکان لەو ناوچەیە، ئینگلیزەکان هەوڵیاندا بەدیلێك بۆ شێخ مەحمود بدۆزنەوە، چاویان بڕییە سەید تەهای شەمزینی و هەروەها حەمدی بەگی بابان، بەلاّم ئەم دووانە بە رەئی خۆیان گونجاونەبوون، بۆیە ناچاربوون جارێکیتر شێخ مەحمود لە مەنفا لە هیندەوە بۆ بەغداد بگێڕنەوە.

**ئەحمەد باوەڕ:**

فەیسەڵ هێنرایەوە و کرا بە مەلیکی عێراق لە ٢٣ی ئابی ١٩٢١ تاجی مەلیکی لەسەرنرا و بوو بە پاشای عێراق.. لێرە دووبارە بۆ ئەوەی حکومەتی دووەمی عێراقی دادەمەزرێتەوە، پەرلەمانی عێراقی (ئەنجومەنی تەئسیسی) دادەمەزرێتەوە.

یەکێك لە جانەکانیتری ئیشکردن لەسەر ئەو لەوێ چ لەو موئتەمەرە، چ لەلایەن شەخسیاتی سیاسی بەریتانی، چ وینستۆن چرچڵ خۆی چ مەندوبی سامی بەریتانی ئەوکاتە سێر بیرسی کۆکس، چ سکرتێری رۆژهەلاتی بەریتانی گۆرترۆد بێڵ، حەتتا مێجەر نۆئێل ئەمانە هەموویان هەندێ تەوەقوعات و هەندێ حلولیان هەیە بۆ چارەسەرکردنی ناوچە کوردنشینەکان، هەندێکیان لەگەڵ ئەوەدان کە ناوچە کوردنشینەکان ئایا چۆن ئیدارەبدرێ کە مەلیکێك لە عێراق، فەیسەڵ خۆی قەناعەتیوایە ئەم ناوچە کوردنشینانە بەو ئیدارەناکرێ، ئەو دەتوانێ تا حدودی حەمرین و ئەوانە لەژێر دەسەلاتیابن و ئەم ناوچە ئەمرێکی واقیعە، ناکرێ بۆ ئەو چارەسەر و حەلکردنی ئەم مەسائیلە بۆ ئەو ناکرێ.

جا بۆیە سەیردەکەی بەریتانیا تەوەقوعی ئەوەیە کە جۆرێك ئیدارە لە ناوچە کوردنشینەکاندا هەبێ بتوانێ سوود لە تاقەی کورد

وەربگرێ بۆ هێزی سوپایی و ئەوانە بۆ چارەسەرکردن و حلولکردنی خۆیان و لەهەمانکاتدا ئەو هێزانەی خۆیان کە هێناویانەتە ناوچەکە بتوانن لو شوێنیتر سوودیان لێوەربگرن، یانی بەریتانیا سەیردەکەی بەو نەهجە ئیشی لەسەردەکات، هەرچەندە مەندوبی سامی بەریتانی کۆکس لەگەڵ ئەو وەزعە بەو ئیتیجاهە نییە بەو دەرەجەیە.

### د. ئاکۆ شوانی:

ئەستەمبووە بۆ پیاوێکی وەکو شێخ مەحمودی حەفید کە بتوانێ دوای دوو پشت بێبەریبێت لەوەی کە ئەو کەسێکە لە بنەماڵەی کاکە ئەحمەدی شێخە ئەو باگڕاوند و ئەو کلتوورە دینی و کۆمەلآیەتییە پشتگوێبخات، بەلاّم وێڕای ئەوەش وەکو خۆی لە زۆر جێگادا باسیکردووە و ئەحمەد تەقیش باسیدەکات دەڵێ: کاتێ گەڕامەوە لەگەڵ شێخ مەحموددا باسی ئەوەمکرد کەوا شێخ عەبدولقادری شەمزینی لە ئەستەمبوڵ پێیڕاگەیاندووم بە شێخ مەحمود بڵێ لەگەڵ ئینگلیزەکاندا هەڵبکات و بگونجێ، چونکە ئەوان دەتوانن شتێك بۆ کورد بکەن، دەڵێ پێیوتم من تەرەفداری ئەوەم لەگەڵ ئینگلیزدا بگەمە کۆتایی و بگەمە نەتیجە، ئەوان شتێك بۆ کورد بکەن، دەڵێ بەلاّم بەداخەوە پێیڕاگەیاندم کە ئەوان تەرەفداری رێککەوتن نین لەگەڵ مندا.. ئەمە دەقی قسەی شێخ مەحمودە کە بە ئەحمەد تەقی وتووە لەو سەردەمەدا..

مەسەلەکەش پەیوەندی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە ئەوکاتە بۆ خۆی سیاسەتی ئینگلیز دەرهەق بە کوردستانی باشوور و دەرهەق بە ویلایەتی موسڵ سیاسەتێکی روونەبووە.

**ناسر حەفید:**

کە تەحریکی ئینگلیز بووە کە بچێ شەڕی دژی تورك بکات یان بەپێچەوانەوە، شێخ هەوڵیداوە هەرگیز ئەو شەڕانە نەکات، بەڵکو ئەو شتانەی کردووە کە لە ستراتیژی کێشەی کوردەوە سەرچاوەی وەرگرتووە.

........................................................

سەرۆکی ئەفسەرە سیاسییەکان سێر بیرسی کۆکس کەوتەناردنی نامە و نوێنەر و پەیوەندیکردن بە ژمارەیەك سەرۆکهۆز و کەسایەتی لە کەرکوك و سلێمانی. کۆکس گفتی سیاسی و ئابووری دەدا بەو کەسانە لەبەرامبەر هاوکارییاندا لەگەڵ بەریتانیادا.. ئەم ئامرازە سیاسییەی کۆکس لەبەکارهێنانی گفتدا و رێگاخۆشکردن بۆ هێرشی سوپای بەریتانی ئەنجامی بەدەستهێنا، ئەمە وایکرد کە کۆکس بەڕەسمی پشتگیری بەردەوامبوونی سوپای بەریتانیی لە داگیرکردنەکانی بکات.

رووسەکان لە ناوچەی داگیرکراویاندا خراپبوون و ژمارەیەك لە کوردەکان هەڵاتبوون بۆ ناوچەی ژێر دەسەڵاتی عوسمانی، ئەمە کاریکردبووەسەر هەڵوێستی خەڵك بەرامبەر بە بەریتانیاش، لەڕووی سەربازیشەوە بەریتانیا دەبوو شوێنی رووسیا لە خانەقین پڕبکاتەوە.

سوپای بەریتانی لە مانگی ١٢ی ساڵی ١٩١٧دا خانەقینی داگیرکرد.. خانەقین پێش کشانەوەی روسیا لە جەنگ لەلایەن روسیاوە داگیرکرابوو، هەروەها لە رۆژی ١٩١٨/٤/٢٨ کفری گرت و رۆژی دوایی لە ٢٩ی ئەپریلدا دووزخورماتوو، لە رۆژی ١٩١٨/٥/٧ یشدا کەرکوکی داگیرکرد.

### د. دلێر محەممەد میسری:

ئەوانەش مونەوەرەکان ئەو وەختە ئەوانە بوون کە زیاتر زمانی تورکی و فارسییان زانیوە، تاڕادەیەکی زۆر لەگەڵ مەسائیلی سیاسی دەوروپشتدا شارەزابوون.. بۆیە بەوردی شتەکانیان نووسیوە، یەعنی هەندێ نووسینی تێدایە لە ئومێدی ئیستیقلالدا بڕوابکە بەرنامەکە رەنگە بۆ ئەمڕۆش ئەو کەرەسانە ببێت کە دەزانن چۆن دوژمنەکان لەگەڵ کورددا هەڵسوکەوتدەکەن، بەڵام خەڵکانێك کە هیچ سانسۆرێك لەسەر ئەو رۆژنامانە نەبووە، تەنانەت لە ئومێدی ئیستیقلالدا مەقالێك هەیە وابزانم رەفیق حیلمی نووسیویەتی باس لەوەدەکات کە پێویستە ئەگەر دەسەلاتی حکومەتی کوردستان بەردەوامبێ یاسایەك بۆ ئازادی رۆژنامەنووسی دەربکات، باس لەوەدەکات خەڵك ئازادبێ چی دەنووسێ، با ئێمە بە قەڵەم جوابی شتەکان بدەینەوە، یەعنی شتی دەتوانم بڵێم لەچاو سەردەمی خۆی زۆر لەپێشەوەیە.

ئینجا باس لەوەدەکات هەموو کەسێك حوڕە فیکری خۆی تەرحبکات قەیدی چی دەکات، بەلاّم ئەگەر ئێمە بێینەسەر ئەو قۆناغە کەمە کە دەسەلاّتی سیاسیی کوردی تێدابووە لەو شەش ساڵەدا زیاتر کەرەسەکان بۆ چەسپاندنی دەسەلاّتەکەیە.

زۆرجار رەنگە کەس داوای نەکردووە بە دەسەلاّتەکەدا هەڵبدەن، بەلاّم ئیفتیخارێکی گەورەیە، شانازییە کە کیانێکە وا دروستبکرێ خەڵکانی عەشایەر بە هەموو لایەك پشتگیریبکات و خەڵکێکی زۆر بەحەماسەوە بێنەوە، هەڵبدەن ئەم دەسەلاّتە لەئاخیردا پوولی هەبووە، ئالاّی تایبەتی خۆی هەبووە، سروودیان داناوە، زۆرجار تەغتییەی خەبەری تێدایە کە باسی ئەو سوپایە دەکات دروستکراوە، نەشیدی تایبەتییان بۆ وتوون کە شیعرەکەی شیعری شێخ نووری شێخ ساڵحە.

**شەماڵ خورشید:**

لە ١٩٢١/٩/٢٠ شێخ مەحمود لەڕێی شەمەندەفەرەوە لە بەغدادەوە دەرچوو، لە رۆژی ٢١ گەیشتە وێستگەی شەمەندەفەری کنگربان، هەرئەوە دەتوانم بڵێم دانیشتوانی شاری کفری بەشێوازێك پێشوازییانلێکرد کە ئەدمۆنز بەخۆی دەڵێ: شێخ مەحمود حەقی بووە کە خۆی وەکو حوکمدار ئیعلانبکات، چونکە ئەو پێشوازییەی لە وێستگەی شەمەندەفەری کنگربان زۆر زۆر زەخمبووە!

**ناسر حەفید:**

جارێکیان حەلاوە خانی خوشکی تەنانەت باسی ئەوەیکرد کە لە شێخ **محەممەد** غەریب شکاتیکردووە و لە شێخ مەحمود بۆڵبوڵیکردووە، لەبەرئەوەی لەسجندا شێخ مەحمود شەڕی لەگەڵ شێخ **محەممەد** غەریبدا کردووە و لێیتووڕەبووە و وتوویەتی: ئەوانە داگیرکەری ئێمەن کە دێن تۆ نابێ لەبەریان هەڵبسی. بەنزیکبوونەوەی بەریتانیا و بڵاوبوونەوەی داگیرکردنەکانی ژمارەیەك لە سەرکردەکانی کورد بەتایبەتی لە هەمەوەند و یەزیدی پەیوەندییانکرد بە بەریتانیاوە، شێخ مەحمود و کەسانیتری سیاسی کەتبوونە پەیوەندی و کۆبوونەوە و نامەگۆڕینەوە لەگەڵ کاربەدەستانی ئینگلیزدا لە خانەقین و کفری و بەغداد.

شێخ مەحمود نامەیەکی نارد بۆ ویلسنی نائیبی حاکمی گشتی لە عێراق کە لە نامەکەدا نووسیبووی: مەبەستی دەوڵەتە گەورەکان لەجەنگدا هەروەکو لە بەیاننامەکەی سەرۆککۆماری ئەمریکا و چرچڵی شالیاری بەریتانیادا هاتووە داننانە بە مافی گەلە مافخوراوەکان و سەربەخۆییاندا، ئێمە بەپێی باوەڕمان بەم بەیاننامەیە و بە بەڵێنەکانی دەوڵەتە گەورەکان هیوامانوایە بەچاوێکی بەسۆزەوە سەیری مەسەلەکەمان بکرێت و لە رزگارکردنی کوردستان و دەرکردنی تورك و بڵاوکردنەوەی بانگی سەربەخۆیی یارمەتیدەرمانبن.

باوەڕپێکراوی کوردان/ حەفیدزادە مەحمود

**م. کەریم زەند:**

لە ١٢ی ئاداری ١٩٢١دا کۆنگرەی قاهیرە گیرا، ئەو کۆنگرەیە بە سەرۆکایەتی سێر وینستۆن چرچڵ و پیرسی کۆکسی ویلسۆن و گیرترۆد میس بێڵ کە رۆڵێکی بەدناوی هەبوو لە کۆنگرەکەدا.

سێ کەس رایان ئەوەبوو کە کورد دەبێ قەوارەی هەبێ، بەشێکی جیاوازبێ لە عێراق، بۆئەوەی لەنێوانی کورد و عەرەبدا جێگەیەکی ئاسایشی، ناوچەیەکی ئاسایشی هەبێ، بەڵام دوو کەس بەرهەڵستییانکرد و دەنگی دوو کەسەکە سەرکەوت و کێشەی کورد گۆڕکرا.

**ئەحمەد باوەڕ:**

بەریتانیا دەیەوێ ئیشی لەسەر بکات بۆ چارەسەرکردنێکی جەزری ناوچەکە، ئەوەش ئەوەیە بۆ نموونە وەکو وتم چۆن کارێکی وابکرێ شێخ مەحمود بگەڕێتەوە کوردستان.. سەیردەکەی تەقریبەن لە مانگی حوزەیراندا وەکو وتم موئتەمەری قاهیرە لە مانگی سێ دەبەسترێ و لە مانگی سێ قەرار لەسەر هێنانی فەیسەل دەدرێ، لە مانگی حوزەیراندا چرچڵ بە مشاوەرەی بەریتانیا کار لەسەر ئەوە دەکەن شێخ مەحمود جارێکیتر بگەڕێتەوە کوردستان، بەڵام بەریتانیا ئەوەیە دەیانەوێ ئەو هەیبەتەی کە دەیانەوێ بیدەنە کەسێکی وەکو دابوویان بە فەیسەڵ ئەوە بە شێخ مەحمود نەدرێ.

هێنانەوەی شێخ مەحمود تۆزێك ئەوەیە یەکەمجار چۆن لەڕێگای باخیرەیەکی بەریتانییەوە خۆی و شێخ محەممەد غەریب دەهێننەوە کوێت، فەترەیەك لە کوێت دەمێننەوە و لەلایەن تاحەدێك میری کوێتی ئەو زەمانەوە پێشوازییەك دەکرێ.. ئەم مەوزوعە لە تاریخی کوێتدا یەکێك لە موئەڕیخینی ئەو زەمانە باسی ئەم مەوزوعە دەکات، زۆر بە باشەوە وەزعی شێخ مەحمود و ئەوانە و کەسایەتی شێخ مەحمود دەنرخێنێ.

دوایی چۆن وەکو وتم دەیانەوێ وەزعی شێخ مەحمود وەکو فەیسەڵی لێبێ، شێخ مەحمود دەهێننەوە بەغداد و دوایی ئاسانکاری ئەوەی بۆ دەکرێ دێتەوە ناوچە کوردنشینەکان بەتایبەتی لەڕێگەی کفری ئێستاوە.

مەندوبی سامی بەریتانی ڕێگە بە کۆمەڵێك ئەفسەر و دەرەجەداری ئەو زەمانەی کورد دەدا کە لەگەڵ فەیسەڵ دێن تا دێتەوە سلێمانی، بەلاّم یەکێکی وەکو مێجەر ئەدمۆنز تا محەتەی قیتاری کفری ئەو زەمانە لە ئاسکی کفری لەوێوە لادەداتەوە و دەچێتە کەرکوك بۆ لای لۆنگریك.

لە ڕۆژی ١٩١٨/٥/٢٤دا ئینگلیزەکان لە شاری کەرکوك پاشەکشەیانکرد، عوسمانییەکان هاتنەوە ناوشارەکە، لەبەرئەوەی شێخ مەحمود پەیوەندیکردبوو بە ئینگلیزەوە لەلایەن فەرماندەی سوپای شەشی عوسمانییەوە خەلیل پاشا فەرماندرا بە مستەفا بەگ کە شێخ

دەستگیربكات، مستەفا بەگ لەژێر ناوی گفتوگۆدا لە شاری سلێمانی بانگهێشتی مەلیك مەحمودی كرد و دواتر دەستگیریكرد و لەژێر چاودێرییەكی توندا رەوانەی كەركوكی كرد.

لە رۆژی ١٩١٨/٨/٣٠دا بڕیاری لەداردانی بۆ دەرچوو لەلایەن دادگایەكی سەربازی توركییەوە، بەلاَم بەهاتنی عەلی ئیحسان پاشا بۆ جێگەی خەلیل پاشای فەرماندەی سوپای شەشی عوسمانی حوكمەكەی گۆڕی، شێخ ئازادكرا و روتبەی مارشاڵی پێبەخشی.

دوای گەڕانەوەی شێخ بۆ سلێمانی لە سلێمانی كۆبوونەوەیەك كرا.. بڕیاردرا وەفدێك بنێرن بۆ كفری بۆ لای ئینگلیزەكان، لەو سەردەمەدا شاری كفری لەژێر دەسەلاَتی ئینگلیزەكاندا بوو، تائەوانیش پەیوەندیبكەن بە ویلْسنی جێگری حاكمی گشتی لە عێراق و وەفدەكە بە سەرۆكایەتی فایەقی تاپۆ و ئەندامێتی عیزەت تۆپچی و تایەرە فەندی رێكخرا و چوون بۆ كفری.

ئەم كۆبوونەوەیەی كفری رەنگە یەكەم كۆبوونەوەی نێوان شێخ و ئینگلیزەكان لە قەڵەمبدرێ كە لەسەر چەند خاڵێك رێككەوتن.

## د. ئاكۆ شوانی:

شێخ مەحمود لە ١٨ی حوزەیرانی ١٩١٩ەوە دووركەوتەوە لە واقیعەكە كە تا ٢٢-٣٠ ئەیلول ماوەیەكی دوو ساڵ ئینگلیز زۆری هەوڵدا ئەلتەرناتیڤ، جێگرەوەیەك بۆ شێخ مەحمود بدۆزێتەوە، بەلاَم

سەرکەوتوونەبوو.. خەڵکی خێڵەکی و خەڵکی خاوەن پێگەی کۆمەلآیەتی و پێگەی عەشایەری هێنا سەرکەوتوونەبوو، خەڵکی منەوەر و خەڵکی خوێنەواری پەروەردەی ئەوروپای هێنا سەرکەوتوونەبوو، لەناو خەڵکی سلێمانی هەوڵیدا کەوا خەڵکیدیکەی وا دروستبکات کەوا بتوانن شوێنی شێخ مەحمود بگرێتەوە سەرکەوتوونەبوو.

کەواتە ئەمە حاڵەتێکی زۆر زۆر ئاساییە کە ئێمە دانبەوەدابنێین کە شێخ مەحمود ئەگەر نەیاریشی هەبوو لە کوردستاندا، بەلآم بەدیلیشی نەبوو.. کاتێ ئینگلیزەکان شێخ مەحمودیان هێنایەوە لەناچاریدا گەیشتە ئەو قەناعەتە کە بەفیعلی ئەگەر وانەکەن ئەوا نفوزی تورك لەو مەنتیقەیە بالآدەست دەبێ و ویلایەتی موسڵیان لەدەستدەردەچێ، چونکە خۆمان دەزانین خەڵکێکی زۆر لە ئۆزدەمیر نزیکبوونەوە و ناوچەیەکی زۆریان کۆنترۆڵکردبوو بە حەریر و باتاس و مەنتیقەی شەقلاوە و مەنتیقەی رانییە و تا دوکان و نزیکی سلێمانی هاتبوون.

کەواتە ئینگلیز بەناچاری گەیشتە ئەو باوەڕەی کە هەرگیز ناتوانێ ئەو بۆشاییەی کەوا دوورخستنەوەی شێخ مەحمود دروستیکردووە پڕناکرێتەوە.

**ناسر حەفید:**

بێجگەلەوەی لەو پەیامەی شێخ مەحمودا کە هەیبووە بێجگەلەوەی کەوا خەباتێکی زۆری کردووە بۆ دامەزراندنی دەوڵەتی کوردی چ لەڕووی دیبلۆماسییەوە و کۆکردنەوەی مەزبەتە و راپۆرتدان و داخوازینامە بۆ ولاٌتان و بۆ کۆنگرەی ئاشتی جیهان و ئەم شتانە، جگەلەمانەش شێخ مەحمود برەوێکی زۆری بە خوێنەواری داوە و لە بینینی فەلسەفی شێخ مەحمودا شتیتریش دەبینرێ کە قیمەتێکی نەوعی هەیە.

**شەماڵ خورشید:**

شێخ و شاندەکەی سلێمانی و سەرۆکهۆزەکانی ناوچەی کفری دوو کۆبوونەوەی گەورەیان کرد دەتوانم بڵێم وەك سووکە کۆنفرانسێك، لەوێ بڕیاری دامەزراندنی حکومەتێکی کوردیان راگەیاند و هەروەها لەوێ هەر بڕیاریاندا کە لەڕێگە گەرمیانەوە بچێتە سلێمانی، چونکە ئینگلیزەکان هەوڵیاندەدا لەڕێگەی کەرکوکەوە بچێتە سلێمانی بۆئەوەی پەیوەندی شێخ لەگەڵ لیڤی ئاسوورییەکان و لەگەڵ ئینگلیزەکان بتەوبکەن، بەلاٌم شێخ مەحمود بەڕاوێژ لەگەڵ سەرۆکهۆزەکان بڕیاریاندا لەڕێگەی گەرمیانەوە بچێتە سلێمانی.. ئەویش بە چەند رۆژێك و لە زۆر شوێن دەوەستا، ئەویش وەکو ئەدمۆنس حۆی باسیدەکات کاریگەرییەکی گەورەی هەبوو بۆ دامەزراندنی ئەو حکومەتە.

**ئەحمەد باوەڕ:**

تەقریبەن لە ٩/٢١ ئەگەر بەهەڵەدا نەچووبم دەگاتە کفری و چەند ڕۆژێك دەمێننەوە و کۆمەڵێك کۆبوونەوە و دانیشتن و ئیستیقبالاتی جۆربەجۆر و سەرۆکهۆز و پیاوماقووڵ و کەسایەتی جۆربەجۆر و ئەمانە دەبینێ.. دوایی لەوێوە دەڕوات بۆ سلێمانی و یەکەمجار بۆ داریکەلی و دوایی بۆ شاری سلێمانی، بەلاّم لەم فەترەیە لە شاری سلێمانی جەمعییەتێك هەیە ناوی جەمعییەی کوردستانە، کۆمەڵەی کوردستان، ئەم جەمعییەتە بەدیلی بەڕێوەبردنەکەی مێجەرسۆنە.

یەکەمجار شێخ مەحمود کە دەگاتە سلێمانی دەبێتە سەرۆکی ئەو جەمعییەتە، دواتر حوکمدارییەتی دووەمی شێخ مەحمود ئیعلاندەکرێ..

شێخ قادری حەفیدی برای دەبێتە سەرۆکی حکومەت و مستەفا پاشای یامولکی و هەتا پیاوێکی ئەوکاتەی مەسیحی لە سلێمانی کەریمی عەلەکە دەبێتە وەزیری مالییە.

شێخ مەحمود لەم فەترانەدا لە کوردستاندا دەبێ فەترەیەك دەمێنێتەوە وەکو مەلیکی کوردستان، بەلاّم بەهەمانشێوە لە نەهجەکە لادەدات، ناکۆکی دەکەوێتە بەینی بەریتانیا و بەینی شێخ مەحمودەوە.

.......................................................

لە ساڵی ١٩١٨دا مێجەر نۆئێل لە کفرییەوە هات بۆ داریکەلی، لە ١٩١٨/١١/١٦دا چوو بۆ سلێمانی، نۆئیل بەبێ هێزی سەربازی بە ناوچەی گەرمیاندا تێپەڕی، لەگەڵ خۆیدا ژمارەیەك کەسی لە دکتۆر و ئەندازیار و پسپۆڕیتری لەگەڵدابوو.. بەدرێژایی رێگا گەرمیانییەکان وەکو نوێنەری هێزی ئازادیبەخش و خۆشهێن پێشوازی گەرمی لێکرا.

رۆژی ١٩١٨/١١/١٧ کۆبوونەوەیەکی گەورە لە سلێمانی سازکرا، لەم کۆبوونەوەیەدا سیاسی و کاربەدەستانی ئینگلیز و خوێندەواران و سەرۆکهۆز و بازرگانەکان و پیاوانی ئایینی بەشداربوون..

مێجەر نۆئێل بەپێی ئەو فەرمانەی لە ویلسن حاکمی گشتی ئینگلیزەوە لە عێراق وەریگرتبوو بە زمانی فارسی رایگەیاند کە شێخ مەحمود حوکمداری کوردستانە.

گەرمیانییەکان لەم حکومەتەدا رۆڵی گرنگیان گێڕا، بەهەستێکی نەتەوەیی کوردانەوە پشتگیرییەکی چاکیان لە حکومەتی خوارووی کوردستان کرد بەتایبەتی شاری کفری کە هەردەم مەلیك مەحمود بەپێگەیەکی گرنگی شۆڕشەکە و دواتر حکومەتەکەی دەزانی.. خەڵکانی دڵسۆز لە ناوچەکە پشتگیری هاتنی ئینگلیزیان دەکرد، چونکە گەیشتبوونە ئەو بڕوایەی کە عوسمانییە تورکەکان هیچ بۆ کورد ناکەن.

## کورتەیەك لەسەر مێژووی شاری کفری

کفری شارێکی دێرینی کوردستانە، بەپێی بەڵگەنامە مێژووییەکان، لە سەردەمی سۆمەری و ئاشووری و میتانی و گۆتی و لۆلۆ و ساسانییەکاندا شاربووە. بەپێی سەردەمەکان ناوی کفری لەپێشدا بەم شێوانە هاتووە: (کیماش، کیرۆ، فرجینا)، سەردەمی عوسمانی ناوی (سەلاحییە) بووە، پاشان بووەتە کفری.. دەڵێن وشەی کفری لە (کفر)ەوە هاتووە بەواتای دەوەنی تەروو.

ئەم شارە زۆر ڕووداوی مێژوویی لەخۆگرتووە:

- ساڵی (١٨١٢) لە شەڕی کفریدا خەڵکەکەی پشتیوانی دەوڵەتی بابان دژی داگیرکەری عوسمانی بوونە.
- شۆڕشی ئیبراهیم خانی دەلۆ لە ساڵی (١٩٢٠)دا جەختکردن بوو بۆ رزگاربوونی شێخی نەمر لە زیندانی داگیرکەر.
- ساڵی (١٩٢٢) لەکاتی گەڕانەوەیدا بۆ کوردستان گەورەترین پێشوازی لە شێخ کرا و ئەویش دوو کۆنگرەی تێدابەست و جاڕی حکومەتی کوردی دا.

- لە شەڕی پەلەوشکی ناوجافدا ساڵی (١٩٤١) خەڵکی کفری پشتیوانی شێخ بوون.

- ساڵی (١٩٣١) لە شەڕی ئاوباریکدا بەشدارییانکردووە.

- لە هەردوو شۆڕشی ئەیلول و شۆڕشی نوێشدا بەشداری بەرچاویان هەبووە.

- لە ساڵی (١٩٧٥) دوای نسکۆی شۆڕش، کفری لە کەرکوك دابڕا و خرایەسەر دیالە و پاشان شالاّوی تەعریبکردنی لەسەربوو تا لە راپەڕینی (١٩٩١)دا بەیەکجاری لە دەستی بەعس و تەعریب رزگاریبوو.

- لە راپەڕینی دووەمی (١٩٩١)دا داستانی سەرقەڵاّ تۆمارکرا.

- شاری کفری لانکەی مەقامات بووە و چەندین مەقامبێژی گەورەی تیاهەڵکەوتووە.

- بە شاری وەزیران بەناوبانگە.

- لەسەر دەستی رۆشنبیران و شاعیرانی کفریدا شۆڕشی شیعری نوێی کوردی سەریهەڵدا.

- کۆنترین قەزایە و تەمەنی بە قەزابوونی (١٤٢) ساڵە.

## شێخ لە چەند دێڕێکدا

شێخ مەحمود کوڕی شێخ سەعیدی کوڕی شێخ محەممەدی کوڕی شێخ کاکە ئەحمەدی کوڕی شێخ مارفی نۆدێیە.
ساڵی (١٨٨٦) لە شاری سلێمانی لەدایکبووە.
ساڵی (١٩٠٤) لەگەڵ باوکیدا چاوی بە سوڵتان عەبدولحەمید کەوتووە.
ساڵی (١٩١٠) گەڕایەوە سلێمانی.

یەکەم مەلیکی کوردستانە، لە سێ کاتی جیاوازدا فەرمانڕەوایی کوردستانی کردووە: حوکمداریی یەکەم لە (١٩١٧/١١/١٧) و حوکمداریی دووەم لە (١٩٢٢/١٠/٩) و حوکمداریی سێیەم لە تەموزی (١٩٢٢)دا بوو.

لە ساڵی (١٩١٩) دژی بریتانییەکان شۆڕشی هەڵگیرساند و لە مانگی حوزەیراندا لە شەڕی بازیان بە برینداری بەدیلگیرا و لە (٢٥)ی تەموزی (١٩١٩) درایە دادگای سەربازیی ئینگلیز و حوکمی لەسێدارەدان درا و دواتر بە (١٠) ساڵ زیندانی بۆ هیندستان دوورخرایەوە.

ساڵی (١٩٢٢) دوای هاتنی بۆ کفری و گەڕانەوەی بۆ سلێمانی لە مانگی (١٠) دا خۆی وەکو مەلیکی کوردستان ڕاگەیاند.

ساڵی (١٩٢٤) ئینگلیزەکان بەسەر جوولانەوەکەیدا سەرکەوتن و ئەویش دەستیدایە شەڕی پارتیزانی و تا ساڵی (١٩٢٧) بەردەوامبوو، دواتر ناچار روویکردە ئێران.

ساڵی (١٩٣٠) گەڕایەوە سلێمانی.

ساڵی (١٩٣١) شەڕی ئاوباریکی کرد و دوای ئەوە بۆ خوارووی عێراق ڕەوانەکرا و بۆ ماوەی (١٠) ساڵ مایەوە.

ساڵی (١٩٤١) لە ڕێگەی بەغداوە بۆ کوردستان گەڕایەوە.

ساڵی (١٩٥٦) نەخۆشکەوت و بۆ چارەسەر چووە بەغداد و شەوی (٩/١٠ - ١٠ - ١٩٥٦) لە نەخۆشخانەی حەیدەرییەی شاری بەغداد ماڵاوایی لە ژیان کرد.

لە مزگەوتی گەورەی شاری سلێمانی بەخاکسپێردرا.

●●●



## تایبەتمەندییەکانی شاری کفری

**شکور حەمەی هەیەر**

پێگەی جوگرافی:

هەڵکەوتەی شاری کفری لە دێرزەمانەوە جێگەیەکی ستراتیژی بووە لەهەموو رووەکانی کۆمەڵگەوە، تاکە شاربووە لەنێوان شاری بەغدا و قەلاّچوالان و پاشان سلیمانیی، نێوان رووباری سیروان و رۆخانە بووە ئەمەش کاریگەری باشی  هەبووە بۆ هاتوچۆی کاروانە بازرگانییەکان، ئەو سەردەمەی بازرگانی لەسەر پشتی ولاخی بەرز و بارهەڵگربووە و جێگەیەکی وشکانی بووە لە وەرزەکانی ساڵدا و هیچ رووبارێك نەبووەتە کۆسپ بۆ هاتوچۆکردنی کاروانە بازرگانەکان..  ئەمەش یەکیکە لە تایبەتمەندییە جوگرافییەکانی شاری کفری و هۆکاری سەرەکی بووە بۆ دروستبوونی ئەم شارە لە دێرزەمانەوە.

پێگەی بازرگانی:

دیارە هەرجێگایەك بکەوێتە نێوان گەورە یان دوو ناوچەوە دبێتە پێگەیەکی بازرگانی لەونێوەندەدا. بەپێی شوێنی جوگرافی شاری کفری لە دێرزەمانەوە تاکو کۆتایی حەفتاکانی سەدەی رابووردوو شاری کفری تاکە شاری ناوچەی گەرمیان بووە لەڕووی بازرگانییەوە.. هەموو بەرهەمەکانی کشتوکاڵی و ئاژەڵداری ناوچەی گەرمیان تا هەورامان و شارەزوور و قەرەداخ بەزۆری لەم شارەدا ساغدەکرایەوە و ئاڵوگۆڕی بازرگانی تێدادەکرا، چەندین بازرگانی گەورە و مامناوەندی لەم شارەدا پەیدابوون وەك (ئەلیاهو جوولەکە)و چەند بازرگانێکیتر لە دانیشتوانی کفری وەك (حاجی حەمە عەلی لاڵ و حاجی فەتاح کۆسە و حاجی فەتاحی قەڵەو حاجی فارسی جاف و سابیر عەبدە و.. هتد).

چەندین پیشەوەریتر روویان لەم شارە کردووە لە شارەکانیتری عێراقەوە بۆ کاسبکاری وەك بنەماڵەی دەباغەکان و ئاسنگەرەکان و جۆلاً و هەلاج و خومچی و وەستای بیناسازی و وەستای کوورەی گەچ و وەستای دارتاشی و ناڵبەند و.. هتد)، بەگەشەسەندنی ئەم شارە لەڕووی بازرگانی و پیشەسازی و کشتوکاڵ و ئاودێرییەوە شارەکە بووە جێی سرنج و تێڕوانینی دەسەڵاتەکانی ئەوە سەردەمە و بەتایبەتی لە سەردەمی حوکمڕانی دەوڵەتی عوسمانیدا هەربۆیە لە ساڵی ١٨٧٠ز ئەم شارە کراوە بە قەزا و ناحییەکانی (خورماتوو- شێروانە - سەرقەڵاً -قەرەتەپە) خراونەتەسەر ئیدارەی ئەم شارە. تورکەکان بەهەموو توانایانەوە هەڵسان

بەپەیڕەوکردنی سیاسەتی تەتریککردنی شارەکە و ئێستاش چەندین بنەماڵەی کوردی ڕەسەنی ئەم شارە بوونەتە تورکمان. گومانی تێدانییە هەر ناوچەیەك گەشەی بازرگانی تیدابێت لەڕووی بیناسازیشەوە گەشەدەکات.. بۆیە ئەم شارە پێش بوونی بە قەزا لە ساڵی ١٨٧٠ز هەر وێستگەیەکی بازرگانی بووە لە ساڵی ١٧٠٥ز لەلایەن بنەماڵەی بابانییەکان و سەیدەکانی کفرییەوە هەڵساوەن بە دروستکردنی قەیسەری کفری کە بریتییەلە (٤٣٥) دوکان و (٨) خانی گەورە و حەمامێکی گەورە کە تاکو ئێستاش هەرماوەن جگەلە دروستکردنی چەند مزگەوتێك وەکو (مزگەوتی خانەقای نەقشبەندی و مزگەوتی گەورە و مزگەوتی مدرسە و مزگەوتی حاجی فەتاحی کۆسە).

بەهۆی ئەم فاکتەرانەوە شاری کفری گەشەیەکی بەرچاوی بەخۆیەوە بینی لەڕووی رۆشنبیریەوە.

باری رۆشنبیری:

بەهۆی بوونی مزگەوتی خانەقای نەقەشبەندی و مزگەوتی مدرسە و مزگەوتی گەورەوە کە هەمووی حوجرەی خۆێندنی تێدابوو چەندین زانای ئایینی گەورە روویان لەم شارە کردووە لەوانە (مەلاسەعیدی موفتی) کە لەلایەن موفتی عێراقەوە مۆڵەتی فتوای پێدرابوو. لەسەردەستی ئەو زانا گەورەیە چەندین مەلا و زانای ئایینی پەروەردەبوون لەناوچەکەدا، هەروەها چەندین زانای گەورەی وەك (مەلا

عەبدولکریمی مودەڕیس و مەلا جەمیل ڕۆژبەیانی) بۆ وانەوتنەوە هاتوونەتە ئەم شارە. پاش ئەوەی لە سالی ١٨٧٠ز کفری بەفەرمی کرا بە قەزا لەلایەن دەسەڵاتی عوسمانییەوە قوتابخانەی (رووشدییە) کرایەوە بۆ کوڕان. لە ساڵی ١٩٣٤ز بۆ یەکەمینجار قوتابخانەی کچانیش لە کفری کرایەوە.. بۆیە شاری کفری لەڕووی رۆشنبیرییەوە هەنگاوێکی گەورەی بەرەوەپێش ناو باری رۆشنبیری شارەکە زیاترگەشەیسەند لەبوارەکانیتردا. چەندین شاعیری گەورە لەم شارەدا سەریانهەڵداوە وەك (عەبدال داودە- مەلاحەسەن نوحی - شێخ ئەحمەد شاکەلی- سەقمی- خەلیل منەوەری کاکەیی- قەمبەر بەگلەر- مینەجاف)و لە سەرەتای ساڵی حەفتاکانیشدا سەرهەڵدانی شۆڕشی شیعری نۆی لەم شارەدا سەریهەڵدا لەسەردەستی شاعیری گەورەی گەلەکەمان (لەتیف هەڵمەت و فەریق ئەمین و فەرهادشاکەلی)و چەندین کەسایەتیتری رووناکبیری ئەم شارە. لەبواری گۆرانی و مەقاماتیشدا مەقاماتی عیراقی لەم شارەدا سەریهەڵداوە لەسەردەستی خوالێخۆشبوو (رحمەتوڵلاّ شەلّتاخ و پاشان مەلا عەبدوڵلاّی خەتیب)، محەممەد گوبانچی و نازم غەزالی و چەندین مقامبێژیتری عەرەب هاتوونەتە ئەم شارە بۆ فێربوونی مەقامات.. (حەمەی ئینجەی زەنگنە) یەکێك بووە لە مقامبێژەکانی ئەم شارە و مامۆستا (عەلی مەردان) هاتووە بۆلای بۆ فێربوونی مەقامی قەتار و ئەڵلاوەیسی. لەبوارەکانیتردا وەك (شانۆگەری -وەرزش) بەهەمانشیوە رۆڵی کاریگەری هەبووە.

باری کۆمەڵایەتی:

ئەگەرچی کفری شارێکی دێرینی کوردستانی باشوورە، بەڵام بەهۆی پێگەی جوگرافیاکەیەوە لەهەموو پێکهاتەکانی عیراقی تێداجێگیربووە وەك (تورکمان و عارەب و جوولەکە).

بوونی تورکمان دەگەڕێتەوە بۆ بوونی سەردەمی دەسەڵاتی عوسمانییەکان لە ناوچەکە هەروەها بوونی عەرەبیش دەگەرێتەوە بۆ دوو هۆکار:

یەکەم: لەبەرئەوەی شاری کفری هاوسنووری عەرەبە لە باشوور و رۆژئاواوە و سەردەمانێك پێش ئەوەی عۆزیم ببێتە شار لە عۆزیم بناری حەمرینەوە عەرەبەکان بۆ کڕین و دابینکردنی پێوستییەکانیان روویان لەم شارە دەکرد و هەندێکیان نیشتەجێی ئەم شارە بوون و بەهۆی تێکەلاوبوونیان لەگەڵ کورد و تورکمانەکاندا بوونەتە کورد یان تورکمان.

دووەم: لە سەردەمی دەسەڵاتی رژێمی بەعسدا رژێم خێزانیکی زۆریهێنا بۆ ئەم شارە، ئەوەش بەمەبەستی بەعەرەبکردنی شارەکە، بەڵام لەدوای راپەرینەکەی ساڵی ١٩٩١ز هەموویان شارەکەیان بەجێهێلا، هەروەها زیاتر لە (٥٠) خێزانی جوولەکەش لەم شارەدابوون، بەڵام لە ساڵی ١٩٤٨ز بەدواوە سەرجەمیان کۆچیانکرد بۆ ولاتی خۆیان.

شایەنیباسە هەموو پێکهاتەکانی ئەم شارە بەشێوەیەکی یەکسان و تەبا دەژیان هەموو بەچاوی رێزەوە بۆ یەکتری دەیانڕوانی هەرئەو پەیوەندییەش وایکردووە تاکو ئەمرۆ گۆڕستانی جوولەکەکان وەکو خۆی

ماوە و ڕێزی لێدەگیری. ئەگەرچی سەردەمی شەڕی عیراق - ئیران ڕژێمی بەعس هەڵسا بەلێدانی خەندەقێك لە نزیك گۆڕستانی جوولەکەکان بەشێکی گۆڕستانەکەی شێواندووە.

باری کشتوکاڵ:

بەهۆی بوونی زەویوزاری زۆر و تەختاییەوە و بەهۆی ئاوی چەمی کفرییەوە کە لە باکووری شارەوە دەهات شاری کفری کاتی خۆی ناوچەیەکی کشتوکاڵی بووە و چەندین باخی میوەی جۆراوجۆری تێدابووە بەتایبەتی داری خورما و جۆرەکانیتری میوەی ترشەمەنی و گرنگترین لەو باخانەی شار (باخی پاشا - باخی قازی - باخی عینەبەگ - باخی حاجی ترشی - باخی مامەلی- باخی سەید محسن ئاغا- باخی حاجی حەمید- باخی خوشف قورماز- باخی حەیار-باخی موسی بەگ) لەگەل چەندین باخچەی بچووك و مامناوەندی.. یەکێك لە گۆرانییەکانی مامۆستا عەلی مەردان کەدەڵێ (هەڵسە بابچین بکەین تەماشا لە باخچە و مێرگوزاری پاشا) کە مەبەستی باخی پاشایە لە کفری کە شیعری (قەمبەربەگلەری کاکەیی)یە، بەڵام بەهۆی وشکبوونی ئاوی چەمی کفرییەوە بەداخەوە هەموو باخەکان وشکبوونەوە و پاشان شارەوانی هەڵسا بەدابشکردنی زەوییەکانی و ئێستاکە بەس بەناو ماوەن، هەروەها بامیە و کاڵەکی قەرەیی دوانزە ئیمام گەورەترین ناوبانگی هەبووە و یەکێك بووە لە دیارییە بەبەهاکان کەساڵانە بۆ (عومەر نەزمی)

دەنێردرا بۆ بەغدا کە ئەوکاتە عومەر نەزمی سەروەکوەزیرانی عێراق بووە، هەروەها بەرهەمی گەنم و جۆ و هەموو دانەویڵەکانیتری کفری بەهای تایبەتی خۆی بووە لە کەرکوك و بەغدا و خانی بەنی سەعد.

باری رامیاری:

پیرەمێرد فەرموویەتی:

ئەم هەرا و هوریای شەڕی جیهانە

لێکیبدیتۆ هـــــەمووی بۆ نـــانە

گومانی تێدانییە هەر جێگەیەك سەرچاوەی داهاتی تێدابێت هەموو دەسەلاتێك بایەخی پێدەدات و هەوڵی داگیرکردنی دەدات.. شاری کفریش لەکۆندا یەکێك بووە لە ناوچە پڕبایەخەکان لەڕووی بازرگانی و کشتوکاڵ و سەرچاوەی داهاتی جۆراوجۆر بووە. لە سەردەمی شەڕی نێوان عوسمانی و سەفەویدا پێگەیەکی گرنگی بووە لەلای ئەو دوو دەسەڵاتە.. بۆیە دەوڵەتی عوسمانی لەم شارەدا پێگەیەکی سەربازی باشی تێداکۆکردەبووە و بۆ پەرپەرچدانەوەی هەر هێرشێکی سەفەوییەکان بۆئەوەی لەم دەروازەوە هێرشنەکەن بۆ دابڕانی موسل و کەرکوك و بەغدا.. بۆیە چەندین شەڕی گەورە لەم ناوچەیەدا روویداوە لەنێوان دەوڵەتی عوسمانی و سەفەوی یان لەنیوان دەوڵەتی عوسمانی و میرنیشینی

باباندا. لە ساڵی ١٨١٢ز شەڕێکی گەورە لەنێوان داود پاشای والی بەغدا و عەبدولڕەحمان پاشای بابان روویدا لەنزیك شاری کفری لەوشەڕدا خەڵکی شاری کفری پشتیوانی عەبدولڕەحمان پاشای بابانیان کرد دژی والی بەغدا و بەهۆی پشتیوانیکردن لە عەبدولڕەحمان پاشای بابان، رۆستم ئاغای زەنگنە و زاڵە ئاغای برای لە ساڵی ١٨١٢ز لە موسل لەسێدارەدران، لە ساڵی ١٨١٢ز لەسەر داوای شیخ مەحمودی مەلیك (بەهاء ئەفەندی) کە دەستی هەبوو لە شەهیدکردنی (شیخ سەعیدی حەفید) لە ساڵی ١٨١٢ز لە شاری کفری لەلایەن خەڵکی کفرییەوە کوژرا. لە سالی ١٩٢٠ز (برایم خانی دلۆ) لە شاری کفری بە هاوکاری خەڵکی گەرمیان شۆڕشیان بەرپاکرد دژی دەسەڵاتی ئینگلیزەکان بۆئەوەی جەختبکەنەسەریان تاکو شیخ مەحمود و هاوڕێکانی رزگاریانبیێت لە زیندان.

هەر ئەو هۆکارەش بوو کە لە بەرواری ١٩٢٢/٩/٢٢ز (شێخ مەحمودی نەمر) پاش رزگاربوونی لە زیندان و گەڕانەوەی بۆ کوردستان یەکەم قۆناغی شاری کفری بوو لەورۆژەشدا دوو کۆنگرە جاڕدرا بۆئەوەی حکومەتی کوردستان دابمەرزینێت کە ئەمڕۆ ٩٠ ساڵ بەسەر ئەو یادە شکۆمەندەدا تێدەپەڕێ.

ساڵی ١٩٢١ز (محەممەدخاڵسی) قائمقامی کفری گەورەترین نەورۆزی کرد کە تاکو ئیستاش خەڵکی کفری بەردەوامن لەویادە.

لە ساڵی ١٩٣٤ز کە بارزانییەکان هێنرانە شاری کفری کە دەستبەسەرکرابوون خەڵکی شاری کفری گەورەترین خۆپیشاندانیان ئەنجامداو و حکومەت ناچارکرا بارزانییەکان لە بەندیخانە بەندنەکات و پاشان خەڵکی کفری دابەشیانکردن بەسەر ماڵەکاندا. (سەمین قۆلچی) کە کەسایەتییەکی شاری کفری بوو ماڵەکەی خۆی چۆڵکرد بۆ (شیخ ئەحمەدی بارزانی) خۆیشی چووە خانوویەکی کرێ. بەداخەوە ئێستاکە ئەو خانووە بووەتە کەلاوە.. ئەوەش خەوشێکی گەورەیە بۆ کورد و ئەوانەی خاوەن دەسەڵاتن کە ئاوەڕێکی لێنادەنەوە.

ساڵی ١٩٤١ز شێخ مەحمودی حەفید لە بەغداد دەستبەسەربوو پاشان بە هاوکاری خەڵکی کفری و گەرمیان رزگاریبوو، لە ناوچەی جاف لە دێی (پەلەوشك) تووشی شەڕێك بوو لەگەڵ پیاوانی حکومەتی عێراقیدا خەڵکی ناوچەکە پارێزگارییان لە شێخ کرد و هیزەکەی حکومەتیان شکاند و شێخیش رزگاریبوو، پاشان ئەوناوچەیە تووشی زیانی مادی و ماڵی بوون. لە سەرەتای ساڵی پەنچاکانیشدا چەندین رێکخراو و کۆمەڵە و گرووپی سیاسی لە شاری کفری و گەرمیاندا سەریانهەڵدا بۆ پشتیوانیکردنی شۆڕشی رزگاریخوازی گەلی کورد، دوای بەرپابوونی شۆڕشی ئەیلولیش خەڵکی شاری کفری و گەرمیان هاوکاری و بەشداری کاریگەرییان کرد لە شۆڕشی ئەیلولدا. لەسەرهەڵدانی شۆڕشی نۆیشدا بەهەمانشیوە خەلکی کفری و گەرمیان رۆڵی کاریگەریان بینی و چەندین داستانی گەورەیان تۆمارکرد لە مێژووی خەباتی گەلەکەماندا.

داستانی کفری- سەرقەڵاّ لە پاییزی ۱۹۹۱ز بووەهۆی تێکدان و شکستی رژێمی بەعس لە داگیرکردنی کوردستان، بەرهەمی ئەو داستانە بوو رژیم سووپا و ئیدارەی لە کوردستان کشاندەوە و پاشان هەڵبژاردن و حکومەتی کوردستان لەدایکبوو.

لە ئێوەی بەڕێزیش داواکارم هاوکارمانبن بۆئەوەی حکومەتی هەرێمی کوردستان ئاوڕی جیدیتر لەم شارە دێرینەی کوردستان بداتەوە، بەتایبەتی بایەخ بە شوێنەوارەکانی بدات لەبەرئەوەی شوێنەوار جگەلەوەی ناسنامەی راستەقینەی هەموو گەل و نەتەوەیەکە لە خاك و نیشتمانی خۆیدا و سەرچاوەیەکی گەورەی داهاتیشە. شاری کفریش دۆڵەمەندترین شاری کوردستانە لە بوونی سەدان شوێنەوار و بینای کەلتورییەوە.

•••



## لەبارەی مەلیکی کوردستانەوە

## پ. د. عیزەددین مستەفا ڕەسوڵ

دوو شتی گەورە، دوو سەرەناوی گەورە، مەلیکی کوردستان، لەولاوە شاری کفری.. هەریەکە هی ئەوەیە پیاو شانازی بکات کە دوو قسە بکات لەبارەیانەوە.

بەداخەوە کاتی ئەوەم نەبوو یان باری ئەوەم نەبوو کە بتوانم شتێك بە نووسین پێشکەشبکەم، بەڵام لێرە ڕەنگە هەر چوار پێنج قسەبکەم، بەتایبەتی برای زۆر خۆشەویستم مامۆستا عەلی عەبدوڵڵا زۆر کەسانێ کەوا لێرەن و چ ستایشەکانیش و چ لە ئەدەبی کوردیدا باسی شێخ چەند نامەیەکی گەورەی دکتۆرای لەسەر دەنووسرێ بەچەند دێڕێکی خۆی دەسپێدەکەم.. وەکو دەزانن شێخ مەحمود شاعیریش بووە

و شاعیرێكی باشیش بووە، تەخەلوسی شیعریی "نووربەخشی" بووە، چونكە ئەوان وەك بنەماڵە پێش ئەوەی ببن بە قادری لەسەر تەریقەتی نووربەخشی بوون، نووربەخشیش ئەوە یەكێكە لە پیاوە گەورەكانی كورد و ناوی لە مێژووی كوردا دیارە و خۆزگە ئەمانتوانی و بەتەمابووین كە سیمینارێكی بۆ بگرین لە سوریا، بەلاّم باری سوریا تێكچوو.

كە باسی شێخی نەمر دێت، من بەو دوو دێڕەی خۆی دەستپێێئەكەم كە بە فارسی ئەڵێ:

چون به عزم این سفر پا از میدان برداشتیم
دست از جاه و جلال و خان و مان برداشتیم
صد هزاران نـــوجوانان را به خاك انداختیم
تا كـه زنگ كفر از كوردســــــتان برداشتیم

واتا كە بە عەزمی ئەم سەفەرە، ئەم كارە (یەعنی شۆڕش) پێم لەمەیدانا هەڵبڕی، دەستم لە جاه و جەلال لە دەوڵەمەندی و لە ماڵی دنیا و لەهەموو شت هەڵگرت، دەستم لە خانومان هەڵگرت.. سەد هەزاران نەوجوانانم خستەناو خاكەوە بۆئەوەی زەنگی كوفر (ژەنگی كوفر) لە كوردستان هەڵبڕم و بیڕەوێنم، نەیهێڵم.

جا لێرەدا.. كاتی نییە، بەلاّم شێخ هەموو فیداكارییەكی كردووە لەپێناوی كورددا، تەنانەت ئەو ماوانەی كە لە جاسەنە بووە، لە شوێنیتر بووە، لە شۆڕش بووە، لە موڵك و ماڵی خۆی سەرفیكردووە بۆ

شۆڕشەکەی، دەستی لەهەموو شتێك هەڵگرتووە لەپێناوی کوردا و وەك دەفەرموێ سەد هەزاران نەوجوانانم بەخاکسپارد، بە شەهیدبوونم دا، بۆئەوەی ژەنگی کوفر لە کوردستان نەهێڵم، کوفر، لێرەدا دوو لایەنمان بۆ دەردەخا: لایەنێکیان داگیرکەری ئینگلیزە کە شێخ وەك کەسێکی موسڵمان کە بەڕاستی ئەوەی من بە خزمەتی گەیشتووم، بەڵام منال بووم، بەڵام ئەوەی کە دەیگێڕنەوە زۆر بەدین بووە، دیانەتەکەی زۆر بەهێز بووە، داگیرکەری ئینگلیزی بە کافر زانیوە. لەبەرئەوە ئەم هەموو کارەی کردووە، بۆئەوەی داگیرکەر نەهێڵێت لەکوردستاندا. داگیرکەرنەهێشتن لەکوردستانیشدا، لەکوێ، (از کوردستان برداشتیم) لە کوردستان. باوەڕی بەوە هەیە کە خاکێك هەیە پێیئەڵێن خاکی کوردستان کە بەداخەوە ئێستاش هەمانە لە وڵاتەکەدا دانبەوەدانانێت کە کوردستان هەیە، رەنگە لەناو خۆشماندا هەبێت بەو ناوە ناوینابەن بەداخەوە.

ئەو، خاکەکە بە خاکی کوردستانی دەزانێ و ناویشی بووە بە مەلیکی کوردستان، یەکەم مەلیکی کوردستان. ئێمە بەداخەوە (ناڵێم هەموو میللەت، یان هەموو خەڵك)، زۆر لە خەڵکمان هەن کە ئەیانەوێ ئەو رەمزە گەورانەی کە هەمانن، کەمیانبکەینەوە، بەڵام کۆمەڵێك رەمزمان هەیە لە ژیانی کورددا، لە مێژووی کورددا، ئەمانەوێ کەمیانبکەینەوە. لەکۆنەوە من دێم: لە ئیبراهیمی خەلیلەوە، کە من

چەندجار چوومەتە زیارەتی مەرقەدەکەی لە ئورفە.. خەڵکی ئوور نییە، خەڵکی ئورفەیە، ئورفەی کوردستانی باکوور. مەنجەنیقەکەش هەر لەوێیە. خۆ ئیبراهیم زۆر بەڵگە هەیە بۆئەوەی کە کورد بووە کە ئێستا جێی باسی ئەوە نییە، بەڵام لەوێوە دەستپێبکەین، دێین بۆ سەر مەلیکی کوردستان، تائێستا ئێمە شانازی بەو ناوەوە دەکەین، ئەڵێین مەلیکی کوردستان، چونکە ئێستا کوردستان کە هەرێمێکمان هەیە، شوێنیتر خەریکە ئازادئەبێت و دەوڵەتی کورد بەڕێوەیە، بەڕێوەیە و زۆری نەماوە، (چەپڵەی ئامادەبوان..).

ئێمە رەنگە پەلەمان بێت، بەڵام خەڵك پەلەی نییە، بەلاّم لەهەر شوێنێکی ناو دەوڵەتاندا بپرسیت، ئێستا دان بەوەدا دەنێن (بەتایبەت ئینگلیز) تاوانێکی گەورەیان لەگەڵ کورددا کرد و کوردستانیان دابەشکرد، بەڵام سوودیشیان لێنەبینی، سوودیان لێنەدی، رەنگە ئێستا کە ئەگەر لێپرسراوان ببینی ئینگلیزی، فەرەنسی، زۆر یاداشت و شتم هەیە دان بەوەدا ئەنێن کە تاوانێکی گەورەیان کرد.

شێخی نەمر، ئەوەی کە بەداخەوە دروستئەکرێت کە نەیویستوە، دەستبخاتە دەستی ئینگلیزەوە لەبەرئەوەی کە کافرن، وانییە، ئەو کاتێ کە هاتووەتەوە لە هیندستانەوە کە برادەرێك وتی کەسیان دەستنەکەوت، هەر ئەبوو ئەو بێتەوە، ئەم وڵاتە هێمنبکاتەوە و ببێتەوە بە مەلیکی کوردستان.

شێخی نەمر لە کتێبی (لەخەوما)ی جەمیل سائیب کە بەداخەوە یەکێك لەو شتە خراپانەی کە بۆ دژایەتی شێخ نووسراوە و هۆکانی دیارە شەخسییە یان بنەماڵەییە، شتێکە، هەر چۆنێکە.. لەوێدا بەناوی شێخەوە، جەمیل سائیب ئەڵێت: (کە ئەو رۆمانە خۆی- خۆی رۆمانیشە- بۆ کەمکردنەوەی شێخ نووسراوە) شێخ ئەڵێ: چی بکەم، پەنا بۆ کوێ بەرم، دەستم بۆ ئینگلیز درێژکرد، دەستم بۆ تورك درێژکرد، دەستم بۆ رووسی بەڵشەویك درێژکرد، سوودیاننەبوو، بەڵام من ئەبێ هەر کۆڵنەدەم و هەر خەریکبم. جا ئەگەر دەستی بۆ شوێنێك درێژکردبێت، چ ئەو، چ رەمزەکانیترمان کە هەمانن لە مێژووی کورددا، دوای ئەویش کە دەستیان بۆ شوێنێك، بۆ لایەك درێژکردووە، مەسەلەکە ئاشکرایە بۆ کوردە، چونکە شێخ یەکێکە لەوانەی شێخ مەحمود سەرکردەیەك من ناڵێم سەرکردەکانیترمان ئایا چوونەتە شەڕەوە؟ ئازابوون؟ بارزانی نەمر تا سەرکردایەتی بەدەست شێخ ئەحمەدەوە بووە، وەك پێشمەرگەی ئەو لەناو شەڕدا بووە، دواتریش سەرکردە بووە ئاگای لە شەڕەکان هەیە، هەر تیابووە، پێشەوا قازی محەمەد ئاشکرایە پێوەندییەکانی و زیرەکی و زمانزانیی چی و ئەوانە، بەڵام کەسێك وەك شێخ لەو سەرکردانە (کە ئەمە کەمکردنەوە نییە لەوان، خۆی نەچووەتە پێش لەشکرەکەیەوە).. ئەم خۆی چووەتە پێش لەشکرەکەیەوە و شەڕیکردووە تا بەوجۆرە بریندارکراوە و ئینگلیز بەوجۆرە گرتوویانە و

رەوانەیانکردووە. ئەمە خاسیەتێکی گەورەیە کە خۆی تا دوواگوللە کە بەریکەوتووە تەقەیکردووە لەڕێگای کوردا کە ئەو سەرکردەیە، لە زۆر شوێن سەرکردە لۆمەئەکرێت خۆی بچێتە شەڕەوە، چونکە ئەبێ لەدەرەوەی شەڕەکە سەرکردایەتیبکات و ئەوانیکەش زۆرێك وابوون، بەلاّم لۆمەی ئەوان ناکرێت، بەلاّم ئەم خۆی چووەتە ناوەوە، خۆی پێشیانکەوتووە و خۆی گوللەی بە دوژمنەوە ناوە و تەقەیکردوە و بریندارکراوە، تا ئەوکاتەی بە بریندارکراوی دۆزیویانەتەوە لە دەربەندی بازیان بردوویانە، واتا تا ئەوکاتە شەڕیکردووە. کۆمەڵێك دیمەن هەیە لە مێژووی شێخی نەمردا کە هەر یەکێکیان تا دووا ساڵانی ژیانێتی کە عومەر عەلی تورانی چووەسەری بۆ داریکەلی، بەلاّم هەر لەپێش ئەوەی سەرکەوێت، یەکێك لەوانەی کە شێخ داڵدەیدابوو (داریکەلی بوو بووە شوێنی داڵدەدانی زۆر لەوانەی کە چەوسێنرابوونەوە) ئەوەی ئەوکاتە بچوایە پارێزرابوو، ئەوەی کە من ئەڵێم کە تەقەی لە عومەر عەلی کرد و نەجمەکانی سەرشانی هەڵگرت لە بەرانان، پێیشیوت: عومەر عەلی گوێتلێمبێت، من موشیری سەلمان ئاغای ڕێڤێم (ڕێڤێی لای ئاکرێ کە قەبری شێخ ئیسماعیلی ولیانی تیایە کە خاڵی کاك ئەحمەدە).. ئەوانە حوکمی ئیعدام درابوون و رایانکردبوو لای شێخ بوون، بەینێکیش ناردیە دێلێژە.. وتبووی: من موشیرم، ئەوا نەجمەکانتم هەڵگرت، ئەمتوانی لەجیاتی ئەوەی بە نەجمەکانتیەوە بنێم، بینێم بەدڵتەوە، تۆ پیاوی ئەوە

نیت بێیتە داریکەلی بۆسەر شێخ مەحمود. (چووبووە داریکەلی بە حیساب کێی لێیە؟: بە شیوعییەوە، بەوانەی کە لە عەشیرەتی گێژن ئەوان (ماڵی موشیر ئاغا)و ئەوان، بەوانەوە بەکێوە، بەکێوە، رەنگە بە عەسکەری فیرارەوە، داڵدەی هەموو کەسێك دەدا لە داریکەلی، بە کوردەکانی ئێرانەوە ماوەیەك زەبیحی، حەسەنی قزلْجی هەموو لەوێبوون یان لەویّ یان ئەیناردنە سیتەك یان لەملاوە ئەیناردە دێلێژە، من ئاگام لە هەندێکیان هەیە کە دێلێژەش هەر کەسی شێخن و خاڵوانی شێخەکانی نەوەی کاك ئەحمەدن.. وتی: تۆ ئەو پیاوە نیت بێیتە سەر شێخ مەحمود، ئەمنا بەدڵتەوە، بگەڕێرەوە دواوە. عومەر عەلی گەڕایە دواوە. عومەر عەلی یەکەم بەرامبەر بە شێخ ئەیویست کارێك بکات، چونکە عومەر عەلی ئەو کەسەیە کە لە رۆژی ١٤ی تەموزدا چەکی دژی ١٤ی تەموز هەڵگرت لە ناسریە ویستی گوایا شۆڕشەکە نەهێڵیّ و گیرا و حوکمدرا و دواییەکانی ئەیانوت گوایا مەعزەرەت ئەهێنێتەوە.. یەعنی، نەیتوانی بگاتەسەر شێخ، بەس ئەو نیازی خراپیشی هەبوو، وەك رەمزێکی کورد بەرامبەری.. ئەمە دیارە هەر پێوەندی بە ئینگلیزەوە هەیە بە بیری تورانی خۆشیەوە هەیە.

جا لەسەر شێخ، وەك یاداشت و وەك نووسین لەسەر ژیانی، وەك ژیانی لە ئەشکەوتی جاسەنە (من بەداخەوە کۆمەڵێك رەسمی ئەشکەوتی جاسەنەم گرت، برادەرێك بردی و نەیدامەوە، ئێستا رەنگە

لەئەرشیفەکەیدا مابێت) هەر لەو ئەشکەوتەدا حەپسخانەیەکی دانابوو، خەڵکیی ئەڵێن لەوێ خەڵکی حەپسکردووە، بەڵام ئەوەی حەپسیکردوون، بۆچی حەپسیکردوون؟ (من نامەوێ ناوەکان بڵێم) بەس ئەوانەیە کە پێوەندییان بە ئینگلیزەوە بووە. لەناو ئەشکەوتی جاسەنەدا، قەمچوغەیی پیرم دیوە کە مابوو و دیویەتی ژیانی ناو ئەشکەوتەکەی چۆن بووە؟ ژیانی ناو ئەشکەوتی وەك هەموو کەس لەوانە کە لەوێ بوون لەگەڵیدا، خۆراکی، دەینارد لە موڵك و ماڵەکەی خۆی بۆیبەرن.

ڕۆژنامەیەکی سەر بە ئینگلیز ئەو وەختە نامەیەکی شێخ حەمە غەریبی بڵاوکردووەتەوە، تۆزێ گاڵتەکردنی تیایە کە ناردوویەتیەسەر قەرەداغ کە شتەکانی بۆ بنێرن، موڵکانە بنێرن و ئەگەر نەینێرن وائەکەم و وائەکەم، بەڵام لەکوێوە، لە جاسەنە و لە ئەشکەوتەوە. کابرا ئەڵێت ئێستا لە ئەشکەوتە و ماوەیەك لەمەوپێش وەزیری ناوخۆ بوو.. ئینجا بزانە چی بە خەڵك کردووە، چی کردووە و بۆ کێی نووسیویە شێخ حەمەغەریب، بۆ خۆی نەویستووە، بۆئەوەی خەرجیبکەن بۆ ئەو خەڵکەی لەوێن.

ئەوەی کە گرتوونی، من نامەوێ بێمە سەر ناوەکان، هەریەکە پێوەندییەکەی بە دووژمنەوە کە ئەو خەیاڵی لێکردووە. یەکێك لەوانە مەسەلەن (بەڵام وەك ئینسانێکی شەریف و شاعیرێکی شەریف)

ئەحمەدی بەگی جافە کە چووە، بە حیساب ئەوان مێجەرسۆن کە مێجەرسۆن قسەیەك ئەکات، (من بەداخەوە لەم شەوانەدا لەتەلەفزیۆندا چەند برادەرێکم گوێلێبوو، لە خۆیانەوە، یەعنی ئەیانەوێ وابکەن کە شێخ نەیویستووە ئەو دەوڵەتە بمێنێ و چی بمێنێ و ئەگەر وانەبوایە لەگەڵ ئینگلیزدا رێکبکەوتایە، نەخێر ئینگلیز بڕیاری ئەوەبوو نابێت کورد دەوڵەتی هەبێت). مێجەرسۆن ئەڵێت: ئەگەر ئەیانەوێ ئینگلیز ئەم حکومەتە بمێنێ.. (مێجەرسۆن زۆر رقی لە شێخان بوو، چونکە کە بەناوی غولامحسێنەوە توجاری ئێرانییە لە شاری سلێمانی بووە، هەندێك شێخ عەزیەتیانداوە، توجارێکی ئێرانییە و پارەی هەیە) شێخی خۆشنەدەویست، ئەڵێت ئەم حکومەتە ببەنە هەڵەبجە، چونکە هەڵەبجە چاکترە، جوانترە، پاکترە و فلان و فیساریش لەوێن. ئەو کلیلیان ئەداتێ، ئەگەر بیانەوێ حکومەتەکە بمێنێ، بەلام ئەوان نەخێر نەیانئەویست حکومەتەکە بمێنێ چونکە مستەفا کەمال پەیداببوو، مستەفا کەمالی تورانی لەگەڵ ئینگلیزدا رێککەوتبوو، تازە نەئەبوو کورد دەوڵەتی هەبێت. تورك (تورکی ئێستا ناڵێم، ئەمە شتێکی تازەن ئەمانەی جەماعەتی نەوڕەسی کە ئێستا لەسەر حوکمن و هیچیشیان تورك نین، نە ئۆردوگان، نە عەبدولا گول، نە کابرای خۆمان عەلی باباجان کە باوەجانییە و خەڵکی سلێمانییە، هیچیان تورك نین.. من رایەکیترم هەیە دەربارەیان، ئیسلامیشن). تورك دەستێکی گەورەی هەبووە لە

تێکدانی وەزعی کورددا، تەنانەت هەندێك بەڵگە کە برای نەمرمان محەممەد رەسول هاوار دۆزیبوویەوە و لە لەندەن بڵاویکردووەتەوە، لە تێکدانی جمهورییەتی کوردستانیشدا، تورك لە شای ئێران زیاتر دەستی هەبووە، تورك ئەڵێت: ئێمە رازینین لەوێدا جمهورییەتێك بەناوی کوردستانەوە هەبێت، بەوجۆرە تورکی کەمالی دەستێکی زۆریان هەبووە لە ئازاردانی کورددا، لە جینۆسایدی کورددا، لەچی کوردا لەچی کوردا.. ئێستا بارەکە بارێکیکەیە.

بەهەموو حاڵ، شێخ ئەوەی پێیکراوە، کردوویەتی. دوا شتیشی کە هاتە بەغدا و لەوێ کۆچیدواییکرد، پێوەندی زۆری بە زۆر کەسەوە کردووە و زۆر شت هەیە کە بنووسرێ کە من نەمتوانی تەواویبکەم، ئێوە تەواویبکەن.

جا نە حەمدی ساحێبقڕان.. نە ئەحمەد بەگی جاف، ئەحمەد موختار، وشەیەکی خراپیان بە شێخ نەوتووە. ئەمە کاری هونەرمەندێکی بەشەرەفە، کاری شاعیرێکی نیشتمانپەروەری بە شەرەفە. مەدحی شێخیشی هەیە کە ئەو کردوویەتی یەکەم، دوایی بەرەڵایکردووە، لە جاسەنە حەپسبووە لای ماوەیەك، بەڵام هیچی نەوتووە، شتی خراپی نەوتووە.. ئەوە هەستی نیشتمانپەروەرییە لای ئەحمەد بەگ، بەڵام گەورەیی شێخیش دەردەخات.

حەمدی ساحێبقران یەکێك بووە لە وەزیرەکانی شێخ مەحمود..

لەکاتێکا کە شێخ لەسەر حوکم بووە، دەزانین کە لەسەر حوکم بووە کە دەسەڵاتی بووە هەجویکردووە:

جائیزە بۆ قەومی کورد و کوردایەتی بێڕەشبەڵەك
بێقەزابێ باجی رەحمە نایەڵێ رێك هەڵپەڕین

باجی رەحمە چێشتکەری شێخ بووە.. کەچی کاتێك شێخ ئەبەن بۆ هیندستان و ئەیهێننەوە:

یا مەدینە بێ نەبی بێ یا نەجەف بێ بێ عەلی،
شاری غەزنەش ئێستا بێ مەحمود وەك داریکەلی

شێخ مەحمود ئەکات بە عەلی لەنەجەفدا، بە نەبی لەمەدینەدا، بە سوڵتان مەحمودی غەزنەوی لە شاری غەزنەدا.. ئەوەش هەڵوێستی شاعیرێکی بەشەرەفە کاتێك کە لەسەر حوکما بووە هەجویکردووە.

من مامێکم بوو، شتی زۆری لەبیربوو، دۆستی حەمدیش بوو. وتی لە بەغدا مەلا مەحمود لەگەڵ حەمدیدا چوونە خزمەتی شێخ، تاقمێکی عەرەب لەوێبوون، تەقدیمیکردین وتی: ئەمە نەوەی ساحێبقڕانە، شاعیرێکی گەورەیە، وەزیر بوو لە حکومەتەکەی مندا، بەڵام هەجوی منی کردووە. وتی، حەمدی وتی: قوربان من حەدی ئەوەم نییە، هەجوتبکەم، من تەنقیدمکردووە. وتی: دەستتخۆشبێت.. جا هەڵوێستی ئەم شاعیر و کەسانە بەرامبەر بە شێخ ئەوەیە، شێخیش کە

هاتەوە، چلویەك کە باسکرا کە هاتووەتەوە جا لای خانەقینەوە هاتووەتەوە، لای کفرییەوە هاتووەتەوە و کێ هێناویەتییەوە (قسە زۆرە لەسەر ئەوانە) کە هاتەوە نەهاتە سلێمانی و دانیشێ و خەریکی شتێك بێت، چووە ئەودێیە، چووە داریکەلی، تەنیا ئەوەی من بزانم دووجار سلێمانی دیوە لەوماوەیەدا، جارێك عەبدولئیلاه، وەسی بە زۆر هێنای (ئیتر چووبووە داریکەلی هێنابووی یان لە تاسلوجەوە لەوێوە هێنابووی) وەسی هات عەبدولئیلاه کە مەلیك هێشتا نەهاتبووەسەر کار، هێنای لەگەڵ خۆیا بۆ سلێمانی کە هات بۆ سلێمانی ئێمە با بڵێم منداڵ یان مێردمناڵ بووین نازانم چی ئەڵێن.. بیرمە خەڵکی شاری سلێمانی هەموو هاواریانئەکرد: وەرن ئەمەیان مەلیکەکەی خۆمانە. ئۆتۆمبیلەکەیان هەڵگرت بە هەڵگرتن، ئەویش یەکەم شوێن پێش ئەوەی دوای وەسی بکەوێ و بچێتە موتەسەڕیفییەت چووە مزگەوتی گەورە بۆ زیارەتی کاك ئەحمەد.. ئەوەم بیرە، ئەوکاتە لەو تەمەنەدا لە ناوەندی بووم دوایکەوتین.. لەحەوشەکەدا کاك حەمەی ئەحمەدی تەها یەعنی کامەران موکری شاعیر، چووە بەردەمی ئەوەی خوێندەوە:

شەرتە شەرتی پیاوەتی بێ گەر خوا دەستم بدا
دووژمنت پەتکەم وەکو سەگ بیخەمە ژێر پێتەوە

شێخ گرتی و ماچیکرد، چوو زیارەتیکرد و فاتیحای خوێند و پاش ئەوە ئیتر جارێکیتریش لە موناسەبەتێکیتردا هاتووەتەوە سلێمانی

و گەلێك شوێن گەڕا ئەوەی بیرمە شوێنی ئەوکاتە هاتە مزگەوتەکەی ئێمەش و شوێنانی سلێمانی گەڕاوە.. ئەوەندە هاتووەتە سلێمانی.

جەنازەکەیشی ئەزانن، بەو حاڵەوە تەقەیانلێکرد کە شتیان لەوانەی بە دیاریەوەبوون باوکم ئەیگێڕایەوە، وتی: کە رووتیانکردەوە بۆ ئەوەی بیشۆین، ژماردبووی ١٤ گوللە بە لەشیەوە بووە، چونکە جەنازەکەیان دایە بەر گوللە، خەڵك بردیان بۆ بەندیخانە بۆئەوەی شێخ لەتیف بیبینیّ، باوکم ئەیوت: ئینگلیز نەیتوانی بە زیندوویی خوێن لە لاشەی دەربهێنیّ، چونکە کە گوللەش چووبووە ناو لەشیەوە خوێن نەهاتبووە دەرەوە، بەڵام بەمردوویی توانی خوێن لە لەشی بێنێتەدەریّ، ئەیوت: ئەمە کەراماتە، کەراماتی ئەولیای خوایە، چونکە شێخ زۆر بە موتەدەین ناسرابوو.

شت زۆرە دەربارەی شێخ مەحمودەوە بگێڕدرێتەوە، بەڵام دیسانەوە یەکێکە لەو سیّ چوار رەمزەی کە کورد هەیەتی و تائێستا ئەوەتا وەکو وتم ئێمە شانازی ئەکەین و ئەڵێین مەلیکی کوردستان، چونکە ئەو کوردستانەی کە وتم بەڕێوەیە و دروستدەبێت.. ئیتر چەندیکە، چەند ساڵیکە، ئەوەیان شتێکیترە، بەڵام دروستدەبیّ و بڕاوەتەوە کە دروستدەبێت، چونکە ئینگلیزیش لەوە پەشیمانبووەتەوە کە کوردستانیان دابەشکرد، ئەمەریکاش رەنگە لەوە پەشیمانبن چووزانن لەجەیشدا دەستەیەك هەیە پێیاندەڵێن شەیتانی ئەکبەر، هەموویان،

کەسیان قازانجیان لەوە نەکرد لەوەی کە کوردستانیان دابەشکرد و نەیانهێشت کورد دەوڵەتی هەبێت.. ئێستاش شت هەیە، قسە زۆرە کە نەیکەین کە کورد بووە بە دەوڵەت، ئەشبێ بە دەوڵەت چونکە کورد خۆی کۆڵینەداوە.. یەکەم شتی گەورەشمان من وائەزانم ئەوە چەند جارێکە لەچەند نەدوەیەکدا مانگێ لەمەوپێش لە ئامەد لە دیاربەکر، ئەو دیاربەکرە ئێستا ئەچیت.. من چووم بۆ نەدوەیەك، ئەتوت لە هەولێرم، هەولێر ئەڵێم سلێمانی ناڵێم، چونکە لە هەولێر زمانی تێکەڵ هەیە، شتێك عەرەبی هەیە، تورکمانی هەیە، کورد هەن بە تورکمانی قسەدەکەن، ئاغاکانی بەڵاّم کرمانج بە کوردی قسەئەکەن، وەك لە هەولێر بی دیاربەکر بەو ئازادییە قسەدەکرا و باسدەکرا لە کۆنگرەی نەتەوەییشدا پێش مانگێ لە برۆکسل.. وتم، پێویستمان بەو دوو دێڕە هەیە کە خانی ئەیڵێ ئێمە هەر پێویستمان بەوە هەیە:

| | |
|---|---|
| گەر دی هەبوا مە ئیتفاقێك | ڤێکرا بکرا مە ئینقیادێك |
| رۆم و عەرەب و عەجەم تەمامی | هەمییان ژ مەرا دکر غولاّمی |

ئەگەر ئێمە ئیتیفاقێکمان هەبوایە، پێکەوە جارێك هەڵسابنایە، نەك بەدرخان هەڵسێ و نەمێنێ، پاش ئەو یەزدانشێری ئامۆزای دەستپێبکات، تا ئەو خەریکبوو، یەزدانشێر لەگەڵیدا نەبوو کە ئەو رۆیی ئەنجا ئەم شۆڕشدەکات.. پێکەوە هەڵسابنایە:

ڕۆم و عەرەب و عەجەم تەمامی
هەمییان ژ مەرا دکر غولامی

من بەوە کۆتاییم بەو دوو موحازەرەیە هێنا.

بەڵام لێمببوورن دوو وشەش دەربارەی کفری بڵێم، چونکە بەڕاستی شانازییەکی گەورەیە کە لە شاری کفریدا ئەم سیمینارە ئەگێڕدرێ، کفریش مێژووەکەی ئەوە برادەران و برادەری پێش من باسیانکرد و خەڵکی کفری باشتری ئەزانن، بەڵام قەزایەك، قەزایەکی عێراقی ناوبنرێ: شاری وەزیران، ئەزانن ناوەکان ئەڵێم هەر لە عومەر نەزمییەوە کە بە ئەسڵ خەڵکی وانە، عومەر نەزمی وەنداوین، وەنداوی لە (وان)ەوە هاتوون، لە ئەڵوەندەوە نەهاتووە، کەسێکی گەورەشیان تیاداهەڵکەوتووە، وەك عەبدولمەجید وەنداوی نووسەری گەورە و ڕۆژنامەنووسی پێشکەوتووخوازی گەورە، بەڵام لە ماڵی عومەر نەزمیدا چەند وەزیر، عومەر نەزمی خۆی، جەمال، ئەنجا سەیرە کوڕی عومەر نەزمی.. حیکایەتێکی درێژتر هەیە، وەختی نییە بیگێڕمەوە، مامۆستا ڕەفیق حیلمی گێڕایەوە باوەڕینەدەکرد کە کوڕی عومەر نەزمی پاش شۆڕشی تەمووز ویستبووی مامۆستا ڕەفیق حیلمی ببینێ، وتی من وامزانی باوکی شتێکی بەسەرا دێت من شتێکی بۆ بکەم، دوایی بۆم دەرکەوت خوا بتانگرێ دوو کوڕی گەورەی عومەر نەزمی شیوعین.. ئەوە یەکێکیان ئەندامی لیژنەی مەرکەزیشە، کەمالیان فیعلەن لە

مەحکەمەی شەعب بوو لە ئیدیعای عام بوو و ئەندامی لیژنەی مەرکەزیش بوو، ئەو وەختە کوڕی عومەر نەزمی بەوجۆرە.

ئەوانیتر، بابانەکان، هیی ئێرە، خێڵی مەجید بەگی بابان، بە محەممەدیشەوە، مەحمود، ئەحمەد موختاریش پەیوەندی هەبوو، تا لەودەورەشدا ماڵی موبارەك سێ بنەبابن، یان سێ ئامۆزان. خێڵی مەدحەت موبارەك کوردن، کوردبوون و کوردایەتیانکردووە. حەتتا ئەو کەریم موبارەکەی لەگەڵ شێخدا یەك نەبووە بەلای ئەواندا و شتێك بووە، کوڕەکەی، مەحمود (ئەو برادەرانەی لە ١٩٧٠-١٩٧٤ لە دەرەوە بوون) دەزانن مەحمود قایمقام بوو، رایکرد، چووە ناو شۆڕشەوە، خێڵی ماڵی موبارەك هەیانە خۆیان بە تورکمان ئەزانن، بەڵام ئەوانیش کوردن و وەزیریان تیاهەڵکەوتووە. موکەڕەم تاڵەبانیش هەروەها کە خەڵکی زەرداوە، بیست دەقیقەیەك لێرەوە دوورە.

بەوجۆرە ئەو قەزا بچووکە ئەوەندەی وەزیر تیاداهەڵکەوێ، وەزیریش ئەو وەختەیش وائەزانم ئەگەر کەسێك توانایەکی نەبوایە نەئەبوو بە وەزیر، ئەوە نییە لەسەر حیسابی خزمایەتی، کەواتە قەزایەکی گەورەیە و گەلێ شت.

بێجگەلەوەی باسی شەڵتاغ کرا، خەڵکەکەی باسی ئەکەن مەسەلەی هونەر، مەقام، بەڵام ئەم دواکەوتنەی ئێستا هیواموایە دەستمان هەبێ نەیهێڵین، بەڵام هەر بەخۆڕایی نا، هەروا چەند خانوویەك

بکەین بە مۆزەخانە، ئێستا هۆڵ بۆ ژیان و بۆ پێشکەوتن زۆرە، ئێستا کوردستان ئەبێت لەلایەکەوە کشتوکاڵ زیندووبکەینەوە کە بەداخەوە نەماوە و خەتای خۆشمانی تیایە، هەر ئەوە نییە ساڵێك بێ ئاوی بوو، هەر ساڵێك بێ ئاوی بوو، کوردستان بکەین بە وڵاتێکی پیشەسازی، گەلێ پیشە و سەنعات هەیە پێوەندی بە کشتوکاڵەوە هەیە، ئەتوانین لەکفریدا دەزگای سەناعی گەورەی وا بکەینەوە، ئەوە شارەزاکان ئەیزانن کە جێی هەبێت و بۆ گەشتوگوزاریش وا بێت کە خەڵك رابکێشین، نەك بەزۆر خەڵك بهێنین.

کفری شانازییە کە ئەمڕۆ لەوشارەدا کە ئەڵێم شتیتریشم زۆرە لەسەر کفری بیڵێم و لەسەر شێخیش، خۆ رەنگە ماوەیترمان بێ لەشوێنیتردا، کۆمەڵێك شتیتر بڵێم، بەڵام دیسانەوە ئەوەندە ئەڵێم کە برادەران کارێکی چاك و گەورەیان کرد و کارێکی چاکیان کرد ئەو دوو ناوە گەورەیەیان پێکەوەبەست کە شێخی نەمرە، مەلیکی کوردستانە، کەچی ئەو هەموو شاعیرە ئەو هەموو رۆماننووسە پیاوی وەکو یەشار کەمال، پیاوی وەکو **محەممەد** ئوزون، شت زۆرە لەوێ کە هەندێکیان بە کوردی، بەڵام بە تورکیش نووسیبێتیان وەکو کوردییەکە وایە، ئەو هەمووەی تیاهەڵکەوتووە.. نەیانتوانی زمانەکە لەناوبەرن، زمانەکە هۆیەکی گەورەی مانی ئێمەیە، ئەبێ بیپارێزین، پێشیخەین، لەهەجات نزیکخەینەوە لەیەك بەشێوەیەکی عیلمی بەشێوەی هەرەمەکی نا.

زۆر سوپاسی ئەو لیژنەی ئامادەکردنی ئەم کۆنفرانسە ئەکەم و سوپاسی برای شیرینم مامۆستا عەلی عەبدوڵڵا ئەکەم، چ بۆ رۆڵی لە ئامادەکردنی ئەم سیمینارەدا و چ بۆ بانگکردنم. منیش شانازییە کە بەڕاستی بە قسەی دکتۆر بوایە ئەبوایە نەهاتمایە، بەڵام هاتم و هیواموایە (وەك کوڕە مەلایەك) ئەمە ببێ بەهۆی ساغبوونەوە و شیفا لێرەدا با وابێ.

خۆشبێ، نەمربێ، هەر نەمرە یادی شێخی نەمر، هەر نەمربێ شاری کفری و بەرەوپێش بڕوا و دروستیبکەینەوە کە جاران زۆر شتی تیابوو.. قیتاری تیابوو وەك باسکرا، کوردیش وەك وتم دوا شت لێمگەڕێن دەیڵێمەوە:

گەر دی هەبـــــوا مە ئیتفاقێك
ڤێکڕا بکـــــرا مە ئینقیادێك
رۆم و عەرەب و عەجەم تەمامی
هەمییان ژ مەرا دکر غولامی

بژی کورد، بژی کوردستان.

•••




# چەند سەرنجێك سەبارەت بە
# جووڵانەوەی شێخ مەحمودی حەفید

## سدیق ساڵح

سوپاسی لیژنەی ئامادەکار دەکەم کە منی بۆ بەشداری لەم یادەدا خوێندووەتەوە. داوایلێبوردن دەکەم کە لەبەر سەرقاڵی نەپەرژام و پێڕانەگەیشتم خۆ ئامادەبکەم. ئەوەی وا پێشکەشیدەکەم هێندێ سەرنجە لەو سەدان بەڵگەنامە کوردی و بیانیانەی کە تائێستا دیومن، هەڵمهێنجاون. هیوایە جێی ڕەزامەندی بێ.

١) سلێمانی، لە دوادواییەکانی حوکمی عوسمانیدا جموجوولێکی نەتەوەیی و سیاسیی تێکەوتبوو. مێجەر نۆئێل کە لە ١٩١٨/١١/١٦دا بە نوێنەرایەتیی حاکمی گشتیی بریتانیا لە بەغدا گەیشتە ئەوێ، هەمانرۆژ راپۆرتێکی لێداوە و نووسیویە: جووڵانەوەیەکی بەجۆشی نەتەوەیی لەم ناوچەیە هەیە، دەکرێ پشتیوانی بین و کارێکبکەین ناوچەکانیدیکەیش بگرێتەوە. نۆئێل، وەك لەڕێی بەڵگەنامەکانی ئینگلیزەوە زانراوە، لایەنگری دروستکردنی دەوڵەتی کوردی بووە و بەکردەوە هەوڵیداوە، بەڵام هەوڵەکانی بێئاکام بوون.

ئەوسا سەران و گەورەکانی ئەم ناوچەیە لەناو خۆیاندا رێککەوتوون و حکومەتێکی کاتییان بە سەرۆکایەتیی شێخ مەحمود پێکهێناوە، نوێنەریان بە نامەوە ناردووە بۆ کفری و داوەتی هێزەکانی ئینگلیزیان کردووە بێنە ناوچەکە و پشتیانبگرن بۆ دامەزراندنی حوکمێکی خۆجێیی. دەستنیشانکردنی شێخ مەحمود لەلایەن کاربەدەستانی ئینگلیزەوە هەر لەخۆوە و بێمەلامەت نەبووە، لەکاتێکدا سەرانیدیکەی وەك (مەحمود پاشا جاف، سەیید ئەحمەدی خانەقا، بابەکر ئاغای پشدەری، میرانی قادر بەگی خۆشناو.. هتد) یش هەبوون. شێخ، لە بنەماڵەیەکی ناسراو و بەناوبانگی دینی بوو، پێگە و دەسەڵاتی دنیایی و دینیی بنەماڵەکە لە (شێخ مارفی نۆدێ)وە گواستراوەتەوە تا گەیشتووە بە شێخ سەعیدی حەفید و دواجار شێخ مەحمود. ئەم

دەسترۆییە لە رۆژگاری حوکمی بابانەوە تا ئەو دەورانە درێژەی هەبووە. شێخ، خولیای دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردیی هەبووە، خۆی سەرۆکی بێ، وەك مێجەر سۆن دیاریکردووە، هەموو کوردستانی جنووبی و بەشێکی رۆژهەلات بگرێتەوە و بگاتە وان لە باکوور.

٢) ئەو سەردەمە دووجۆرە تێڕوانین - بەگشتی- بۆ چارەسەری کێشەی کورد و دوارۆژی کوردستان هەبووە: بۆچوونێك باوەڕی بەوە هەبووە کە ئینگلیز هیچ بەرنامەیەکی بۆ دامەزراندنی دەوڵەتی کوردی و بەدیهێنانی مافەکانی کورد پێنییە، لەبەرئەوە پێیباشتر بووە کورد دەستبداتە چەك و لە ئینگلیز راپەڕێ. شێخ مەحمود خۆی رێبەرایەتیی ئەم باڵەی کردووە، هێندێ ئەفسەر و مونەووەریش پشتگر و هاوکاریبوون. ئەگەرچی شێخ لە سێ ماوەی جیای نێوان (١٩١٨-١٩٢٤)دا ئیدارەیەکی خۆجێیی بەناوی (حکومەتی کوردستان)ەوە لە ناوچەی سلێمانی دامەزراند، بەڵام لە ١٩٢٤ بەدواوە ئەو دەسەڵاتەی بە داگیرکرانی سلێمانی لەلایەن هێزەکانی ئینگلیز و عیراقەوە هەڵوەشایەوە و جووڵانەوەکەی کەوتە دەرەوەی شار و بەرەبەرە کزبوو، تا لە ١٩٢٧دا ناچاربوو لە چوارچێوەی رێککەوتنێکدا لە دیوی کوردستانی ئێران دابنیشێ. ئەمە درێژەی کێشا تا ١٩٣٠ کە شەڕی بەردەرکی سەرای تێداقەوما، ئەویش هاتەوە ئەمدیو و جووڵانەوەکەیی دەستپێکردەوە، بە شەڕی (ئاوباریك)یش کۆتاییپێهات.

دووەم بۆچوون توێژێکی مونەووەران و تێگەیشتوانی سەردەمەکە کاریان لەسەردەکرد. ئەوانە باوەڕیان وابوو کە کورد ئەو قۆناغە ناتوانێ قورساییی خەباتی چەکدار بخاتەسەرشانی خۆی، لەبەرئەوەی تازە لە دۆزەخی یەکەم جەنگی جیهانی هاتووەتەدەرێ، زۆری لاوەکانی یا بوونەتە پێخۆری شەڕ، یان دیل و دەربەدەرکراون، وڵاتەکەیش لە هەژاری و برسێتییەکی کوشندەدا دەژی. نۆئێل کە یەکەمجار هاتە سلێمانی، لەراپۆرتێکیدا نووسیویە: لاشەی مردوو لە لاکۆلانان و سەرجادان کەوتووە! جگەلەوە، نەخوێندەواری و نەزانی باڵی رەشیان بەسەر خەڵکدا کێشابوو. بۆیە ئەو قەناعەتەیان هەبوو کە خەڵکێکی وا لەرووی جەستەیی و عەقڵییەوە بێ داروبار و نائامادە هەرگیز لەباریدا نییە لەرێی چەکەوە مافەکانی خۆی بەدیبێنێ، گونجاوتر وایە ئەمری واقیعی نائامادەگیی کورد رەچاوبکرێ و هەوڵبدرێ ژێرخانی ئابووریی کوردستان ببووژێندرێتەوە و خوێندەواری بڵاوبکرێتەوە و خەڵك تێروپڕ و پۆشتەبکرێ و بەهۆشبهێنرێتەوە، ئەوسا بیر لە بەرنامەی داهاتوو بکرێتەوە. ئەوانە راست پێیانوابوو کورد ئەو هێز و قورساییەی نییە بتوانێ بە یەك کەرەت و بەتەواوی بە مەرامی خۆی بگا، بەڵکو دەبێ هەنگاوبەهەنگاو و بەرەبەرە بەرەوپێش بچێ و لەهەر قۆناغێکدا بەشێکی مافەکانی خۆی وەربگرێ. ئەوانە دواتر بوونە کاربەدەستی حوکمی پاشایەتیی عیراق، ئەوەندەی پێیانکرا هەوڵی بووژاندنەوەی

کوردستانیان دا، بە کردنەوەی قوتابخانە و خەستەخانە و ڕێگەوبان و پێگەیاندنی مامۆستایان و فەرمانبەری دەوڵەتی بۆ ڕاییکردنی هەموو کاروبارێکی حکومەتی و چارەسەری کێشە ئابوورییەکان.

ئەم ڕەوتەی دوایی بە دوو ئاڕاستەی هاوشان کەوتەخۆ) کەڵکی لەو کەمە دەرفەتەی ساڵانی بیست بینی و لەسایەیدا خەباتێکی ئاشتیخوازیی شارستانییانەی دەستپێکرد) بەبارێکدا چالاکیی ڕۆشنبیریی زیادیکرد و (جەمعییەتی زانستی کوردان)ی دامەزراند بۆ بڵاوکردنەوەی خوێندەواری و هۆشیاریی کۆمەڵایەتی و سیاسی و رووپەڕی ڕۆژنامەی (ژیان)ی بەکارهێنا بۆ روونکردنەوە و پێداگرتن لەسەر ماف و داواکانی کورد، تا کار بەوەگەیشت (هەیئەی وەتەنییە)ی پێکهێنا بۆ سەرپەرشتی و ڕێکخستنی خۆپیشاندان و نارەزایەتی و جموجووڵی تەلگراف و نامە و مەزبەتە ناردن بۆ کاربەدەستانی ئینگلیز و عیراق، بەڵام ئەو کاربەدەستانە هیچیان بەپیر ئەم دەنگە ئاشتیانەیەوە نەهاتن و داواکانیان نەسەلماند، ڕۆژی ٦ی ئەیلوولی ١٩٣٠ بە ئاگر و ئاسن رووبەڕووی خۆپیشاندەران بوونەوە و لێیانکوشتن و بریندارکردن و گرتن. پێموایە ئەمە خاڵی وەرچەرخانی مێژووی نوێی کورد بوو، ئەگەر بهاتایە حکومەت گوێی لە داوای خۆپیشاندران بگرتایە و لانیکەمی ئەو مافانەی بسەلماندایە، زۆر ڕێی تێدەچوو ڕەوتی ڕووداوەکان لە کوردستانی عیراقدا بە بارێکی باشتردا بکەوتایەتەوە و ئەو مێژووە

خوێناوییەی ئەوەبەدوای بەشوێن خۆیدا نەهێنایە.

پێبەپێی ئەوە، ئاراستەیەکیدیکەی خەباتی نهێنی دەستیپێکرد، چونکە بەپێی پێنجەم خاڵی چوارەم ماددەی (قانونی جەمعییات)ی پەسندکراوی ١٩٢٢/٧/٢ی حکومەتی عیراق کە بە درێژایی حوکمی پاشایەتی کارییێکرا، کورد بۆی نەبوو حیزبی نەتەوەیی لە عیراقدا دابمەزرێنێ، بۆیە ئەو رێیەی خەبات گیرایەبەر و رێکخراوی لە وێنەی (جەمعییەتی زەردەشتی، لقی جەمعییەتی خۆیبوون، کۆمەڵی سەربەخۆییی کوردستان، کۆمەڵی پشتیوانی کوردان.. ) پێکهێنرا و ژێربەژێر کەوتنە تێکۆشان.

بیرماننەچێ عیراق بۆ خۆی دەوڵەتێکی دەستکردبوو، هێشتا پایەکانی حکومەتی بەتەواوی نەچەسپیبوو. ئەم دەوڵەتە هەر لەسەرەتاوە گیرۆدەی کێشەیەکی بنیادی خۆی بوو، چونکە وا دامەزرێندرا کە کەمینەیەکی عەرەبی سوننە حوکمی زۆرینەیەکی عەرەبی شیعە و کەمینەیەکی کوردی سوننە بکا کە دیارە لە هیچ حاڵوبارێکدا ناتوانێ عادیلانە حوکمبکا. تەنانەت مەلیك فەیسەڵی یەکەم کە پیاوێکی ژیری دووربین بووە، لە بەشێکی بیروەوەرییەکانیدا وتوویە: کراومەتە پاشای وڵاتێك لە چەند نەتەوەیەکی جیاوازی وەك کورد، عەرەب، تورکمان، ئاسووری و وردە میللەتیدیکە و دین و مەزەبی جیاوازی وەك موسڵمانی شیعە و سوننە و مەسیحی و وردە

دینیدیکە پێکهاتووە. ئەمانە شتێکی هاوبەش پێکەوە کۆیانناکاتەوە. دوو توخمی هەرە گرنگی دژ بەم دەوڵەتە شیعە و کوردە، بۆیە دەبێ حکومەت هێزی گەورەی عەسکەریی هەبێ بۆ سەرکوتکردنی هەر هەستانێکی چاوەڕوانکراوی ئەوانە، تا بتوانێ بە زەبری هێز کۆتایی بە مەترسییان بهێنێ. ئەم قسانە بۆ خۆیان بەڵگەی ئەوەن کە ئەم دەوڵەتە ناڕەوا و دوور لە ئیرادەی خەڵکەکەی دروستبوو و هەر لە هەوەڵەوە تۆوی ناکۆکی و کێشەی دواتری لەگەڵ خۆیدا هەڵگرتبوو.

٢) بەڵگەنامەکانی ئینگلیز خۆیان نیشاندەری ئەو راستییەن کە ئینگلیز لەو نائامادەگییە تەواوەی کورددا بەرنامەی دروستکردنی دەوڵەتی کوردیی نەبووە. ئەو تۆمەتەیش کە جاروبار لێرەولەوێ بە ناهەق دەدرێتە پاڵ شێخ مەحمود، گوایە هەلومەرجەکەی شێواندووە و بە سیاسەتێکی هەڵە و چەوت رێی لە هاتنەکایەی ئەو دەوڵەتە گرتووە، ناڕەوایە و راست نییە، چونکە - هەر هیچ نەبێ- ئەگەر بەرنامەیەکی وەها هەبوایە، بەتایبەت پاش شکستی جووڵانەوەکەی شێخ لە ١٩٢٧دا، دەرفەتی ئەوە هەبوو ئەو بەرنامەیە لەڕێی سەرانی باڵی ئاشتیخوازی جووڵانەوەی کوردەوە کە خەباتێکی شارستانییان دەستپێکردبوو، جێبەجێ ببێ.

دوو سەرچاوەی زۆر گرنگ کە پشتبەستوو بە بەڵگەنامەی ئەرشیفەکانی بریتانیا خۆی ئەم لایەنەیان بە دروستی ساغکردووەتەوە،

بریتینلە:

١) تێزی دکتۆرای دکتۆر سەعد بەشیر ئەسکەندەر (من التخطيط الى التجزئة، سياسة بريطانيا العظمى تجاه مستقبل كردستان ١٩١٤-١٩٢٣، مؤسسة ژين، ٢٠٠٧، ٣٨٦ص).

٢) دەیڤید کۆرن، پێرسی کۆکس و ئارنۆڵد تی. وێڵسن ئەو دوو پیاوەی کوردیان لکاند بە عێراقەوە، چاپەمەنیی خاك، ٢٠٠٧، ٧٩ل).

ئەم دوو سەرچاوەیە ئاشکرا روونیانکردووەتەوە کە سەرانی ئینگلیز لە عیراقدا لە مەیدانی راستەقینەی رووداوەکاندا بوون، نەخشی بەرچاویان لە دارشتنی سیاسەتی وڵاتەکەیاندا دەرهەق بە دوارۆژی کورد هەبوو و پاش کۆشش و پێداگرتنێکی لێبڕاوانە توانیویانە قەناعەت بە حکومەتەکەیان بهێنن کە ویلایەتی موسڵ (کوردستانی جنووبی) بلکێندرێ بە عیراقەوە، ئەوان ئەو ناوچەیەیان بۆ جەستەی بێسەری عیراق بە سەری مرۆڤ شوبهاندبوو! چونکە سەرچاوەیەکی گرنگی ئابووری بوو بۆ دابینکردنی دانەوێڵە و بەروبوویدیکەی کشتوکاڵی و نەوتێکی زۆر.

٣) شێخ مەحمود، لە وردکردنەوە و هەڵسەنگاندنی گشتیدا، بەدڵنیاییەوە مرۆیەکی دڵسۆزی کورد و کوردستان بووە. خۆی، بە

حوکمی ڕێبەرایەتیی تەریقەتی قادری و دەستڕۆیی بنەماڵەکەی لە سەردەمی بابان و عوسمانییەوە، دەوڵەمەند بووە. کاربەدەستانی ئینگلیز ئامادەبوون هەموو ئیمتیاز و دەسکەوتێکی بۆ مسۆگەربکەن، بەمەرجێك بێدەنگ دابنیشێ و بەرنامەکەی ئەوان نەشێوێنێ، بەڵام ئەو رووخانی دەوڵەتی عوسمانیی بەهەل زانیوە، تا بە پشتیواتیی هاوپەیمانان هەوڵ بۆ دروستکردنی دەوڵەتی کوردی بدا، بەتایبەت کە بەندەکانی سەرۆك ویلسن و راگەیاندراوی ئینگلیزی - فەرەنسەییش لەئارادا بوون بۆ پشتگرتنی گەلانی ژێردەستی عوسمانی تا ببنە خاوەنی دەوڵەتی خۆیان، بەڵام دیارە هۆیەکانی خۆیی و بابەتی لەو قۆناغەدا بە قازانجی سەرکەوتنی مەسەلەی کورد نەبوون، بۆیە ئەو هەلە لەدەست کورد چووە.

٤) شێخ مەحمود خۆی بەدرێژاییی ئەو ساڵانە قوربانییەکی زۆری داوە، بەوەی وا ساڵانێکی تەمەنیی لە ئاوارەیی و دەستبەسەری و دوورخراوەییدا بەسەربردووە. کەموزۆر شازدە ساڵ دوورخراوە بووە“ سێ ساڵ لە هیندستان (١٩١٩-١٩٢٢)، سێ ساڵ لە دیوی کوردستانی ئێران (١٩٢٧-١٩٣٠)، دە ساڵیش لە باشوور و ناوەڕاستی عیراق (١٩٣١-١٩٤١). لە ١٩٤١یشەوە کە لە بەغدا هەڵات و هەوڵێکیدیکەی سەرنەگرتووی دا، ناچارکرا تا کۆچی دوایی لە ١٩٥٦دا لە دێی (داریکەلی) دابنیشێ، لەکاتێکدا ئەو کوڕی شار و پەروەردەی

ناو ئاوەدانیی شار بوو. واتە ئەم پیاوە ٣١ ساڵ ئاوارەیی و دەستبەسەری و دوورخراوەییی بەسەربرد.

٥) شێخ - وەك وترا- لە بنەماڵەیەکی دینیی دەوڵەمەند بوو، پشتاوپشت موڵکێکی زۆری بە میرات بۆ مابووەوە" داهاتی ئەو موڵکانەی بەگشتی خستە خزمەتی جووڵانەوەکەی خۆی و پێویستییەکانی پێدابیندەکرد. هەر لەبەر ئەوەیش یەکێك لەو ڕێیانە کە حکومەتی عیراق بۆ کزکردن و لەناوبردنی جووڵانەوەکەی گرتیەبەر، زەوتکردنی ئەو موڵکانە بوو کە کێشەی قانوونیی بۆ نانەوە و خستنیەبەر دادگا. ئەوەبوو ئەنجومەنی وەزیران لە ١٩٢٦/٣/٢دا بڕیاری زەوتکردنی موڵکەکانیی دا. بەڵگەنامەی زۆریش هەن سەبارەت بەشێوەکانی زەوتکردن و مایەپووچکردنی داهات و موڵکەکانی شێخ، هەر لە سووتاندنەوە بگرە تا تەپکە و مین تێدانانەوە بۆ لەناوبردنی بەروبووی ئەو موڵکانە، تەنانەت ڕێنمایی دراوە بە هێزەکانی ئینگلیز و عیراق کە باکی لەناوبردنی ئەو بەروبووەیان نەبێ، چونکە بە سۆنگەی درێژەکێشانی جووڵانەوەکەی زانراوە.

٦) شێخ، وەك لە زۆری نامەکانیدا دەرکەوتووە، تاسەر بەهیچ کلۆجێك ددانی بە حکومەتی عیراق دا نەناوە و وەك حکومەتێکی عەرەبیی بێگانە ناویهێناوە و بۆ کاربەدەستانی ئینگلیزی

روونکردووەتەوە کە ئەو هیچ ناکۆکی و کێشەیەکی لەگەڵ ئەواندا نییە، بەڵام دواجار رازی نییە بچێتەژێر سایەی ئەو دەوڵەتە عەرەبییە، تەنانەت تا دوا رۆژەکانی ژیانیشی، هەر هیوای بە بریتانیا هەبووە مافەکانی کورد بسەلمێنێ.

٧) هۆیەکی دیاری تێشکانی جووڵانەوەکەی شێخ مەحمود، هەر بەپێی بەڵگەنامەکانی ئینگلیز خۆی، نابەرانبەریی هێزی نێوان جووڵانەوەکە و حکومەتی عێراق بووە، بەتایبەت کە فڕۆکەکانی ئینگلیز دەورێکی هەرە سەرەکییان لە چۆکپێدادانی شێخدا هەبووە. دکتۆر کەمال مەزهەریش لە لێکۆڵینەوەیەکی گرنگیدا ئاماژەی بەم راستییە کردووە. کوردستان ئەو ماوەیە بووبووە مەیدانی مەشقی فڕۆکەکانی ئینگلیز و فڕۆکەوانەکان ئەزموون و تاقیکردنەوەیەکی گرانبەهایان تێدابەدەستهێناوە. ئەو فڕۆکانە بۆردومانی ناوچە جیاجیاکانیان کردووە و زیانی قورسی ماددی و گیانییان پێگەیاندوون. بۆ یەکەمینجاریش لەمێژوودا بۆمبای ٢٢٠ پاوەندی (نزیکەی ١١٠ کلگم) لە کوردستان تاقیکراوەتەوە و بۆیشیان دەرکەوتووە دەنگ و گرمە و ناڵەی فڕۆکە بۆ ترساندن یەکجار کاریگەرە.

لەپاڵ ئەوەدا، بە هەزاران بەیاننامەی هەڕەشە و تۆقاندن هەر لەرێی ئەو فڕۆکانەوە لە ناوچەکانی کوردستاندا بەردراونەتەوە، ئەوەیش وەك ئامرازێکی جەنگی دەروونی بۆ ترساندنی خەڵك بەکارهێنراوە و

دەوری لە کزکردنی جووڵانەوەکەدا هەبووە، چونکە فڕۆکە ژیانی ئاساییی لە خەڵك تاڵکردووە و وای لێکردوون بێزار و وەڕس و نائومێدبن. نەریتێکیدیکە کە فڕۆکەوانیی ئینگلیز لەم وڵاتەدا دایهێناوە، سووتاندنی دێهات و شارۆچکەکانی کوردستان بووە، نموونەگەلێکی زۆریش لەمبارەیەوە هەیە. بگرە کە ئەو گوندانە وێرانکراون، پاشتر دانیشتوانیان غەرامەکراون" یا تفەنگ و فیشەکیان پێکرِدراوە یان پارەیان لێسەندراوە. هەتا لە ساڵی ١٩٣٠دا، کاتێك جووڵانەوەی شێخ سەریهەڵدایەوە، رێنوێنیی تایبەت درایە فڕۆکەکانی بریتانیا و سوپای عیراق کە دەستنەپارێزن و هەر دێیەکیان بویێ، بیسووتێنن. موتەسەڕیفی لیواکانی کوردستانیش رێیانپێدرا هەر دێیەکی پشتیوانی جووڵانەوەکە دەستنیشانبکەن و رەزامەندیی وەزارەتی ناوخۆی بۆ وەربگرن، تا دواتر وەزارەتی بەرگری و هێزی ئاسمانی بە هاوئاهەنگی بۆردومان و وێرانیبکەن.

بۆیە ئەوی بەوردی بە بەڵگەنامەکانی بریتانیا و چالاکیی فڕۆکەکانیدا بچێتەوە، ئەو راستییەی بێپەردە لەبەرچاودا بۆ روونهەبێتەوە کە ئەگەر ئەو فڕۆکانە نەبوونایە، شێخ دەیتوانی - هیچ نەبێ- بەشێکی ئامانجەکانی جووڵانەوەکەی بەدیبهێنێ. ئەم راستییە مایسی ١٩٣١ لە زمانی شێخ مەحمود خۆیەوە سەلمێندرا، وەختێك خۆیی بەدەستەوەدا و ڤیڤیان هۆڵتی سکرتێری رۆژهەڵاتی کۆمیسێری

بەرزی بریتانیا لە بەغدا چووە دێی (بناوەسووتە) بۆ وەرگرتنی، شێخ لەوێ روویکردە فەرماندەی هێزی ئاسمانیی ئینگلیز و پێیوت: ((فڕۆکەکانی ئێوە ئیرادەی میللەتەکەی منیان تێکشکاند!))، دەنا حکومەتی عیراق هیچی بەرامبەر بە من پێنەدەکرا.

کاربەدەستانی ئینگلیز، دوای خۆیان، نەریتی وێرانکردنی دێهات و بۆردومانی کوێرانە و سووتاندنی بەروبووم و حیجزکردنی موڵکوماڵی لایەنگران و بەشدارانی جووڵانەوەی کوردیان بۆ حکومەتی عیراق بەجێهێشت، کە - وەکو زانراوە- بەوپەڕی زەبروزەنگ و توندوتیژییەوە پێڕەوکران.

٨) شێخ پاش مۆرکردنی رێککەوتنی ساڵی ١٩٢٧یش، کە ناچاربوو لە دیوی کوردستانی ئێران بمێنێتەوە، پێوەندی و نامەگۆڕکێی لەگەڵ ناوەوەدا هەر نەپچڕا، بگرە ئەو رێکخراوە نهێنیانەی وا دامەزرێنران، بەردەوام پێوەندییان پێوە هەبوو و بە سەرۆکی فەخریی خۆیان قبووڵکردووە. نموونەی ئەو پێوەندییانەیش لەبەردەستدان، بەتایبەت لەگەڵ جەمعییەتی زەردەشتی و لقی خۆیبوون و کۆمەڵی سەربەخۆییی کوردستاندا.

٩) شێخ مەحمود، هەر لە یەکەم هەستانییەوە، پێوەندیی بە زۆربەی سەرۆکخێڵ و گەورەپیاوانی ناوچە جیاجیاکانی کوردستان، هەر لە سلێمانیەوە تا کەرکووك و هەولێر و ئەولاتریشەوە، کردووە و

نوێنەری بۆ ناردوون، بەڵام کاربەدەستانی ئینگلیز و حکومەتی عیراق ڕێگری بەردەم پەلهاوێشتنی ئەو پێوەندییانە بوون و هەوڵیانداوە جووڵانەوەکەی تەنانەت لە بەشێکی بەرتەسکی ناوچەی سلێمانیشدا قەتیسبکەن.

دواجار ئەگەر بمانەوێ شانازی و سەروەرییەکانی مێژووی جووڵانەوەکەی شێخ مەحمود بەزیندوویی بمێنێتەوە، پێویستوایە کۆششبکرێ بۆ کۆکردنەوەی هەموو پاشماوەیەکی ئەو مێژووە بە وێنە و بەڵگەنامەی خۆماڵی و بیانی و بیرەوەرییەوە. هیوایە هیممەت لەمڕووەوە بنوێنرێ.

•••



## مێژووی جاڕدانی یەکەمین حکومەتی کوردی لە شاری (کفری)

### د. کەیوان ئازاد ئەنوەر

پێشدەست: هەڵسەنگاندنی پێگەی شارێك کە رۆژگارێك مەڵبەند و ناسنامەیەکی گرنگی خاکی کوردستان بەگشتی و بەشی باشووری بەتایبەتی بووە، لە بزووتنەوەیەکی زۆر دیار و مێژوویی وەك (بزووتنەوەکەی شێخ مەحمودی نەمر) کارێکی ئاسان نییە. سەختی کارەکەش لەوەدایە کە لەلایەك لەو شارەوە بڵێسەی ئاگر و پشتیوانییەکی گەورە بۆ بزووتنەوەکە و شۆڕشەکانی ئەو کەسایەتییەی کورد کرا، لەلایەکیدی ئەو شارە بووە یەکەمین مەڵبەندی جاڕدانی

حكومەتی كوردستانی باشوور كە لە (٢١ی ئەیلولی١٩٢٢ز)دا، بۆیە لە هەردوو بارەكەدا چوونەنێو قولاّیی رووداوەكانی ئەو رۆژگارە كارێكی ئاساننەبووە. ئەوەش بەهۆی زۆری رووداوەكان و كەمی بەڵگەنامەی پێویست بووە كە تائێستاش دەستی پسپۆڕ و توێژەرانی مێژووی پێنەگەیشتووە. هەربۆیە بەو واقیع و رابردووەوە ئەوەندەی واقیعی سیاسی ستەمی لەو شارە و هەڵوێستە سیاسییەكانی كردووە كە مێژووییەك بۆی دروستكرد، ئەوندە واقیعە ئابووری و فەرهەنگی و كۆمەلاّیەتییەكان خزمەتیانپێنەكردووە. لەم سۆنگەیەوە و بۆ ئاوڕدانەوە لە هەڵوێستێكی گەورە و مێژوویی ئەو شارە و رۆڵی هۆز و تیرە و دانیشتووانە سەربڵندەكەی تێدا، ئەم لێكۆڵینەوەیە وەك خزمەتێكی مێژوویی پچووك بۆ یادەوەری (٩٠) ساڵەی جاڕدانی حكومەتی كوردستانی باشوور لە شاری (كفری) ئامادەكرا، بە هیوای ئەوەی كەلێنێك لەو پەراوێزخستنەی ئەو شارە پڕبكاتەوە.

(كفری) چۆن چووەنێو ئەو رووداوەوە:

(كفری) یەكێكە لە شارەكانی باشووری كوردستان و مێژووییەكی كۆنی هەیە. ئەو شارە دەكەوێتە بەری باشووری كوردستان و تا كۆتایی سەدەی بیستەم وێستگەی گرنگی رێگای (بەغداد- كەركوك)و (بەغداد - سلێمانی) بوو. ئەمە و هێڵی شەمەندەفەری نێوان (بەغداد-كەركوك) هەر بە نزیك ئەو شارەدا دروستكرا، بۆیە لەڕووی هاتوچۆ و پەیوەندی

شارەکانی (کەرکوک و سلێمانی) بە (بەغداد)ی پایتەختی ئێراقەوە بایەخێکی گەورەی هەبوو.[1] لەڕووی فەلەکیشەوە دەکەوێتە سەر هێڵی درێژی (٤٥,٢٥)ی خۆرهەلاّت و بازنەی پانی (٣٤,٤١)ی باکوور.[2]

سەبارەت بە مێژووی شارەکەش ئەوا بەپێ تۆماری سەرچاوە مێژووییەکان بەر لە سێ هەزارە ساڵ پێشزایین ئەم شارە ئاوەدانبووە،[3] بەلاّم چەندینجار رووبەڕووی شالاّوی داگیرکاری و وێرانکاری چۆڵبوون بووەتەوە، هەربۆیە لەوکاتەوەش تا بەئێستا دەگات، جگەلەو ماوانەی بەهۆی شالاّوی داگیرکاری داگیرکەرانی کوردستان دووچاری سووتان و کاولکاریبووە، شارێکی ئاوەدان و دڵگیربووە. تەنانەت (مێجەرسۆن) وەك ئەفسەرێکی پایەرزی بەریتانی شارەکەی لەنێوان سالاّنی (١٩١٨-١٩٢٢ز) بە شارێکی ئاوەدان و دڵگیر و دڵڕفێن پێناسەکردووە.[4]

لەڕووی کارگێڕیشەوە لەدوای ئەوەی عوسمانییەکان لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەیەمی زایینی بەتەواوی دەستیان بەسەر باشووری کوردستاندا گرت و (ویلایەتی موسڵ)یان لێپێکهێنا، ئەم شارە بەناوی (صلاحیە) وەك سەنجەقێکی ئەو ویلایەتە دیاریکرا و بە شاری (موسڵ) مەڵبەندی ویلایەتەکەوە بەسترایەوە. دواتر ناوی (اسکی کفری) واتە (کفری کۆنی) لێنرا.[5] کاتێکیش ئەو دەوڵەتە بەهۆی رووداوی جەنگی جیهانی یەکەم و شکستی لەو جەنگەدا کۆتایی بە دەسەلاّتی هات، بە دەوڵەتی نوێ ئێراقەوە بەسترایەوە. لەو پێکهاتە نوێیەشدا وەك

مەڵبەندی قەزایەکی سەر بە لیوای کەرکوك ناسرا. دواتر بەبڕیاری حکومەتی ئێراق و لە سەردەمی دەسەڵاتداریێتی بەعسدا لە حەفتاکانی سەدەی رابردوو بۆ سنووری پارێزگای سلێمانی گوازرایەوە. کاتێکیش حکومەتی هەرێمی کوردستان لە (٤ی تەمووزی١٩٩٢ز) دامەزرا، بەهۆی پێکهێنانی پارێزگای کەرکوك کە مەڵبەندەکەی شاری (دەربەندیخان) بوو، بەو پارێزگایەوە گرێدرا. دوای رووخانی رژێمی بەعسیش لە (٩ی نیسانی٢٠٠٣ز)دا و ئازادکردنی شاری کەرکوك و ناوچەکانی دەوروبەری ئەو پارێزگایە بۆ مەڵبەندی سەرەکی شارەکە (کەرکوك) گوازرایەوە. بەمەش بیرۆکەی دامەزراندنی (ئیدارەی گەرمیان) بۆ ئەو ناوچانەی لەنێوان ساڵانی (١٩٩٢-٢٠٠٣ز) سەر بە (پارێزگای کەرکوك)ی حکومەتی هەرێمی کوردستان بوون، هاتەئاراوە. لەم گۆڕانکارییە نوێیەشدا (کفری) بووە مەڵبەندێکی قەزای سەر بەو ئیدارەییە.

دەرکەوتنی پێگەی کفری لە سەرەتای مێژووی هاوچەرخدا کە تەوەری باسەکەمانە بۆ رووداوێکی گەورە و گرنگ دەگەڕێتەوە کە (جەنگی جیهانی یەکەم)ە. ئەو جەنگەی حکومەتی بەریتانیای لەوپەڕی باکووری خۆرئاوای کیشوەری ئەوروپاوە هێنایە خۆرهەڵاتی ناوەڕاست و باشووری کوردستان و شاری کفری. بەوەش زەمینەی ململانێ و رووداوێکی نوێ رەخسا، بۆیە بێگەڕانەوە بۆ ئەو جەنگە و

دەرئەنجامەکانی ناتوانین لەو راستییە بگەین کە چۆن ئەو شارە بووە یەکەمین ویستگەی ئەو رووداوە مێژووییە.

(جەنگی جیهانی یەکەم) یەکێك بوو لە دژوارترین جەنگەکان دووچاری دانیشتوانی سەر رووی زەوی هات. جەنگێك گەورە بە کارەسات و بەرفراوان بە بەشداربووانی و مەترسیدار بە دەرئەنجامەکانی کە بۆ یەکەمینجار لەمێژوودا بەو گەورەیی و فراوانییەوە روویدا، بۆیە ناوی جەنگی جیهانی یەکەمی لێنرا. ماوەی جـــــــەنگەش چوار ساڵ (١٩١٤-١٩١٨ز) بوو کە لەنێوان دوو کۆمەڵە زلهێزدا روویدا:

١. دەوڵەتانی ناوەند: پێکهاتبوون لە زلهێزەکانی (ئیمپراتۆرییەتی ئەڵمانیا، ئیمپراتۆرییەتی نەمسا و مەجەر، ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی). لەگەڵ چەندین دەوڵەتی بچووك و هێزی ناوخۆیی.

٢. دەوڵەتانی هاوپەیمان: پێکهاتبوون لە زلهێزەکانی (رووسیای قەیسەری، بەریتانیا، فەرەنسا، ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا).. دواتریش هەریەك لە (ژاپۆن، یۆنان، بولغاریا، ئیتالیا، رۆمانیا) لە دەرئەنجامی کۆمەڵە هۆکارێك بەشداری جەنگەکەیان کرد و هاتنە بەرەکەوە. لەماوەی ( چوار ) ساڵی ئەم جـــەنگەشدا وێڕای ئـــــەوەی (٧٥ملیۆن) سەرباز و ئەفسەر و دەرەجەدار راپێچی شەڕ کران، بەڵام دەرئەنجام (١٠ملیۆن) یان کوژرا و (٢٠ملیۆن) یان لێبریندار و

(١٠ملیۆن) کەسیشیان بەهۆی نەگەیشتنی ئازووقەی پێویست بۆیان لە برساندا مردن. ئەمەو سەرەڕای ئەوەی (٦٠٠٠) پاپۆڕی جەنگی نوقومبوون و سامانێکی زۆری تێدابەفیرۆچوو.(٦)

ئەگەر جەنگێك ئەو کاریگەرییەی بەسەر جیهاندا هێنابێت، ئاساییی کاریگەری بەسەر کورد و خاکەکەیەوە بووە. ئەوەش لەبەر ئەم هۆیانەی خوارەوە:

١. سەرەتاکانی سەدەی نۆزدەیەم تا بەرپابوونی جەنگی یەکەمی جیهان، دەوڵەتە ئەوروپییەکانی وەك (بەریتانیا، روسیا، فەرەنسا، ئەڵمانیا) بە دەرامەتی ئابووری و ستراتیجییەتی خاکی کوردستان ئاشنابوون، بەم بەڵگانەی خوارەوە:

أ. بەریتانیا وەك هێزێکی سیاسی لە سەرەتاکانی جەنگدا و لەرێگای کەنداوی عەرەبییەوە پەلاماری باشووری کوردستانیاندا. لەدوا ساڵەکانی جەنگیش سەرجەم ناوچەکانی کوردستانی باشوور و باشووری خۆرهەلاتی کوردستانیان داگیرکرد. دواتر کەوتە دانانی کاربەدەستانی سیاسی بەریتانیا لە مەڵبەندە کوردییەکان بۆ بەرێوەبردنی ناوچەکە.

ب. هەرچی رووسیای قەیسەرییە لە باکووری ئێرانەوە پەلاماری باکووری کوردستانی خۆرهەلاتی دا و تا ناوچەکانی (بانە و سەقز)یان داگیرکرد. دیارە بێدەسەلاتی بنەماڵەی قاجاری لەو بەشەی کوردستان

ڕێگایان بۆ هاتنەناوەوەی سوپای داگیرکەرانی بەریتانیا و رووسیا خۆشکرد.

ج. ئەڵمانیاش لە کۆتایی سەدەی نۆزدەیەم و سەرەتای سەدەی بیستەم بە خاکی کوردستان تەواو ئاشنابوو، کەوتە دژایەتی دەوڵەتانی هاوپەیمان بۆ جێکردنەوەی شوێنپێی خۆی لەکوردستاندا. هەرئەوەش وایکرد زیاتر لە عوسمانییەکان نزیکبێتەوە و هانیبدات بچێتە جەنگەوە. بۆئەو مەبەستەش پرۆژەی هێڵی ئاسنی (بەغداد- بەرلین) کە بە کوردستاندا تێپەڕدەبوو، خستەبەردەم دەوڵەتی عوسمانی بۆ جێبەجێکردنی، تا بەهۆیەوە لەبەگژاچوونەوەی هاوپەیمانان یارمەتی عوسمانییەکان بدات. بەمشێوازە کوردستانی باکوور و ناوچەکانی دەوروبەری کەوتنەژێر کاریگەری بانگەشەی غەزا لە دژی هاوپەیمانانی مەسیحی کە ئەو بانگەشەیە بە فرمانی دەوڵەتی ئەڵمانیا سوودیلێوەرگیرا.(٧)

شالاۆی داگیرکاری بەریتانیا بۆ باشووری کوردستان:

(دە) مانگ دوای جەنگی جیهانی یەکەم حکومەتی بەریتانیا فرمانیان بە هێزێکی سوپاکەیان لە بەری هیندستان کرد لە کەنداوی عەرەبییەوە پەلاماری ویلایەتی بەسرەی دەوڵەتی عوسمانی بدەن. لەو بەرەیەشەوە گورزێکی کوشندە بە هێزەکانی ئەو دەوڵەتە بگەیەنن. پلانەکە سەریگرت و لە (٦ی تشرینی یەکەمی١٩١٤ز)دا پەلاماری

شارۆچکەی (فاو)یاندا و بێهیچ رووبوونەوەیەکی سەربازی داگیریانکرد. زۆری نەخایاند لە دووەم شالاّویاندا لە (٢٢ی تشرینی دووەم)دا شاری (بەسرە)ی بنکەی ویلایەتی بەسرەیان داگیرکرد.(٧)

لە گەرمەی ئەو رووداوانەدا (سولّتان محەمەد شەشەم عوسمانی) بۆ درێژەدان بە شەڕەکە و راکێشانی زۆربەی هەرە زۆری کۆمەلاّنی نێو دەولّەتی عوسمانی، بانگەشەی غەزای راگەیاند. بۆئەو مەبەستەش داوای لە سەرجەم کۆمەلاّنی موسلّمانانی نێو دەولّەتەکەی کرد، لەپێناوی پاراستنی ئیسلام و دەولّەتی عوسمانی لە دژی داگیرکەران و کۆمەلاّنی مەسیحی و جوولەکە غەزابکەن.(٨) ئەوەبوو بانگەشەی غەزا کاری خۆی کرد چەندین هۆزی نەتەوەکانی (کورد و تورکمان و عەرەب)یان بۆئەو کارە هاندا. یەکەمین وێستگەش بانگەشەکەش بۆ (کورد) شەڕی شوعێبەی ئەوپەڕی بەری باشووری ولایەتی بەسرە بوو. سەرکردە و پێشەوای کوردەکانیش بۆ ئەو ململانێیە لەگەلّ ئینگلیزەکان شێخ مەحمودی نەمر) بوو. گەورەیی ئەو کەسایەتییەش لەوەدابوو کە راستەوخۆ فرمانی سولّتای عوسمانی بەهۆی (جەنەراڵ خەلیل پاشا)ی فەرماندەی سوپای پێنجەمی عوسمانی پێگەیشت،(٩) کاتێك لە (٢٥ی ئازاری١٩١٥ز) سەردانی سلێمانی کرد.(١٠) دوای گەیشتنی ئەو فەرماندەیەی سوپای عوسمانی بۆ شاری سلێمانی و کۆبوونەوە لە (شێخ مەحمود) بۆ زیاتر لە یەك کاتژمێر گفتوگۆکردن، جەنەراڵ بارودۆخی

شەڕ و دەستدرێژی هێزەکانی بەریتانیای بۆ سنووری دەوڵەتی عوسمانی بۆ روونکردەوە، هەروەها داوای هاوکاریکردنی (شێخ مەحمود)و کۆمەڵانی کوردەواری بۆ غەزا لە دژی حکومەتی بەریتانیا! سەرئەنجام جەنەڕاڵی عوسمانی توانی کار لە (شێخ) بکات و پشتیوانی داواکەی بکات و بەدەم بانگەوازی عوسمانییەکانەوە بچێت. ئەمەو جەنەڕاڵی ناوبراو هەمان رۆژ سلێمانی بەجێهێشت و گەیشتەوە کەرکوك.[١١]

دیارە بەوپێیەی (شێخ مەحمود) کەسایەتییەکی گەورە و ناسراوی کوردستان بەگشتی و ناوچەی سلێمانی و گەرمیان بەتایبەتی بوو، بۆیە لە ماوەیەکی کەمدا توانی داواکەی (جەنەڕاڵ خەلیل پاشا)و فتواکەی (سوڵتان محەممەدی شەشەمی عوسمانی) بگەیەنێتە هۆزەکانی (هەمەوەند و زەنگەنە و جاف و دزلْی و شێخ بزینی و پشدەر و ئیسماعیل عوزێری و دەزیی و دەلۆ و داودە و گێژ و جەباری و گل).[١٢] داواکەش لەلایەن سەرۆکی ئەو هۆزانەوە بەباشی وەڵامدرایەوە و زۆربەیان لە ماوەیەکی کەمدا بەخۆیان و چەند سوارە و پیادەی هۆزەکەیانەوە گەیشتنە سلێمانی و بەدەم داواکەیەوە هاتن و خۆیان بۆئەو شەڕە چارەنووسسازە ئامادەکرد. (شێخ مەحمود)یشیان وەك سەرکردەی خۆیان بۆئەو شەڕە هەڵبژارد.[١٣] دواجار نزیکەی (سێ هەزار) سوارە و پیادە لە کۆمەڵانی کوردەواری و چەند هۆزێکی کوردی لەژێر سەرکردایەتی شێخدا شاری سلێمانیان بەرەو بەغداد و پاشان بەرەو بەسرە بەجێهێشت. ئەوەش

بۆئەوەی هاوکاری هێزەکانی سوپای عوسمانی و هۆزە عەرەبی و تورکمانییەکان لە شوعەیبە بکەن.(١٤)

دیارە کاتێك هێزی هۆزە کوردییەکان گەیشتە (شوعێبە) رووبەڕووی بۆمبارانی خەستی هێزەکانی بەریتانیا بوونەوە.(١٥) سەرەڕای بۆمبارانی فڕۆکە جەنگییەکان کە بۆئەو رۆژگارە و بۆ کۆمەڵی کوردەواری شتێکی نوێی و چاوەڕواننەکراوبوو. هەرچۆن بێت دوای (دوانزە) کاتژمێر شەڕی سەخت، هێزەکانی سوپای عوسمانی و هاوکارانی بەسەختی تێکشکان و بەزوویی لە بەری شەڕەکە پاشەکشەیانکرد. ئەوەش دوای ئەوەی چەند کەسیان لێکوژرا و سەدانیشیان لێبریندارببوو،(١٦) تا ئەوەی لە هێزی هۆزە کوردییەکان هەریەك لە (ئەحمەد ئاغا و قادر ئاغا) لە هۆزی زەنگنە و (نامیق ئاغا) لە هۆزی داودە و (شێخ عەلی قەڵبازی) لە هۆزی جەباری و چەند رۆڵەیتر شەهیدبوون. جگەلە برینداربوونی دەیانیتر.(١٧)

بەشداری کوردەکان لەو شەڕە و شەڕکردنیان بۆ ماوەی (دوانزە) کاتژمێر، رووداوێکی کەمنەبوو. ئەوەش بەوەی لە دووری سەدان کیلۆمەتر لە مەڵبەندەکانی خۆیان بەشداری شەرێکی وەها گەورەیان کرد کە نابەرامبەری پێوەدیاربوو. ئەمە و سەرەڕای ئەوەی شەڕکردن لە ناوچەیەکی بیابان و گەرم و کەم ئاوی وەك (شوعێبە) لە ویلایەتی بەسرە بۆ کوردەکان کە فێری ئەوجۆرە بارودۆخە نەبوون، کارێکی

ئاسانننەبوو، لەگەڵ ئەوەشدا لێهاتوویی و بەتوانایی و جوامێریان لەناو هێزەکانی سوپای عوسمانیدا دەنگ و رەنگی خۆیدایەوە، گەرچی چارەنووسیان شکستبوو.(١٨)

ئەنجامی رووداوی شوعێبە هاوکات بوو لەگەڵ پێشرەوی هێزەکانی بەریتانیا بەرەو ناوەڕاست و باشووری ئێراقی ئیمڕۆ، تا ئەوەی لەماوەی سالآنی جەنگدا دەستیان بەسەر هەر (سێ) ویلایەتی (بەسرە، بەغداد، موسلّ)دا گرت. لەو نێوەندەشدا داگیرکردنی شاری (کفری) بۆ (١٨ی نیسانی١٩١٨ز) دواکەوت. دیارە دواکەوتنی داگیرکردنی ئەو شارە لەلایەن هێزەکانی بەریتانیاوە بۆئەو بەرگرییە سەختە گەڕایەوە کە دانیشتوانی کفری بە رێبەرایەتی (ئیبراهیم خانی دەلۆ) لە دژی سوپای بەریتانیا و دۆستەکانی بەرپایانکرد.(١٩)

رۆژگار تێپەڕی رووداوەکانی جەنگەکە بە ویستی کوردەکان دوایینەهات، تا بەری سەرکەوتن لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانی بخۆن، بەڵکو بە شکستی ئەوان دواییهات، بەلآم بەهۆی پێگەی کوردستان و ئەو پلانەی حکومەتی بەریتانیا لە باشووری کوردستان هەیبوو، وایخواست کە لە کوردەکان نزیکبێتەوە. لەم بوارەشدا کەسایەتی (شێخ مەحمودی نەمر)یان بۆ نزیکبوونەوە لەسەرجەم هۆزە کوردەکان بەکارهێنا. هەربۆیە دوای ئەوەی بەریتانییەکان لە (١ی تشرینی یەکەمی١٩١٨ز) شاری (سلێمانی)یان داگیرکرد، بیریان لە دانانی (شێخ) وەکوحوکمداری

باشووری کوردستان کردەوە، تا بەهۆی ئەوەوە باشتر دەست بەسەر باشووری کوردستاندا بگرن و لە ململانێی هەرێمی و دەرەکی دووریبخەنەوە. ئەوە بوو لە (١٧ی تشرینی دووەمی١٩١٨ز) شێخیان وەك حوکمداری سلێمانی و ناوچەکانی دەوروبەری ناسی. لێرە بەدوا و بۆ یەکەمجار لەم قۆناغە مێژووییەدا کاروباری خۆجێیەتی کوردی رێکخرا و زمانی کوردی کرا بە زمانی رەسمی حکومەت. بەمەش بزووتنەوەی نەتەوەیی کورد گەیشتە قۆناغێکی نوێ. بەوەی لەژێر دەسەڵاتی حکومەتێکدا زمانی خۆی لە دامودەزگا ڕەسمییەکان بەکاربهێنێت و کەسایەتی و کارمەندی کورد لەحکومەتەکەدا دەستبەکاربن، بەڵام زۆری نەبرد بەهۆی هەڵەی خۆڕێبەری کورد و سیاسەتی ئینگلیزەکان دەسەڵاتی (شێخ مەحمود) سنووردارکرا. ئەمەش وای لە (شێخ) کرد ڕووبەڕووی ئینگلیزەکان بێتەوە.[٢٠]

لەو هۆکارانەش وایان لە بەریتانیا کرد دژایەتی (شێخ مەحمود) بکات ئەمانە بوون:

١. کوردستانی باشوور لە رێکەوتننامەی (سایکس-بیکو)دا درابوو بە فەرەنسا، بەڵام بەریتانییەکان لەبەرامبەر بەخشینی برێکی نەوتی ناوچەکە بە فەرەنسییەکان، ئەم ناوچەیەی بۆ خۆی هێشتەوە. لێرە بەدوا لەم ناوچەیە کەس نەبوو دژایەتی بەرژەوندییەکانی بەریتانیا بکات  دەسەڵاتەکەی (شێخ مەحمود) نەبێت. دیارە ئەم دەسەڵاتەش لە

دژی بەرژەوەندییەکانی بەریتانیا نەبوو، بەڵکو چەند بەرپرسێکی بەریتانی لەو سەردەمەدا بە مەترسییان دەزانی. ئەوەش هەڵوێستی هەموو بەریتانییەکان نەبوو، بەڵکو هەڵوێست و بۆچوونی هەندێکیان بوو.

٢. سەرهەڵدانی کێشەی ویلایەتی موسڵ لەنێوان هەردوو دەوڵەتی (بەریتانیا و تورکیا)، مەترسی بوو لە نزیکبوونەوەی دۆستایەتی تورك و دەسەلاتەکەی (شێخ مەحمود).

٣. بەریتانیا لەبەرنامەیدا بوو بۆ راستی بەڵێنەکانی بە بنەماڵەی (شەریف حسێن)، یەکێك لە کوڕەکانی بکاتە سەرۆکی ئەو دەوڵەتە نوێیەی بەنیازبوو بەناوی (دەوڵەتی عێراق) دایبمەزرێنێت کە ئەم ناوچەیە بەشێك بوولێی.

ئەمانە وایکرد بەریتانیا دژایەتی (شێخ) بکات و (شێخ)یش بانگەشەی شۆڕش لە ناوچەکە بکات. ئەوەش لە (**٢١**ی نیسانی**١٩١٩**ز) روویدا. کاتێك توانی سلێمانی لەهەمان رۆژدا ئازاد بکات و کاربەدەستانی بەریتانیش لە شارەکە دەستگیربکات.[٢١] ئەوانەش وای لە بەریتانییەکان کرد بە سوپایەکی بەهێزەوە پەلاماری سلێمانی بدەن. دواتر لە شەڕی (دەربەندی بازیان)و لە (**١٧**ی حوزەیرانی**١٩١٩**ز) لەگەڵ سوپاکەی شێخ لە یەك بدەن.[٢٢] لەم شەرەشدا (شێخ مەحمود) بەدیلگیرا

و بۆ دادگاییكردنی رەوانەی بەغدا كرا. سەرەتا فەرمانی خنكانی درا، بەلاٌم دواجار بەهۆی پلانێكی ئایینده‌یی وەزارەتی موستەعمەراتی بەریتانیا دوورخرایەوە بۆ ولاٌتی هیند.(٢٣)

لەلایەكیترەوە بەدیلگیرانی شێخ بزووتنەوەی نەتەوەیی كورد و خەباتی هۆزەكانی كوردی كۆتاییپێنەهێنا، بەڵكو لەبەرامبەردا ناڕەزایی جەماوەری لە دژی ئینگلیزەكان سەریهەڵدا. بەڕادەیەك ئەو شۆڕشەی دواتر ناوی (شۆڕشی بیست)ی لێنرا، بڵێسەكەی لەكوردستاندا بوو. ئەوەش شۆڕشێك بوو بەڕادەیەك رق و نارەزای كۆمەلاٌنی خەڵكیان بەرزكردەوە وێنەی نەبوو. لە سەروبەندی ئەو رووداوانەشدا داواكاری فەرەنساییەكان بۆ ویلایەتی موسڵ بەپێی رێكەوتنامەی (سایكس-بیكۆ) سەریهەڵدایەوە. ئەمەو جگەلەوەی بەریتانیا ویستی (شێخ مەحمود) لەبەرامبەر (فەیسەڵ كوڕی حسێن) بكاتە مەلیك، تا بەهۆی مەلیك مەحمودەوە (فەیسەڵ كوری حسێن)ی پێبترسێنێت و بەرژەوەندییەكانی لەعێراقدا بۆ بپارێزێت، بۆیە بەریتانیا ناچاربوو (شێخ مەحمود) بگێڕێتەوە كوردستان.(٢٤)

بزووتنەوەی نەتەوایەتی كوردی لە سەردەمی شێخ مەحمود دا:

گەڕانەوە بۆ چەمك واتای بزووتنەوەی نەتەوایەتی كورد لەو سەردەمەدا گەڕانەوەیە بۆئەو بارودۆخەی باشووری كوردستان و عێراقی تێداژیا. ئەو بارودۆخەش وابەستەبوو بە هەڵوێستی كورد و بەتایبەت

سەرۆك هۆزەکانی لەو سەردەمەدا. هەڵوێستەکەش لای بەشێکی زۆریان دژایەتی ئینگلیزەکان و لای کەمێکیشیان دۆستایەتیکردنیان بوو. لەم بوارەدا دەکرێت هەڵوێستی هەردوو سەرۆکهۆز و کەسایەتی کورد (بابەکر ئاغای پشدەری) لە ناوچەی پشدەر و (عادیلە خانم) لە ناوچەی هەڵەبجە وەك (دوو) نموونەی دیاری لایەنگرانی ئینگلیزەکان بهێنینەوە یاد.[٢٥] دیارە بوونی دوو هەڵوێستی دژبەیەك لە دوو ناوچەی نزیك بەیەك لە بەرژەوەندی ئینگلیزەکان و دەوڵەتی تازە دامەزراوی عێراق بوو. بەپێچەوانەشەوە بە زیانی بزووتنەوەی نەتەوەیی کورد و شکستی هەوڵەکانی بوون. هەرئەوەش فاکتەری سەرنەکەوتنی شۆڕش و ڕاپەرینەکانی بوو، کە دواتر کۆمەڵی کوردەواری باجەکەیاندا و بەرەو هەڵدێریان برد. لەم نێوەندەشدا (شێخ مەحمود) وەك دیارترین کەسایەتی ناوچەکە هەڵوێستەکانی لە دژایەتیکردن و دۆستایەتیکردنی ئینگلیزەکان بەپێی بارودۆخی سەردەمەکە بەڕێوەبرد.

لەکاتێکیشدا (شێخ مەحمود) ئەو ڕەوتەی بەڕێوەدەبرد، لە حوزەیرانی ساڵی (١٩٢٠ز) لەعێراقدا شۆڕشێکی جەماوەری سەرتاسەری هەڕەشەیەکی گەورەی لەناکاوی لە ئینگلیزکان کرد کە ئەگەر سیاسەتی هەڵخەڵەتاندن و فریودانی جەماوەر لەلایەن ئینگلیزەکانەوە نەبوایە، دوورنەبوو کۆتایی بە دەسەڵاتیان لە عێراقدا بهێنرێت.

بەر لە ساڵێکیش لەو شۆڕشە (شێخ مەحمود) رابەرایەتی بزووتنەوەی نەتەوەیی کوردی لە دژی ئینگلیزەکان کرد و ناوچەکەی راچڵەکاند. نەك هەرئەوە، بەڵکو سالێك بەر لەو شۆڕشە لە زۆربەی ناوچە کوردییەکانی کوردستانی عێراقدا جەماوەری راپەڕیو بەگژ ئینگلیزەکاندا چوونەوە کە تا ناوەڕاستی ساڵی (١٩٢٠ز) کزەی ئەو راپەڕینە هەرمابوو. بۆ مێژووش جیگای خۆیەتی ئاوڕ لە چەند لایەنێکی ئەو راپەرینە کوردییانە لە سنووری لیوای سلێمانی و ناوچەی گەرمیان بدەینەوە کە هاوکاتی قۆناغی یەکەمی حکومەتەکەی (شێخ مەحمود) بوو. بە واتا هەمان هەڵوێستی شێخیان لە رووداوەکانی باشووری کوردستان هەبوو، لەوانە هۆزەکانی ناوچەکانی سلێمانی و شارەزوور و هەورامان و کەرکوك پشتیوانیان لە حکومەت و هەڵوێستەکانی شێخ کرد. کاتێکیش شێخ بەدیلگیرا و دوایی دادگایی رەوانەی هیندستان کرا راپەڕین و شۆڕش چەندین ناوچەی باشووری کوردستانی گرتەوە. ئەو شۆڕش و راپەڕینانەش ئەگەرچی هەندێکیان ئامانج و مەبەستی تایبەتی خۆی هەبوو، بەلاّم بەوپێیەی دژایەتیکردنی ئینگلیزەکان بوو، ئینگلیزەکانیش شێخیان بەدیلگرتبوو، بۆیە خودی ئەو راپەڕین و شۆڕشانە هاوهەڵوێستی شێخ و لایەنگرانی بوون. هەر ئەو رووداوانەش دواتر فاکتەرێکی ئازادکردنی شێخ بوو لەلایەن ئینگلیزەکان و گێڕانەوەی بوو بۆ کوردستان. ئەو رووداوانەش

بزووتنەوەی کوردایەتییان بەرەو پێشەوەبرد. لەم نێوەندەشدا ناوچەی گەرمیان و شاری (کفری) رۆڵی کاریگەریان گێڕا. بەوەی هۆزەکانی ناوچەکە بەڕابەرایەتی (ئیبراهیم خانی دەلۆ) رابەرایەتی شۆڕشی بیستیان لە ناوچەی خۆیان کرد. بە سەرکردایەتی ئـــەویش توانییان لە (١٤ی ئابی١٩٢٠ز) شاری خانەقین و لە (٢٠ی ئابی١٩٢٠ز) شاری توزخورماتوو لە (٢٢ی ئابی١٩٢٠ز) شاری کفری ئازادبکەن و مەترسی بۆ بەرژەوەندییەکانی بەریتانیا لە ناوچەکە دروستبکەن.[٢٦]

لە شاری چەمچەماڵیش بەهاوکاری (کەریمی فەتاح بەگی هەمەوەند) سەرۆکی هۆزی هەمەوەند و (سەید محەمەدی جەباری) سەرۆکی هۆزی جەباری و دووان لە هەرە نزیکەکانی (شێخ مەحمود) لە (١٨ی حوزەیرانی ١٩٢٢ز)دا (کاپتن بۆند)ی فەرمانڕەوای ئینگلیزیان لە شاری چەمچەماڵ کوشت و شارەکەیان بۆ ماوەیەك ئازادکرد.[٢٧]

بەمشێوازە بزووتنەوەی نەتەوایەتی کورد لەوسەردەمەدا رۆڵی خۆی بە کارایی پیادەکرد و بەڕێوەبرد فاکتەرێکی دەرکەوتن و گەشەکردنی ئەو بزووتنەوەیەش بەدیلگیرانی (شێخ مەحمود) بوون لەوکاتەدا ، چونکە ئامانجێکی گەورەی ئەو چالاکییانەی هۆزە کوردییەکان تۆڵەسەندنەوە بوو لە ئینگلیزەکان و ناچارکردنیان بوو، بەوەی رابەری کوردایەتی ئەو قۆناغەیان لە دیلی و ئاوارەیی ئازادبکەن. ئەمەو جگەلەوەی زۆربەی هەرە زۆری هۆز و سەرۆکهۆزەکانی باشووری

کوردستان لە دژی دانانی (فەیسەڵ کوڕی حسێن) وەك پادشای دەوڵەتی نوێی عێراق وەستان کە لە (٢٣ی ئابی١٩٢١ز) کرایە پادشا، بەڵکو لە بەرامبەردا داوای گەڕانەوەی (شێخ مەحمود)یان بۆ کوردستان کرد.(٢٨) هەر ئەو کۆدەنگییەش ئینگلیزیان ناچارکرد بەمەبەستی پاراستنی بەرژەوەندییەکانیان شێخ بگێڕنەوە کوردستان و جارێکیتر وەك مەلیکی کوردستان بیناسن.

کفری بەر لە دامەزراندنی حکومەتی کوردستانی باشوور: هەلاَیسانی شۆڕشی بیست و بەرزبوونەوەی دەنگی نارەزایی هۆز و تیرە و خێڵە کوردەکان بۆ گێڕانەوەی (شێخ مەحمود) بۆ کوردستان، وایان لە ئینگلیزەکان کرد، چارەسەری ئەو دۆخە بکەنەوە. ئەوەبوو سەرباری ئەوەی بڕیاری ئازادکردنی شێخ و گێڕانەوەیان بۆ کوردستاندا، هەوڵیاندا ئارامی بۆ ناوچەکە بگێڕنەوە. لەم بوارەدا بیریان لە دانانی چەند کەسایەتییەکی کورد بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری ناوچەکە کردەوە. لەو هەوڵەشیاندا (شێخ حەمید تاڵەبانی) لەبری بەڕێوبەری ناحیە کرایە سەرۆکی ناوەچەکە، هەروەها (شێخ محەمەدی شێخ عەبدولکەریمی کرمچنە) کرایە سەرۆکی (قەرەحەسەن). (رەفعەت بەگی داودە)ش کرایە سەرۆکی دوزخورماتو. (کەریم بەگی فەتاح بەگی هەمەوەند)یش کرایە سەرۆکی کەلار و شیروانە. ئەمەو جگەلەوەی (شێخ حەمید تاڵەبانی) سەرباری پۆستەکەی پێشووی کرایە یاریدەدەری قایمقامی

کفری و (عەبدولکەریم ئاغا) بە سەرۆکی ناوچەی زەنگەنە و کەریمی فەتاح بەگی جاف بە سەرۆکی هۆزی جاف لەلایەن بەریتانییەکانەوە متمانەیانپێکرا.(٢٩)

دیارە ئەوکارە چەندە بۆ بەریتانییەکان گرنگ بوو، تا لانیکەم جۆشوخرۆشی کوردەکان بۆ شۆڕش و ڕاپەڕین کەمبکەنەوە. ئەوەندەش بۆ کورد گرنگ بوو کە سەرۆکە ئازادکراوەکەی لە بارودۆخێکی وەها هێمندا بگەڕێتەوە خاکی نیشتمان. بەوپێیەشی گۆڕانکارییەکانی حکومەتی بەریتانیا زیاتر لە ناوچەی گەرمیان بوو، بۆیە سەرەتای ویستگەی گۆڕانکارییەکانیش کەوتنە ئەو ناوچەیە.

جاڕدانی حکومەتی کوردستانی باشوور لە شاری (کفری):

دەرکەوتنی پێگەی کفری دوای شۆڕشەکەی (ئیبراهیم خانی دەلۆ، بۆ گەڕانەوەی (شێخ مەحمودی نەمر) بۆ کوردستان بەگشتی و شاری کفری بەتایبەت دەگەڕێتەوە. ئەوەش کاتێك لە (٢١ی ئەیلولی١٩٢٢ز) بە شەمەندەفەر و بە هاوڕێیەتی (مێجەر نۆئێل) ئەفسەری پایەبەرزی سوپای بەریتانیا لە ئێراق گەیشتەوە شاری کفری.(٣٠) دیارە (شێخ مەحمود) بەر لە گەڕانەوەی بۆ شاری (کفری) لە (١٣ی ئەیلولی١٩٢٢ز) لە (کوەیت)ەوە گەیشتبووە شاری (بەغداد)(٣١) و تا (٢٠ی ئەیلول) لەو شارە مایەوە کە تێیدا بۆ (سێ) جار چاوی بە (فەیسەڵی کوڕی حسێن) ی پادشای ئێراق و (سێر برسی کۆکس) نوێنەری باڵای حکومەتی

بەریتانیا لە ئێراق کەوت.[٣٢] دیارە بەر لەو رووداوە و لەنامەیەکدا کە (مێجەر گولّد سمیس) لە (١٣ی ئەیلولی١٩٢٢ز) بۆ (شێخ عەبدولکەریمی کربچنە)ی نووسیووە، ئاماژەی بەوەداوە کە (شێخ مەحمود) لەکاتی هاتنەوەیدا بۆ سلێمانی دەچێتە شاری (کفری).[٣٣] بەوپێیەش بێت ئینگلیزەکان بەر لە گەڕانەوەی (شێخ) بۆ کوردستان نەخشەی ئەوەیان داناوە بەکام رێگادا بگاتەوە زێدی خۆی کە لەم نێوەندەشدا پێگەی شاری (کفری) لای ئینگلیزەکان دەردەکەوێت، بەوەی ویستوویانە یەکەم وێستگەی پشوودانی گەشتەکەی لە کوردستاندا ئەو شارە بێت. لەو هاتنەوەشیدا چەندین سەرۆکهۆز و کەسایەتی و خەڵکی ناوچەکە لەپێشوازیدا بوون. لەنێو ئەو کەسایەتییانەی لەپێشوازیدا بوون (عەزیزی برایم خانی دەلۆ و شەرەفی برایم خانی دەلۆ)و (کەریم بەگی جاف و حەمەبەگی جاف)و (عەلی ئاغای زەنگەنە و سەید محسن ئاغا و جەمیل بابانزادە) لە کەسایەتییەکانی کفری. ئەمەو کەسایەتییەکانی وەك (مستەفا پاشای یامولکی و حەمەی ئەوڕەحمان ئاغا) لە شاری سلێمانییەوە گەیشتبوونە کفری بۆ پێشوازی لێی.[٣٤]

ئەو رۆژەی (شێخ) گەیشتە شاری (کفری)، سەرەتای گۆڕانکارییەکی گەورە بوو بۆ مێژووی کورد، چونکە بۆ شەوی دواتر لە ماڵی (سەید محسن ئاغا) یەکەمین حکومەتی کوردی راگەیەنرا.[٣٥] لەو کۆبوونەوەیەشدا هەریەك لە (جەمیل بەگی بابان، سەید عومەر ئاغا و

سەید قادر ئاغا و حاجی رەشید ئاغا) لە کەسایەتییەکانی شارەکە و (کەریم بەگی فەتاح بەگ و حەمید بەگ و ئەحمەد موختار بەگ) لە بەگزادەکانی جاف و (سەید محەممەدی جەباری) سەرۆکی هۆزی جەباری و (سەید عەزیز ئاغا عەباس ئاغا و عەلی ئاغا) لە هۆزی داودە و (عەلی ئاغای حەسەن ئاغا و غەفور ئاغای جاسم ئاغا و حەمە ئاغای کەریم ئاغا) لە هۆزی زنگەنە و (سلێمان بەگ و فارس بەگ و محەممەد حەسون بەگ) لە سەرانی هۆزی بەیات (ئەمین ئاغای رەشید ئاغا و عەزیز خەسرۆ ئاغا و یونس ئاغای مەحمود خدر ئاغا و جەهەر ئاغا خدر ئاغا) لە هۆزی هەمەوەند (شێخ قادری شێخ رەزا و سەید عەلی و شێخ ئەمین و شێخ نەجیب و سەید خەلیل ئاغا) لە شێخانی قادرکەرەم و (لیوا سدیق پاشای قادری و بنیباشی تۆفیق وەهبی و بینباشی خالید سەعید و یوزباشی یوسف ئەفەندی و مولازم ئەمین ئەفەندی و مولازم عەزیز حیکمەت و مولازم عەبدولعەزیز و مولازم ئەمین رەواندوزی) لە ئەفسەرانی کورد لە سوپای ئێراق ئامادەی بوون.[٣٦] بەمەش سەرۆك و گەورەی هۆزەکانی (جاف و جەباری و داودە و زەنگەنە و بەیات و هەمەوەند و شێخانی قادر کەرم و دەیان کەسایەتیتر ئامادەی جاڕدان و بڕیاردان لەسەر دامەزراندنی حکومەتی باشووری کوردستان بوون، بەم رووداوەش شاری (کفری) بە رووداوێکی گەورەوە چووە نێو لاپەڕەکانی مێژووی هاوچەرخی کوردەوە. دیارە جیاوازی ئەم حکومـــەتەش لە

حکومەتەکەی (١٧ی تشرینی یەکەمی١٩١٨ز) تا (١٧ی حوزەیرانی١٩١٩ز) ئەوەبوو کە حکومەتی یەکەم بە ویستی بەریتانییەکان و بە دەستپێشخەری ئەوان لە شاری سلێمانی دامەرزا، بەلاّم ئەم حکومەتەیان بە ئیرادەی خودی کورد و بە پشتیوانی سەرۆکهۆز و کەسایەتییە دیارە جەماوەرەکەی لەناوچەیەکی گرنگ و شارێکی مێژوویی بچووکتر و نەناسراوتر لە سلێمانی بانگەشەی بۆکرا، ئەویش شاری کفری ناوچەی گەرمیان بوو. دیارە ئینگلیزەکان زۆر باش (شێخ مەحمود)یان ناسیبوو، دەیانزانی بە ویستی ئەوان کارناکات.[٣٧] ئەمەو زۆر باشیش ناوچەی گەرمیان و شاری (کفری)یان هەڵسەنگاندبوو، بەوەی مەڵبەندی سەرەکی هەلاّیسانی شۆڕشی بیست بوو بە سەرۆکایەتی (ئیبراهیم خانی دەلۆ)،[٣٨] بەلاّم لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا و لەگەڵ ئەوەی (مێجەر نۆئیل)یش وەك ئەفسەرێکی پایەبەرزی بەریتانی هاورێیەتی (شێخ)یان بۆ کوردستان و زێدی خۆی بە ناوچەی گەرمیانیشەوە کردبوو،[٣٩] بەلاّم نەیانتوانی رێگە لەو ویستەی کورد و ئەو بڕیارە بوێرانەیە لە شاری (کفری) بگرن. هەربۆیە ئەو راگەیاندنە بایەخی مێژوویی خۆی و زەمینەی بۆ دووەم حکومەتی کوردستانی باشوور بوو، کە لەنێوان (١٠ی تشرینی یەکەمی ١٩٢٢ز) بۆ (٤ی ئازاری١٩٢٣ز) کاری خۆی کرد. ئەمەو ئەو راگەیاندنەش بە پشتیوانییەکی بەهێزی ناوچەی گەرمیان بە پلەی یەکەم هاتە دونیای بوون.

ئەنجام:

لە کۆی ئەو دەقانەی سەرەوە دەگەینە ئەم ئەنجامانەی خوارەوە:

١. ڕووداو و ئەنجامەکانی جەنگی جیهانی یەکەم و ڕۆڵی دەوڵەتانی هاوپەیمانی سەرکەوتوو لەو جەنگەدا، وەك (بەریتانیا، فەرەنسا، ئەمەریکا) لەسەر ئاییندەی سیاسی ناوچەکە دیاریکرد کە تەنیا بەرژەوەندیی ئەوانی لەناوچەکە پاراستبێ گوێدانە داوا و مافە ڕەواکانی نەتەوەکانی ناوچەکە.

٢. (شێخ مەحمود) هۆکارێکی گەورە و گرنگی ڕووداو بزواندنی بزووتنەوەی نەتەوایەتی کوردی بوو لەو قۆناغەدا، چونکە تاکە سەرۆك بنەماڵە و کەسایەتی ئاییینی کوردی بوو گەیشتە پایەی مەلیکی کوردستان و (سێ) قۆناغی حکومەتی کوردی بەڕێوەبرد.

٣. دەوڵەتانی هاوپەیمان بۆ بەرگرتن لە مەترسی کۆمۆنیستەکانی ڕووسیا بۆ ناوچەکانی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست، تاکە ڕێگایان دابەشکردنی کوردستان بوو. ئامانج لەوکارەش ڕازیکردنی دەوڵەتانی ئێران و تورکیا و عێراق بوو لە پشتیوانیکردنی بەرژەوەندییەکانیان لەناوچەکە و دوورخستنەوەی کۆمۆنیستەکان، بۆیە بزووتنەوەی کوردایەتی بۆ ماوەیەك ڕووبەڕووی شکست بووەوە و حکومەتەکەی (شێخ مەحمود)یش شکستیخوارد.

٤. جاڕدانی حکومەتی کوردستانی باشوور لە (٢٢ی ئەیلولی١٩٢٢ز) لە شاری (کفری) بناغەی دامەزراندنی ئەو حکومەتە بوو کە لە١٠ی تشرینی یەکەمی١٩٢٢ز) لە سلێمانی دامەزرا.

•••

پەراوێز:

١. سلێمانی ناوچەیەك لە کوردستان، وەرگێڕانی لە ئینگلیزییەوە: مینە، چاپی یەکەم، سلێمانی، هەرێمی کوردستانی ئێراق- ئێراق، ٢٠٠٧ز، ل٤٨، المحامي جمال بابان: اصوا اسماء المدن و المواقع العراقية، الطبعة الاولي، مطبعة الاجيال-بغداد، العراق، ١٩٨٩م، ص٢٥٤.

٢. ازاد هيدايت حسن: تصميم خارظة استمعالات الارض في مدينة كفري- دراسة في جغرافية البشرية، رسالة ماجستر غير منشورة مقدمة الي كلية التربية جامعة الموصل-الموصل، العراق، ٢٠٠٣م، ص١٤.

٣. د. سامي سعيد الاحمد: شمال العراق في تاريخية القديم ، جريدة التاخي، العدد (١٧٦)، في (١٩٦٧/١٠/٢٤م، ص٦.

٤. بڕوانە: (س.پ، ل٤٨).

٥. بابان: س.پ، ل٢٥٤.

٦. بۆ زیاتر زانیاری، بڕوانە: ((د. كمال مظهر احمد: كردستان سنوات الحرب العالمية الأولى، ترجمة: محمد ملا كريم، الطبعة الاولي، بغداد،

العراق، ١٩٨٤م، صص(١٩-٢٢))).

٧. بۆ زیاتر زانیاری، بڕوانە: ((د. کمال مظهر احمد: س.ث، لل(٢٢-٨٠) )).

٨. عبدالرزاق الحسنی: تأریخ العراق السیاسی الحدیث، الطبعة الأولی، بغداد، العراق، ١٩٤٨م، ص ٤٨، الحاج: س. ث، ل٣١.

٩. الحسني: س.ث، ١/٨٤-٨٥، د. کمال مظهر احمد: س. ث، لل١٤٥-١٤٦.

١٠. ئەحمەد خواجە: چەند بیرەوەرییەکی مێژوویی، گۆڤاری رۆشنبیری نوێ، ژمارە (١١١)، ساڵی (١٩٨٦ز)، بەغداد، عێراق، ل٨٤.

١١. چاوپێکەوتنی ئەحمەد خواجە، بەرواری (١٣ی ئابی١٩٩٤ز)، گەڕەکی بەرانان- سلێمانی، هەرێمی کوردستان.

١٢. ئەحمەد خواجە: چەند بیرەوەرییەکی مێژوویی، ل٨٤.

١٣. چاوپێکەوتنی پێشووی ئەحمەد خواجە، چاوپێکەوتنی پێشووی بەهاددین دەروێش تاهیر، چاوپێکەوتنی محەمەد ساڵح زەنگنە، بەرواری (١٩ی مایسی١٩٩٠)، ماڵی کوڕەکەی (نزار ساڵح زەنگەنە)، گەڕەکی رووناکی- هەولێر، عێراق.

١٤. چاوپێکەوتنی پێشووی ئەحمەد خواجە.

١٥. رەفیق حیلمی: یاداشت، بەرگی یەکەم، چاپی یەکەم، بەغداد، عێراق، ١٩٥٦ز، لل٤٩-٥٠، الحاج: س. پ، ل٣١، عەبدوللا زیوەر:

گەنجینەی مەردان و یادی ڕۆژانی دەربەدەری، ئامـادەکردنی: **محەمـەدی** مەلا کەریم، چاپی یەکەم، بەغداد، عێراق، ١٩٨٥ز، ل١٣١.

١٦. ئەحمەد خواجە: چەند بیرەوەرییەکی مێژوویی، ل٨٤.

١٧. زیوەر: س. پ، ل١٣١.

١٨. یونس الشیخ ابراهیم السامرائی: القبائل و البیوتات و الاعـلام في شمال العراق، الطبعة الأولی، بغداد، العراق، ١٩٨٥م، ص٧.

١٩ . عەبدوللەتیف مەجید گلی: چەند لاپەڕەیەك لـە مێـژوو و ژیانـی فولکلوری هۆزی گل، ڕۆشنبیری نوێ، ژمارە (١١١)، ساڵی (١٩٨٦ز)، بەغداد، عێراق، لل١٢٠-١٢١.

٢٠ .بۆ ئەم مەبەستە، بڕوانە: (مستەفا نەریمان: شۆڕشی ئیبراهیم خانی دەلۆ، چاپی یەکەم، چاپخانەی دار الحریـة للطباعـة-بەغـداد، عێـراق، ١٩٨٥ز).

٢١. د.عزیز الحاج: القضیة الکردیة في العشرینات، الطبعة الثانیة، بغداد، العراق، ١٩٨٥م، ص٣١٠.

٢٢. الحاج: س.پ، ل٣١١.

٢٣. الحاج: ه.س، ل٣١٢.

٢٤. ارنولد. تی. ویلسون: بلاد ما بین النهرین بین ولاءین، ترجمة: فؤاد جمیل، الجزء الثاني، الطبعة الاولي، بغداد، العراق، ١٩٩٢م، صص٣٤-٣٥، رفیق حیلمی: یاداشت، چاپی دووەم، سلێمانی، هەرێمی

کوردستان- عێراق، هەرێمی کوردستانی عێراق- عێراق، ٢٠٠٣ز، ٢/١٢٦-١٢٧، هاوار: س.پ، لل(٥٢١-٥٢٩).

٢٥. بۆ ئەم مەبەستە و بۆ زیاتر زانیاری، بڕوانە: ((سدیق ساڵح: حکومەتی کوردستان لە سلێمانی (١٩١٨-١٩٢٤ز) پوختە و پێشینە و مێژوو، چاپی یەکەم، سلێمانی، هەرێمی کوردستانی عێراق، ٢٠٠٣ز) )

٢٦. دبليو. ار. هاي: سنتان فی کردستان، ترجمة: فؤاد جميل، الطبعة الاولي، بغداد، العراق، ١٩٧٢م، ١/١٧٣-١٧٧، الحاج: س.ث ، ل٣١٢.

٢٧ . بڕوانە: ((مستەفا نەریمان: س.پ، لل(١١٤-١٢٦) )).

٢٨ . مستەفا نەریمان: ه. س، ل١٨٨.

٢٩ . ادموندز: س.پ، ل٢٢٢.

٣٠ . ملا جميل روزبياني: عهد الاستعمار البريطاني و العهود التالية، ترجمة: انور مندلاوي، مجلة سردم العربي، العدد (٢)، السنة الاولي، خريف ٢٠٠٣، ص١٢٠.

٣١. محەمەد ڕەسول هاوار: شێخ مەحمود قارەمان و دەوڵەتی خوارووی کوردستان، چاپخانەی بلاك ڕۆز- لەندەن، بەریتانیا، ١٩٩١ز، ٢/٢٩٢، ئاکۆ عەبدولکەریم شوانی: شاری سلێمانی (١٩١٨-١٩٣٢) لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی سیاسییە، چاپی یەکەم، چاپخانەی زانست- سلێمانی، هەرێمی کوردستانی عێراق- عێراق، ٢٠٠٢ز، ل١٥٧.

٣٢. اي. ام. هاملتون: طريق الي كردستان، ترجمة: جرجيس فتح اللة، الطبعة الثانية، اربيل، اقليم كردستان العراق، العراق، ١٩٩٩م، ص١٥٥، هاوار: س.پ، ٢/٢٧٠.

٣٣. شوانی: س.پ، ل١٥٦.

٣٤. سدیق ساڵح: س.پ، لل٥٦-٥٧.

٣٥. هاوار: س.پ، ٢/٢٩٦، سەعید شاكەلی: لە یەكەمین كۆنگرەی كفریدا جاڕی یەكەمین حكومەتی كوردی درا، گۆڤاری بانەڕۆژ، ژمارە (١)، كانوونی یەكەمی ٢٠٠٣ز، كەركوك، لل٧.

٣٦. شێخ لەتیفی حەفید: یاداشتەكانی شێخ لەتیفی حەفید، ئامادەكردنی: مەحمود كاوە حەفید، چاپی یەكەم، هەولێر، ١٩٩٥ز، ل٨٥، سەعید شاكەلی: ، لل٦-٧.

٣٧. بانگی كوردستان، لل(٨٢-٨٣، ٨٦-٨٨).

٣٨. ادموندز: س.پ، ل١١٤، هاوار: س.پ، ٢/٢٧٠.

٣٩. بۆ ئەم مەبەستە، بڕوانە: (مستەفا نەریمان: س.پ).

٤٠. شوانی: س.پ، ل١٥٧.




## ڕەنگدانەوەی خەبات و ناوبانگی شێخ مەحمودی　نەمر لە هۆنراوە میللی و فۆلکلۆرییەکانی گەرمیاندا

### ئا: محەمەد حەمەساڵح تۆفیق

شێخ مەحمودی حەفید ناوێکی پرشنگدارە لە مێژووی بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی میللەتی کورد کە لە دەمی بووژانەوەی هەستی نایسۆنالیستیی گەلانی ژێردەستەی ئیمپراتۆرێتی عوسمانی و لە ئاخروئۆخری لاوازبوون و پاشان هەرەسهێنانی ئەو دەوڵەتەدا کەوتنە هەوڵ و تەقەلای ڕزگاربوون و بنیاتنانی قەوارەی نەتەوەییان. ئەگەرچی ئەم هەوڵ و کۆششەی کورد و بووژانەوەی هەستی نەتەوەیی لە سەدەی نۆزدەدا و لای میرنشینە کوردییەکانی بۆتان و سۆران و بابان و ئەردەڵان و ئەوانیتریش بەشێوە زۆر سەرەتاییەکەی سەریهەڵدابوو، بەڵام

بەلەناوچوون و هەڵوەشانەوەی ئەو میرنشینانە تا ناوەڕاستی سەدەی نۆزدە، ئەو بەرهەمەی بۆ کورد نەبوو کە بۆ میرنشینەکانی وەك ئەڵمانیا و ئیتاڵیا رەخسا لە سەروەختێکی مێژووی دروستبوونی دەوڵەتەکانیاندا ئەم هیوا نەتەوەییەی کورد و گەلانیتری بندەستی ئەو ئیمپراتۆرییەتە زۆر بەگەرمی بووژایەوە لە سەرەتای سەدەی بیست و بەتایبەتی لە پاش جەنگی جیهانیی یەکەم کە عوسمانی هەرەسیهێنا و بەرەی هاوپەیمانانی بە سەرکردایەتی بەریتانیا و فەرەنسا بوون بە براوەی جەنگ، سەرجەمی گەلانی ژێردەستەی عوسمانی بە کوردیشەوە کەوتنە جموجووڵ بۆ دەستەبەرکردنی سەربەخۆیـــــــی نەتەوەی خۆیان. میللەتی کورد و رابەرانی ئەو سەروەختەی کەوتنە هەوڵ و تەقەلا بۆ دروستکردنی دەوڵەتی نەتەوەیی و بۆئەم مەبەستە لەهەموو دەرگایەکیان دا و چواردە بەندەکەی مافی گەلانی ویدرۆ ویڵسنی سەرۆکی ئەو دەمەی ئەمەریکا و بەڵێنی دەوڵەتە کۆلۆنیالییەکانی بەریتانیا و فەرەنسا بۆ رزگارکردنی گەلان هیوایەکی زۆری پێپەیداکردبوون و نەیاندەزانی لەپشتی پەردەوە و بەپێی رێککەوتننامەی سایکس بیکۆ تانپۆی چ پیلانێك دەچێنێنرێت بۆ دابەشکردن و داگیرکردنی وڵاتان و میللەتان و چۆن کورد لەم پیلانەدا پشکی شێری بەردەکەوێت. ئا لەمساتەوەختەی مێژووی کورددا شێخ مەحمود وەك رابەرێکی نەتەوەیی دەردەکەوێت و لە پشتیەوە میراتێکی ئایینیی مێژووکردی بنەماڵەکەی خۆی بەرجەستەدەکات.

ئاوڕێك لە مێژوو

کە میرنشینی بابان هەواری لە قەڵاچولانەوە دەگوێزێتەوە و سلێمانی وەك پایتەختێك بۆ خۆی بنیاتدەنێت رابەرێکی ئایینی گەورەش وەك شێخ مارفی نۆدێ لەگەڵ خۆی دێنێت و مزگەوت و مەدرەسەیەکی بۆ دروستدەکات کە تائێستاش لەم شارەدا بە مزگەوتی گەورە بەناوبانگە. پاش ئاوابوونی خۆری میرنشینی بابانیش لە ساڵی ١٨٤٧ بەدواوە ئەستێرەی ئەم بنەماڵەیە رۆژ لە رۆژ پرشنگدارتردەبێ و رابەرایەتیی تەریقەتی قادری وەردەگرن کە ئەودەمە و تا مێژوویەکی دواتر قادری و نەقشبەندی رۆڵی ئایینی و کۆمەلایەتی و تەنانەت سیاسیی بەرچاودەگێڕن لەکوردستاندا بەگشتی و هەرێمی سلێمانی و شارەزوور و گەرمیان بەتایبەتی لەم قۆناخەدا کاك ئەحمەدی شێخ وەك کۆڵەکەیەك دەردەکەوێ و لە سەروەختی هەرەسهێنانی و گیانەلای خەلافەتی عوسمانلیدا شێخ سەعیدی رابەری ئەودەمەی بنەماڵەکە بە پیلان و غەدر لەگەڵ شێخ ئەحمەدی کوڕی لە موسڵ ساڵی ١٩٠٩ دەکوژرێن و شێخ مەحمود کە ئەودەمە لاوێکی تەمەن بیست و هەشت ساڵ دەبێ و لەگەڵیان دەسبەسەردەبێ لە موسڵ بە فەلاکەت رزگاری دەبێ، لە گەرمەی جەنگی جیهانیی یەکەمدا ولاتەکە دەبێتە شەڕگای هێزەکانی ئینگلیز و رووس لەسەرێکەوە و سوپای عوسمانلی لەسەرێکیترەوە.

لە ١٩١٤/١١/٢٢دا بەریتانیا بەسرەی داگیرکرد و بەرەوڕووی موقاوەمەتێکی سەختی ئۆردووی عوسمانلی بووەوە و لەژێر کاریگەریی (غەزای کافراندا) شێخ مەحمود بە هەزار سواری کوردەوە روویکردە باشووری عێراق و لە شەڕی بەناوبانگی شوعێبەی نزیك بەسرەدا بەشداریکرد و گەلێ شەهیدی کورد لەو مەیدانەدا کەوتن، لەوانە شێخ ستار و شێخ لەتیفی گوندی کانیقادری بناری گل، سەرلەشکری عوسمانی خۆی کوشت و شێخ مەحمود و سەید ئەحمەدی خانەقاش بریندار‌بوون و پاشان تووشی شکستهاتن و گەڕانەوەی کوردستان، بەڵام ناوبانگێکی گەورەیان لەناو عەرەبی باشووری عێراقدا بەجێهێشت بەڕادەیەك لە هەراو هۆسەکانیاندا ئەم بەیتەیان دووپاتدەکردەوە "پلپین الجنه لهادینا وپلپ لکاك أحمد وأولادە یان وأکرادە" واتە دوو لەسەر سێی بەهەشت بۆ هادیمان و یەك لەسەر سێی بۆ کاك ئەحمەد و منداڵەکانی یان کوردەکانی، هەر لەم کەینوبەینی شەڕ و غەزایەدا شێخ هەوڵیدابوو پەیوەندی بە ئینگلیزەوە بکات و بەڵێنێکیان بۆ کورد لێوەربگرێت، بەڵام بە کارەکەی زانرابوو و سەرینەگرتبوو.

لە سەرێکیترەوە، پاش داگیرکردنی پێنجوێن و دەوروبەری لەلایەن رووسەوە شێخ لەگەڵ لەشکرێکی عەشایەری کورددا شەڕێکی سەختی کردن هەرچەندە شێخ بەتەمەنترین کەسی بنەماڵەکەیان نەبوو کەوا بەپێی تەمەن وەك رابەر و دەمسپی بناسرێت، بەڵام هەندێ هۆکار

خۆی سەپاند لەوانە ئەو غەدر و ستەمەی لە باوکی کرا و تێیداکوژرا و سێ کەسایەتیی گەورەی بنەماڵەکەی لەمێژوودا کە شێخ مارف و حاجی کاك ئەحمەد و شێخ سەعید بوون بێجگەلەوەش ململانێکانی جەنگ و گیانی میللی و نەتەوەپەرستی لەڕووداوەکاندا دەریانخست.

میژووی پەیوەندیی شێخ مەحمود بە گەرمیانەوە

هەرچەندە بنەماڵەی بەرزنجە و شێخانی تەریقەتی قادرییان بەردەوامبوون و کاریگەری خۆیان لەناو تیرە و هۆزەکانی گەرمیان ــ قەرەداغ ــ شارەزووردا بووە و رابەرایەتی ئاییینیان کردووە، بەڵام بۆ شێخ مەحمود بێجگەلەو هۆکارانەی کاریگەری و بووژاندنەوەی هەستی نەتەوایەتیشی هاتووەسەر و رێزێکی زۆری بۆ خۆی دەستەبەرکردووە لەناو خەڵکدا و بەردەوام پەیوەندیی بەتینی بووە لەگەڵ تیرە و هۆزەکانی ئەم ناوەدا.

لە سەروبەندی پێشڕەویی هێزەکانی بەریتانیادا لە بەغدا و دیالەوە بەرەو کوردستان لە رۆژی ١٩١٨/٤/٢٨دا کفری داگیردەکەن و شێخ مەحمود لێرە پەیوەندییان پێوەدەکات و فایەق بەگی تاپۆ بەسەرۆکایەتیی وەفدێك لە سلێمانییەوە دەنێرێت بۆ کفری و ئینگلیز بێقەیدوشەرت بە حوکمداری کوردستانی قبووڵدەکەن و هەرلێرە رێککەوتنی زارەکی لەسەر دەکەن و شێخ لە ١٩١٨/١١/١ وەك

حوکمدار لە سلێمانی دەستبەکاردەبێت و مێجەر نۆئێل دەبێتە ڕاوێژکاری سیاسی شێخ و مێجەر دانلیسیش دەبێتە ڕاوێژکاری سەربازیی و دواتر هێزێکی لێڤی لە کورد پێکدێنیٚ.

لە ١٩١٨/١١/١٧ دا نۆئێل بە یاوەریی چەند کەسێکی کەم لە کفرییەوە دەگاتە سلێمانی و پێشوازییەکی گەرمی لێدەکرێت و ئەم قۆناخەی حوکمی شێخ بۆ سلێمانی و دەوروبەری حەوت مانگ دەخایەنێت کە پڕدەبێت لە ململانیٚ و چاوڕاوی ئینگلیز لەگەڵ شێخ مەحمودا سەرەتا بەهۆی هێمنی و میانڕەویی نۆئێلەوە کار باش دەڕوات، بەلاٚم شێخ دڵنیانابێت لە هەڵوێستی ئینگلیز و لەوەدەگات کە ئەوان تەنها ئەویان بۆ بەرەنگاریی تورکەکان دەوێت و ئەمیش بەناچاری پردی پەیوەندی لەگەڵ تورکەکان نابڕێت و لەگەڵیٚ سەرەوە پەیوەندیی بە ئۆزدەمیری فەرماندەی هێزێکی تورکەوە دەبێت لە ڕەواندز. ئینگلیز بەمە دڵیان لێکرمێبووە و سەرباری ئەوەی پێشتر ڕەنگڕێژی سیاسەتی بەرژەوەندخوازیی خۆیان کردبوو لەناوچەکەدا، بەلاٚم ئەمجۆرە ڕەفتارانەی شێخیان کردەپاساو بۆ ئاڵۆزکردنی بارودۆخەکە و گرتنەبەری سیاسەتێکی چەوت دەرهەق بە کورد، بەتایبەتی لەلایەن ویڵسنی جێگری حاکمی سیاسی عێراق و دەستەیەك لە ڕاوێژکارانی بەریتانیاوە لە بەغدا چەشنی مێجەر سۆن و میس بێڵ و چەندانیتر، بەتایبەتی کە لە ناوەڕاستی مانگی ئازاری ١٩١٩دا مێجەر سۆن گەیشتە سلێمانی

وەك حاكمی سیاسی و ملهوڕانە رەفتاركردنی لەگەڵ شێخ و خەڵكی شاردا وایكرد شێخ ئینگلیزەكان لە سلێمانی دەسبەسەربكات پاش ئەوەی سۆن بەجێیهێشت و گرینهاوس جێگەیگرتەوە و لە شەڕی ملەی تاسلووجەدا هێزەكانی ئینگلیزی تێكشكاند و پاشان دەربەندی بازیانیان كردە هێڵی بەرگری و لە ١٩١٩/٦/١٩ شەڕێكی قورس لەنێوان هێزی كورد كە سێسەد كەسێك دەبوو و هێزێكی گەورەی ئینگلیزدا بەرپابوو سوپای نارێكوپێكی كورد شكستیهێنا و شێخ بەبرینداری بەدیلگیرا لەگەڵ شێخ حەمە غەریبی زاوایدا و پاشان لە ١٩١٩/٧/٢٥ حوكمی لەسێدارەداندرا و دواتر گۆڕدرا بۆ دە ساڵ و دوورخستنەوە بۆ كوێت و دوورگەكانی ئەندامان و هەنگامی هیندستان.

شۆرشی برایم خانی دەلۆ و كاریگەرییەكانی شێخ مەحمود

لەم راپەڕینەدا كە زیاتر لەناو خەڵكدا بە هەراكەی برایم خان ناویدەركردووە، بە سەركردایەتی برایم خان و پاڵپشتی چەند عەشیرەتێكی ناوچەكە و بەتایبەتی دەلۆ و زەنگنە و جاف بەرپاكرا و لە رۆژی ١٩٢٠/٨/٢٢دا بۆ ماوەی نزیكەی مانگێك شاری كفری رزگاركرا و تێیدا كابتن سالمۆنی حاكمی سیاسی ئینگلیز لە كفری كوژرا، راستە ئەم راپەڕینە كاریگەریی راپەڕین و بەرهەڵستكاری حوكمی راستەوخۆی ئینگلیزی لەگەڵ لە شارەكانی عێراقدا لەسەر بوو كە سەرەتاكەی لە شاری رومێسەی باشووری عێراقەوە دەستیپێكرد و لەكوردستانیشدا

گەلێ ناوچە و شاری گرتەوە وەك خانەنەقین و ئامێدی و زاخۆ و چەمچەماڵ و شوێنانیتر و گەلێ لە حاکمە سیاسییەکانی ئینگلیزی تێداکوژران یان بەدیلگیران، لەوانەش کوشتنی کابتن پۆند و کابتن ماکانت لە ناوچەی چەمچەماڵ لەلایەن کەریم بەگی فەتاح بەگی هەمەوەندەوە کە سەرکردەیەکی لێهاتووبوو لە سوپاکەی شێخدا.. لێرە داواکاریی سەرەکیی برایم خان و راپەڕینەکەی گێڕانەوەی شێخ مەحمود بوو لە دیلێتی، پرۆتێستۆ و ناڕەزایی دەربڕین لە حوکمی راستەوخۆی ئینگلیز و رەفتاری ملهوڕانەی حاکمە سیاسییەکانی و تێکەڵەی هێزەکانی کە زۆرینەیان سیك و گورگەکانی هیندی بوون.

حکومەتی دوومی شێخ مەحمود و شاری کفری ساڵی ١٩٢٢

پاش ئەوەی کاربەدەستانی ئینگلیز لە عێراق و کوردستاندا بۆیاندەرکەوت خەڵك زۆر ناڕازییە لە سیاسەتیان و پێدەچێت لەسەر بەردەوامییان لە بەندکردنی شێخ مەحمود ئەنجامی باشی لێنەکەوەێتەوە و لەم سۆنگەیەوە بڕیاریاندا بۆ هێورکردنەوەی خەڵکی کورد شێخ بگێڕنەوە و بە سیاسەتی رۆژ بەرێخستن و چاوبەستی لەگەڵێدا بجووڵێنەوە هەر لەودەمەدا و ساڵی ١٩٢١ لە قاهیرە کۆنگرەیەك دەگرن و بڕیاری پێکهێنانی حکومەتێکی عەرەبی لە عێراق دەدەن و دانانی فەیسەڵی کوڕی حسێنیش بە مەلیك لێرە میس بێڵی هاوکار و داڕێژەری ئەم سیاسەتەی بەریتانیا جەخت لەسەرئەوەدەکاتەوە کە دەبێ ناوچە

کوردییەکان یان ویلایەتی موسڵ بلکێنرێت بەم دەوڵەتە تازەی عێراقەوە.

بۆیە رۆژی ۱۹۲۲/۹/۱۲ شێخ لە ئەسارەت دەگەڕێتەوە بەغدا و چاوی بە مەندووبی سامی و مەلیك فەیسەڵ و بەڵێنی زارەکی پێدەدەن کە حاکمی سلێمانی بێت، بەڵام ئەم لای خۆیەوە هەوڵ بۆ هەموو کوردستان دەدا لە زاخۆوە تا پشتی خانەقین وەك سەرچاوە جۆراوجۆرەکان ئاماژەی بۆدەکەن بەمپێیە لەگەڵ کۆمەڵێك ئەفسەری پلەبەرزی کورد. لە سلێمانیش وەك زەمینەخۆشکردنێك بۆ گەڕانەوەی شێخ لە ۱۹۲۲/۹/٤ ئینگلیز لەپڕ سلێمانی چۆڵدەکەن و هەموو کاروبار دەدەنەدەست شێخ قادری برای و لیژنەیەك کە لە مستەفا پاشای یاملکی، حەمەی ئەورەحمان ئاغا، عەبدولفەتاح چەلەبی، مەجید ئەفەندی حاجی رەسووڵ ئاغا، ئەحمەد بەگی تۆفیق بەگ پێکهاتبوو و مێجەر گۆڵدسمیس حاکمی سیاسیی پێشوو دەڕوات و نوئێل جێیدەگرێتەوە. رۆژی ۱۹۲۲/۹/۲۱ شێخ بە شەمەندەفەر دەگاتە وێستگەی کنگریان و لەوێوە بۆ کفری پێشوازییەکی گەرمی لێدەکرێت لەلایەن هەموو سەرۆکهۆز و کەسایەتیی ناوچەکە و خەڵکێکی بێشومار و بۆ ماوەی ۳ سێ رۆژ لە ماڵی سەید محسن ئاغا دەمێنێتەوە و لە سلێمانیشەوە وەفدێك دێنە کفری بۆ پێشوازی کە بریتیبوونلە مستەفا پاشای یاملکی، ئەحمەد بەگی تۆفیق بەگ، حەمە ئاغای ئەوڕەحمان

ئاغا، عیززەت بەگی وەسمان پاشا. لەوماوەیەی مانەوەیدا لە کفری شێخ دوو کۆنگرەی مێژوویی ئەنجامدا لەگەڵ سەرۆکهۆز و وەفدی شارەکانی کوردستان و چەندین بڕیاری گرنگیان دەرکرد لەوانە:

- دانانی شێخ بە مەلیکی کوردستان و دروستکردنی حکومەتی کوردستان.
- بەرز کردنەوەی سوپاسنامە بۆ حکومەتی بەریتانیا بەمبۆنەیەوە.

دواجار لە ١٩٢٢/٩/٣٠ شێخ دەگاتە سلێمانی و پێشوازییەکی زۆر گەرمی لێدەکرێت و حکومەتەکەی لە ١٩٢٢/١٠/١٥ پێکدەهێنێت کە ئەمیشیان چەند مانگێك دەخایەنێت و بەردەوام لەململانێدا دەبێت لەگەڵ کاربەدەستانی ئینگلیز لەلایەك و لەگەڵ بازرگانان و مونەوەرانی شار لەلایەکیترەوە و ئینگلیزەکان لەجیاتی دەستگیرۆییکردن بەردەوام کێشەی بۆ دروستدەکەن و سەرۆك هۆزەکانی لێهاندەدەن و ناوچەکانی لێدادەبڕن. هەڵبەتە حکومەتەکەشی ناکارادەبێت و هەموو سەرچاوەکان کۆکن لەسەر ئەوەی کەوا خەڵکێکی مشەخۆری هەلپەرست و پیاوخراپی کاسەلێس کە دەوری شێخیان دابوو لەپەنا دەسەڵاتەکەیدا گەلێك کاری چەوت و ناشایستە و دزی و راوڕووتیان دەکردەسەر خەڵکی بێگوناه و دڵسۆز و ئەڵبەتە کوژرانی جەمال عیرفانی منەوەری شارنشین لە ئاڵۆزیی ئەو دۆخە بەدەرنییە.

زێوەری شاعیر لەودەمەدا دەڵێت:

حەمدەن لیللاە لە دەوری بانی دێ ســـــــەنگەر نەما
ئەشقیا شەقبوو، شەققەی پێنجتیر و ماوزەڕ نەما
لازمە شوکری حکومەت کەن ئەهالی ســــــــەرچنار
گەندەدز لێفەفڕێنی ساڵی پێشووتر نـــــــــەما
چاکیکرد بۆ خۆی (مچیل) مرد و دووکانی شـــاردەوە
چونکە خۆبادان و دەستدانانی سەر خەنجەر نـەما

هەروەها حەمدی ساحێبقڕان کە لە ساڵی ١٩١٨دا خاوەنی "نەشیدی ئیستیقلال" دەبێ و کە دەبیستێ شێخیان بردووە بۆ شاری تانە و کوەیت لەشیعرێکدا دەڵێ:

کە ڕۆیشتی بەجارێ جەرگ و دڵ و هەناوم کـــــــەوت
کە چوویتە (تانە) تانە سەر گلێنەی هەردوو چاوم کەوت
ئەڵێن هاتوویتە کـــوێت قوربان، بڵێ قوربانی کوێتی کەم
کە نۆبەت بەرسەری نەحسی شکاوی بێکڵاوم کـــــەوت

بەلاّم پاش ساڵی ١٩٢٢ و نائومێدبوونی لە حوکمەکەی و لەو ئاژاوە و ڕەفتارەی دەستوپێوەندەکەی دەڵێ:

با لەناو خــــەڵکا ســـووئی زەن هــــەڵگرین

یەك بەیەك بین و عیبرەت با لەدووی ئەحوەل گرین

هەر لەبەر بەرزبوونەوەی ئەم کورد ژێرپێکەوتووە

دامەنی مەندووبی سامی پەنجەیی میس بێڵ گرین

وا لەزوڵمەتا بــــراگەل ئــاوی جاویدانی حەق

بۆ کەشفی دەستی منەوەر هەروەکو مەشعەل گرین

باعیسی فەخرە، ئەمیر ئیبنی ئەمیرە بۆ حقوق

دامــــەنی زیللی جیهانگیری مەلیك فەیسەڵ گرین

بەهەمانشێوە شوکری فەزڵیی شاعیریش وەك هەوڵێکی خۆی کە شێخ و حکومەتەکە بەرەوە هەڵدێر نەچن روویدەکاتێ و دەڵێ:

ئیش کە رووی لە هـــــەوارزە ســـەرەولێژی نەکەی

فکری وردیشی ئەوێ هەر بە دۆعا و نوێژی نەکەی

گێرەشێوێنێ کە کــای کۆنی بەبـــــادا لەکنــــت

چاکە هەر لێیخوڕی ســــەیری دەموکاوێژی نەکەی

سەرەتای ئیش هـــەمووی یەکبوونە ئــەویش نابێ

هەتا هــــــەر برینێك کە لەدڵدایە سارێژینەکەی

حەیفە چــــاوێك کە جەفا کۆڵەوژی پێدەشکــــان

تــۆ بە کلچێوکی وەفا عەینی گەلاوێژی نەکــــەی

ئەنجام (ڕۆژی ۳۰ ی مارتی ۱۹۲۳ قووەی هەوائییە شاری سلێمانیی بۆردمانکرد و شێخ مەحمود خۆی کوتایە شاخەکان). لێرە بەدواوە شێخ خۆی و هێزەکەی و چاپخانەکەی چوونە سووررداش و لەوێ لە ئەشکەوتی جاسەنە ڕۆژنامەی (بانگ حق) ی دەرکردو کەوتەشەڕی چەتەیی لەگەڵ هێزەکانی بەریتانیا و حکومەتی عێراقدا و پاش چەندین شکست لە ١٩٢٥/١١/٤ وەڵامی ئاشکرای بەریتانیا بۆ شێخ ئەمە بوو

"حکومەتی موعەززەمەی بەریتانیا قەراربوو عەزمی قەتعی کردووە کە دەبێت کوردستانی جنووبی لە داخڵی مەملەکەتی عێراقدا بمێنێتەوە".

سەرەنجام لە ۱۹۲۷/۱/۱۹ پاش فشارهێنانێکی زۆری هێزەکانی بەریتانیا و عێراق شێخ ناچاری ڕێکەوتنێك دەکرێت کە خۆی و خیزانەکەی لە گوندی وڵەژێر لە کوردستانی ئێران بمێننەوە و دواتر کردیان بە گوندی پیران هەرلەوێ، بە مەرجێك بابەعەلی کوڕی وەك بارمتە لە بەغداد دابنێ بەناوی خوێندنەوە و حکومەتیش موڵکە دەستبەسەرداگیراوەکانی بۆ بگێڕێتەوە و وەکیلێك ئیدارەی داهاتەکەی بکات.

شێخ و شەڕی ئاوباریك ساڵی ۱۹۳۱

پاش ئەو ڕێککەوتنە شێخ ئیتر لە ئێران مایەوە و پاش مۆرکردنی پەیمانی بەریتانی عێراقی ساڵی ۱۹۳۰و پشتگوێخستنی

تەواوی مافەکانی کورد و چەسپاندنی سیستەمی پاشایەتی لە عێراق و لکاندنی کوردستان بەو دەوڵەتەوە. رۆژی شەشی ئەیلوولی رەشی ۱۹۳۰ لە سلێمانی راپەڕینێکی جەماوەری بەرپابوو و خەڵکی تێداکوژرا و برینداربوو، بەمە جارێکیتر شێخ خۆی پێنەگیرایەوە و لە ۱۹۳۰/۹/۱۷دا یاداشت و پرۆتێستۆی دا بە کۆمەڵەی گەلان و مەندوبی سامیی بەریتانیا و حکومەتی بەغداد، بەلاّم وەلاّمی داوا رەواکانی خەڵك نەدرایەوەو بەپێچەوانەوە بە هەڕەشەی توند وەلاّمیاندایەوە کە نەگەڕێتەوە بۆ عێراق.. بۆیە ئەمیش لە ۱۹۳۰/۱/۹ خۆی گەیاندە پینجوێن و دواتر ناوچەکانی خورماڵ و شانەدەریی رزگارکرد و سەرباری لاسەنگیی هێزی ئەم و دوژمنەکانی خۆی گەیاندە گوندی ئاوباریك لە بناری گل لە گەرمیان و لە ۱۹۳۱/٤/٥ لەوێ شەڕێکی گەورەی پەرپاکرد لەگەڵ هێزەکانی ئینگلیز و (سوپای عەرەبیی) عێراق کە بەپاڵپشتی بۆردمانی هێزی ئاسمانیی بەریتانیا و پاش شەهیدکردنی ژمارەیەکی بەرچاو لە هێزەکانی شێخ و هاولاّتیان، لەوانە شێخ عەلیی قەڵبەزە و عەلیی ئەولاّ گوڵێ و چەندینیتریش، شێخ شکستدێنێ و بەناچاری لە ۱۹۳۱/٥/۱۳دا پاش کشانەوەی خۆی دەداتەدەستی حامیەی پێنجوێنەوە و نەفیدەکەن بۆ شارەکانی سەماوە و پاشان ناسرییە و عانە و دواتر لە بەغدا دەستبەسەردەبێت تا ساڵی ۱۹٤۱.

شێخ و هەڵاتنی لە بەغدا لە ساڵی ١٩٤١دا

لەم ساڵەدا بزووتنەوەی عەرەبە نەتەوەپەرستەکان کە سەر بە ئەڵمان دەبن بە سەرۆکایەتی رەشید عالی گەیلانی و چەند ئەفسەرێکیتر لە بەغدا کوودەتایەکی دژ بە ئینگلیز و مەلیك غازی بەرپادەکەن و لە بەغدا دەریاندەکەن بۆ ناوچەی حەبانییە. لەم پاشاگەردانی بێسەروبەرییەی بەغدادا شێخ مەحمود خۆی لە دەستبەسەری دەربازدەکات و بەهاوکاریی دەروێش حسێن کە دانیشتووی خانەقین دەبێ و بە ئۆتۆمبێلێك بەنهێنی لە ٢٠ ی مایسی ١٩٤١دا دەریدەکات بۆ خانەقین و لەوێشەوە ئەسپسواریێ دەیباتە لای عەزیز خانی برایم خان و پاشان لەگەڵ درویش سدیقی دۆست و دەروێشیدا لە گوندی فەتاحهۆمەرەوە دەربازیدەکەن بەرەو قەرەداخ و لەم کەینوبەینەدا حکومەتی عێراق پێیدەزانێت و فەرماندەکات بە بنکەی پۆلیسی سەرقەلاّ شوێنیانبکەون و بیگرن، ئەمانیش چەند پۆلیسێکی سوارەیان بۆدەردەکەن و لە گوندی پەلەوشك دەبێتەشەڕ و پاش ئەوەی ئەسپی پۆلیسێك دەکوژن خۆیان دەربازدەکەن و دەیگەیەننەوە گوندی (داریکەلی) و پاش بەینێك لێبووردنی بۆ وەردەگیرێت و لەوێ دادەنیشێت پاش ئەوەی بەڵێنی لێوەردەگرن کە نەچێتەوە شاری سلێمانی تەنها رۆژانی هەینی نەبێت بۆ نوێژی جەماعەت.

ئەنجـام:

شێخ مەحمود وەك کەسایەتییەکی جەربەزە و کاریزمی زۆری کرد بۆ کورد و بەپێی قەناعەتەکانی ئەم پیاوە لەو سەردەمەی مێژوودا و بەپێی هەلومەرجی سیاسی و کۆمەڵایەتیی ئەو سەردەمە هەر ئەمەی پێدەکرا و ناکرێت ئێمە لەئێستادا بە پێوەری ئەم چەرخ و رۆژگارە حوکمیبدەین، هەرچەندە لە دووبارەبوونەوە و بگرە چەندبارەبوونەوەی مێژووی کورددا گەلێ دیاردەی ئەو زەمان و سەردەمە لەئەمڕۆشدا خۆیان دووپاتدەکەنەوە. ئێمە ئەگەر بە چاوێکی واقیعبینانە و بابەتییانە بڕوانینە ئەو رۆژگارە کەوا چۆن بەرەی براوەی هاوپەیمانان خاکی ژێردەستی دەوڵەتی عوسمانییان لەبەینی خۆیاندا دابەشکردوە، بێگوێدانە خواست و ئیرادەی هیچکام لەو میللەتانەی بەر راستە و پڕگاڵی ئەم داگیرکارییە کەوتبوون، لە رێککەوتننامەی سایکس ـــ پیکۆدا بێگومان بەرژەوەندییە ئابوورییەکان و پێگەی جیۆپۆلیتیکی ئەو ناوچانەی بەر چەقۆی دابەشکاری دەکەوتن هۆکاری سەرەکیبوون.

لێرەدا جێی خۆیەتی پەنجە بۆ نەوت رابکێشین کە لە دوادواییەکانی سەدەی نۆزدە و سەرەتای سەدەی بیستەوە لەم ناوچەیە و وڵاتانی دورگەی عەرەبی و کەنداو و ئێران دۆزرابووە و وڵاتانی رۆژئاوا و کۆمپانیاکانیان لەهەوڵدابوون بۆ قۆرخکردنی گەڕان و پشکنین و دەرهێنانی نەوت، چەشنی کۆمپانا نەوتییەکانی دارسی و ئینگلۆ ـ

ئێرانی و کۆمپانیای نەوتی تورکی کە دوای پێکهێنانی دەوڵەتی عێراق بوو بە کۆمپانیای نەوتی عێراق، بەڵام کۆنترۆڵی هەر لەژێر دەستی بەریتانیا بوو، لەکوردستانیشدا لە خانەقین و کەرکوك و چیاسوورخ کۆمپانیاکان رووپێویی تەواویان کردبوو و بڕێکی زۆری نەوت دۆزرابووەوە و تەنانەت چەند بیرێکیش نەوتی لێدەردەهێنرا.

کارگەکانی سەرمایەداریی جیهانی پێویستییەکی هێجگار زۆر بەم کانزا بەنرخە هەبوو، هەرێم و وڵاتگەلێکی بەپیتیان دەستکەوتبوو وەك بازاڕ بۆ ساغکردنەوەی کاڵاکانیان و بێجگەلە نەوتیش کەرەستەی خاویتر زۆربوون بۆ وەگەڕخستن و پەرەپێدانی پێچکەی زەبەلاحی ماشێنی سەرمایەداری وەك لۆکە و دانەوێڵە و بەرهەمی گۆشت و شیری ئاژەڵ و دنیایەك کانزایتری غەیرە نەوتی. بێگومان ئەم سامانە گەورەیە پێویستی بە خولقاندنی دەوڵەتێك و سیستەمێکی تەواو ئەڵقەلەگوێی بەریتانیا بوو ئەمەش پاش توێژینەوە و شیکارییەکی زۆر لەلایەن کاربەدەستانی شارەزا و وریای بەریتانیاوە لە بارودۆخی ئەم وڵاتە کەوا گەلێکیان چەشنی سۆن و نۆئێل و ئەدمۆنز و میس بێلْ و چەندانیتر ساڵانێکی زۆر پێش جەنگی جیهانیی یەکەم لە دوورگەی عەرەب و وڵاتی عوسمانی و کوردستان و ئێراندا لەژێر پەردەی جۆراوجۆردا کاری بازرگانی و گەڕیدەیی و سیخوڕییان کردبوو و بەباشی شارەزای زمان و فەرهەنگی گەلانی ناوچەکە بووبوون و خاڵی بەهێزی و لاوازییان

دەستنیشانکردبوو و وەك هێلکەی پاککراو خستبوویانە بەردەستی بڕیاربەدەست و سیاسەتوان و نەخشەدانەرانی وڵاتەکانیان، هەروەها وڵاتانی کۆلۆنیالی پاشخانێکی چەندین سەدەییان لە سیاسەتی داگیرکاری و بەتاڵانبردنی سەروەت و سامانی گەلانی ستەمدیدە و دواکەوتووی وڵاتانی ئاسیا و ئەفریقا و ئەمریکای لاتیندا هەبوو، ئەمان لە مەودای مێژوویەکی دوورودرێژی داگیرکاریدا سەرمایە و ئەزموونی چەك و تفاقی پێشکەوتوو و هێزیان کەوتبووە لا و سەرباری هەموو شتێکیش لەجەنگدا براوەبوون و تەواوی چارەنووسی دنیایان لەدەستدابوو، ئەوی کە خستبوویانەگەڕ لە مەکینەی واتەوات و بەندوباوی ئازادی و مافی گەلان، چەشنی چواردە بەندەکەی ویڵسنی سەرۆکی ئەمریکا سەرجەمی دەڕژایە جوغزی داگیرکاری و پارێزگاری لە بەرژەوەندییە ئابووری و ستراتیجییەکان، بەتایبەتی کەوا بەرەوڕووی سیستەمێکی ئابووری و سیاسیی جیای سۆڤیەت و بەرەی سۆشیالیستی رووسیای دوای شۆڕشی ئۆکتۆبەر بووبونەوە و پلانی جوراوجۆریان دادەڕشت بۆ بەرەنگابوونەوە و لەقالبدانی ئەو سیستەمە کە لەو رۆژگارەدا تەواوی بەرژەوەندی و تەنانەت مانەوەشیانی خستبووە مەترسییەوە. سەبارەت بە کورد و راپەڕین و داواکارییەکانی بۆ مافی رەوای نەتەوەیی و مرۆڤانەی خۆی لەئاست بەریتانیایەکی کۆلۆنیالیستی ئەو رۆژگارە کەوا هەرگیز خۆر لە ملك و وڵاتانی ژێردەستی

ئاوانەدەبوو، دەکرا شێخ مەحمودێك کە رابەریی ئەو داواکارییە رەوایانەی کوردی دەکرد لەو ململانێ سەختەی هەڵپە لەسەر سامانی خاو و بەرژەوەندیدا لەوە زیاتر کە کردی چیتری پێبکرێت؟ کەسایەتییەك بەو پاشخانە کۆمەڵایەتی و ئایینییە و لەناو میللەتێکی شوانکارەی هەژار و نەخوێندەوادا چی بکردایە بێجگەلە برِواکردنێکی نیوەناچڵ بە چواردە بەندەکەی ویڵسن و لەسەر پەرِەیەکی قورئان بیاننووسێت و لەبازیبەندێکدا لە قۆڵی بکات! کەی لە فەرهەنگی سادەیی و ساویلکەیی کورد و سەرۆکەکەیدا بووە وەك ئینگلیزی قاڵبووی ئەزموونێکی پرِلە تەفرە و تەڵەکە رەفتاربکات! ئاخر ئەمان بە فەرهەنگی میللەتە سادە و ساکارەکان گفتیان گفتبوو، سەری خۆیان دادەنا و لێیپەشیماننەدەبوونەوە. ئالێرەوەیە ئینگلیز بە پێوەری بەرژەوەندییەکانی خۆی شەریف حسێنی حیجازی توورِهەڵدا و لەهەمانکاتدا بۆ پارسەنگرِاگرتنی سیاسەتە پرِلە پەناوپەسێوەکانی خۆی کورِەکانی هاوردەی ئیمارەتی شەرقی ئوردن و میسۆپۆتامیا کرد و کردنی بە "مەلیك"، بەڵام چۆن مەلیکێك، لە بازنە دەرنەچن و چییان لێبخوازرێ کوێرانە جێبەجێیبکەن. ئەوان ئەو تێکەڵە خەڵکە فرەنەتەوە و مەزهەب و ئایین و رەگەزەیان لەم قەوارەیەی بەناو عێراقدا پێکەوەلکاند بۆئەوەی هەم مایەی لاوازیی قەوارەکە بێت بۆ دەیان ساڵی دواتر و هەم فاکتەری بەهێزیی خۆشیان بێت لەجڵەوکردنیدا.

راستە شێخ مەحمود لەنێوان ئینگلیز و تورکدا ئەمسەروئەوسەری دەکرد و تا ماوەیەکی زۆر ناوچەکە بۆ هیچ لایەکیان ساغنەدەبووەوە و بەپێی تێگەیشتنی ئەو لە سیاسەتی ئەو رۆژگارەی زلهێزەکان و ململانێی بەدەستهێنانی دەستکەوتی زیاتر هەرئەوەندەی سەرلێدەردەکرد و ئەوان پێشتر بڕیاری خۆیان دابوو و ئەوندەیان لەم دەخواست بێقەیدوشەرت دەسکەلای ئینگلیز بێت و بەگژ تورکدا بچێت و ئەمیش هیچ ئاییندەیەکی مسۆگەری لەئاسۆدا بەدینەدەکرد و متمانەشی پێیاننەبوو. راستە ئەم پیاوە هیچی کەمترنەبوو لە میر و شێخەکانی دوورگەی عەرەب و خەلیجی چەشنی ئیبن سعود و ئیبن رەشید و میری کوەیت و کوڕانی شەریف حسێن کە بە کوڕنووشبردنەوە دەکەوتن بەسەر دەستوپێی کاربەدەستانی بەریتانیادا بۆ ئەوەی میرنشین یان قەوارەیەکیان بۆ پێکبێنێت و سەرەنجام لە بەختی ئەمان و بەرژەوەندیی بەریتانیا چارەنووس وایهێنا ببنە میر و پاشا و کانیاوی نەوت بیابانیان بۆ بکاتە گەوهەر، بەلاّم قەدەری شێخ مەحمود و کوردیش وایهێنا بەو بارەدا بکەوێتەوە کە دەیزانین. لێرەوە نەشتەری رەخنەی مێژوو لە شکستخواردوو گیردەکرێت و بە لۆجیکی پەندە کوردییەکە: (کە گلۆڵەت کەوتە لێژی کە خاست نایێژی)، هەرچی خەوش و ناتەواوییە دەدرێتە پاڵی. راستە شێخ و حکومەتەکەی زۆر لە کورتیان دا و لە ناتەواویی کوشندە بەدەرنەبوون و هەڵەی زۆریان کرد و

پێویستبوو بەجۆرێکیتر رەفتاریان بکردایە و لێنەگەڕانایە خەڵکی هەلپەرست و نەزان و نەفام جڵەوی کاریان بەوچەشنە قۆرخبکردایە و ئەفسەران و مونەوەرانی ئەو رۆژگارەیان پەراوێزنەخستایە و بەوپێیە رەنگە رەوتی رووداوەکان جۆرێکیتر بکەوتایەتەوە، بەڵام ئاخۆ هەر تەنها شێخ و داروودەستەکەی لەوە بەرپرسیارن یان رەوشەکە کاریگەرییەکی زۆری دووفاقیی ئینگلیزەکانی بەسەرەوەبوو و ئەوان سوودێکی باشیان لە نارێکی و ناتەبایی ریزەکانی کورد بینی، باشە کە بەم چاوەی ئەمڕۆوە بڕوانینە دوێنێی شێخ مەحمود و بەدرێژایی مێژووی نزیکەی سەدەیەکی خەبات و بەرخودان و راپەڕینی میللەتەکەمان چەندجار ئەزموونەکەی شێخمان لێدووبارەبووەتەوە، چەندجار بووین بە قوربانی بەرژەوەندییە نێودەوڵەتی و ناوخۆییەکان، تا چەند گیرۆدەی قەدەری بۆ ئێمە شوومبووینەتەوە کە ئەویش قەدەری نەوت و لەعنەتی نەوت و هەڵکەوتەی جیۆپۆلێتیکی وڵاتەکەمانە؟! من شێخ مەحمود بێبەریناکەم لە هەڵە و ناتەواوییە کوشندەکانی خۆی و بزووتنەوەکەی، بەڵام با لەبیرماننەچێ ئەو کەسێکی پەروەردەی فەرهەنگی رۆژگاری خۆی بوو، ئەمە پاساو نییە بۆ ئەو پیاوە، چونکە بەدرێژایی ئەم نەوەد ساڵە گەلێ لایەن و رووی ئەو مێژووە خۆی دووپاتکردووەتەوە و هەندێکیشیان دەقاودەق و کۆپیبوون.

پێموایە شێخ مەحمود ستەمێکی مێژوویی گەورەی لێکراوە و خۆشمان وەك کورد تائێستا هەر غەدری لێدەکەین و رۆژگارەکەی وەك خۆی چۆن بووە تێناگەین و هەمیشە بەدرێژایی سەردەم و رۆژگاری دواتر ئەنجام و شکستەکانیمان کردووەتە پێوەر و لەنەستماندا دەمانەوێ هەمیشە بیکەینە شەریکە بەشی شکستەکانی دواتریشمان و زووخاوی شکستە یەك لەدوای یەکەکانی خۆمانی پێبڕێژین. ئەمە نەك بۆ ئەو و بزووتنەوەکەی ئەو وابووە، بەڵکو هەمان رەخنە بەرەوڕووی ئەزموونەکەی پێشەوا قازی **محەممەد** و ئەوانیتریش بووەتەوە. بەهیوام چیتر رەخنە و شیکاریمان بۆ مێژووی دوورونزیکمان زیاتر بابەتی بێت و هەموو هۆکاری شکستەکانی رابەرانی پێشتری بزووتنەوەی رزگاریخوازیمان تەنها نەخەینە ئەستۆی خۆیان و لەهەمانکاتیشدا دەستی چەوری خۆشمان بە دەرەوەی خۆماندا نەسوین و بەردەوام خۆ بە قوربانی زانیش زیانی لە سوود زیاترە.

رەنگدانەوەی ناوبانگی شێخ مەحمود و خەباتی
له هۆنراوەی میللی و فۆلکلۆریی گەرمیاندا

ئەدەبی زارەکی و فۆلکلۆری ئاوێنەی بێگەردی رووداوەکانن و لای خەڵك هەستێکی سایکۆلۆجییه و تێکەڵی ژیانی مرۆڤ بووه، ئەدەبی فۆلکلۆریی کوردیش زۆر دەوڵەمەنده و به سەلیقەی میللی له بەیت و لاوك و حەیران و هۆنراوه میللییەکاندا له کەسایەتی و قارەمانان و ناودارانی میللەت دواوه و گەلێجار زیادەرەویشی تێداکراوه. ئەڵبەته مێژووی میللەتێکی وەك کورد لەرۆژگارێکدا که نەخوێندەواری باڵی بەسەر ژیانیدا کێشاوه بەیته فۆلکلۆرییەکانی گۆرانی و مەقام و هۆره و لاوك و حەیران تۆماری مێژووی بوون و هەست و سۆزی دەربڕیون و رەنگدانەوەی باری دەروونی و کۆمەڵایەتی و ئابووریی سەردەمێکی ژیانی بوون و بێگومان گەلێ لایەنی مێژووی ئێمه تائێستا نەنووسراوەتەوه و تەنها له دووتوێی هونراوه فۆلکلۆرییەکانەوه که پشتاوپشت دەوترێنەوه شتێکی لەبارەوه دەزانین.

بەدرێژایی مێژوو میللەت یادی ناوداران و کەسایەتی و قارەمانانی له وێژدانی خۆیدا پاراستووه و بەحوکمی ئەو زوڵم و ستەمەی بەدرێژایی رۆژگار لەسەری بووه و هەمیشه وڵاتی شەڕگای رۆم و عەجەم بووه و بەردەوام رەشەخەڵکەکە لەژێر چوارناڵەی لەشکر و

سوپای هێزە بیانییە داگیرکەرەکاندا بووە و هەردەم ماڵوێرانی و ئاوارەیی بەشی بووە. لەمڕووەوە لە بەرەنگابوونەوەی ستەمدا مەسەلەی یاخیبوون و چەتەیی و جەردەیی پانتاییەکی زۆری لە ژیانی کوردەواریدا داگیرکردووە و زۆرێك لەو بەرەنگارییانەش خۆڕسکبوون و لەناوەڕۆکدا بەگژداچوونەوەی ستەمبوون. لەمڕووەوە ناوی کەسانی یاخی لە زوڵم و ستەمی وەك حەمە تاڵی بانە و سەید عەتا و خولە پیزە و مەجید شانشینی و ئاغا شڕەی یەناخی و چەندانیتریش لە ئەدەبی زارەکیدا دەدرەوشێنەوە و لە ویژدانی میللەتدا رەوایی دەدرێتە یاخیبون و شەڕوشۆڕیان. وەك نمونە بڕوانە هەندێك لەم کەسانەو ئەگەر ئەمە حاڵی ئەوانە بێت کە وەك باو ناویان بە جەردە و چەتە رۆیشتووە لەکوردەواریدا ئاخۆ رابەران و قارەمانانی بزووتنەوەی رزگاریخوازی چ سەدایەکی بووبێت:

بێژن وەدایکی خۆی بگرێ لە لیـــل
مەیتی باقی خان گەییە سوورخەلیل
بێژن وەخاسێ پووشین شین نەکـــــا
لەدوای مێردەکەی شوو وەکەس نەکا
بێژن وەدایکی خۆی بگرێ لە نەوت
مەیتی سەی عــەتا لەمەیانا کەوت

بێژن وەدایکی خـــۆی بگرێ لە قوڕ

تازە ســـــەی عەتا بۆی ناوێ وەکوڕ

بێژن وەخـــــــاسێ سیغارنەکێشێ

لەچکە پەشمەکەی لە خوم هەڵکێشێ

بێژن وەلــــــــەیلێ نەوێ وەتەمام

شەوسوو ئەم حەلە ئەمکەن وەنەمام

خـــــوا نەمکوژێ زەوی نەمدزێ

بەردەچـــەرموو ئەگرم سـنە بلەرزێ

بە تــــــفەنگی بڕنەو بانە چۆڵەکەم

ئەم شەڕە لەســـەر کێش لە کۆڵەکەم

چەتەیی خۆشە بن بــەرد وەبن بەرد

وە تفەنگی بڕنەو ســـــتارخانی زەرد

خۆ تــۆ بڕنەو نیت بتدەم وەشـــــانا

بتدەم وەگــژی رووس و ئەڵمـــــــانا

دەس دام وەی تفەنگ ناو کەژی قەدیم

لوولەی ســافوسڕ قۆناخ زەڕ لە سـیم

وەســەرگەردت وم لەعلی گوێ باخچە

سەر وەمشکی مۆر قەد وەدەمانـچە

تفەنگ بکە شان رەزن بوەســە پشت

دوژمن بەدبەختە خۆت مەدەوەکوشت

خوا نەمکوژێ زەوەی نەمــــــوزێ

بەردەچەرموو ئەگرم ســـنە بلەرزێ

عەشرەت براگەل تەقەی پای ناڵ تێ

شۆڕسوارێکە شەو وەشـــــــەماڵ تێ

هەر خۆم وەقوربان هەلەومەملەکەت

فیشەك چەپ و راس دەوری کەلەکەت

گەردن میناوەن لێوت گوڵبــــــاخی

وەچاو قەدەمخێر لە ئێران یاخی

وەچرا گەورەکەی ماڵ حەمە رەشید خان

عەسر ئەگڕیا تا دەمەوبەیــــــــــان

شێخ مەحمود لە هۆنراوەی فۆلکلۆری و ئەدەبی سەرزارەکی میللیدا جۆرە مافێکی دراوەتێ، پێچەوانەی ئەو غەدرەی کە لەمێژوودا لێیکراوە وەك شکستخواردوویەکی پێش هەموولا لەلایەن گەلەکەی خۆیەوە، ئەو لە بەیت و حەیرانەکانی دەشتی هەولێر و لاوکی بادینان‌دا و بەتایبەتی لای کاویس ئاغا زۆر جێی سەنا و ستایشە و هەرچەندە ئەم بەشەیان جێگەی ئەم باسەی ئێمە نییە، بەڵاّم وەك ئاماژەیەك کەمێك نموونەیان لێدەهێنمەوە:

دەلۆیلۆ دەلۆیلۆ دەلۆیلۆ دەلۆیلۆ

ئەزێ ئەڤرۆ هەوار بکەم، هەوارە تورکە، برانۆ کورد خائینۆ

دەلۆیلۆ دەلۆیلۆ دەلۆیلۆ دەلۆیلۆ

دەلۆیلۆ دەلۆیلۆ شێخ مەحمودێ من

زەری ل چیایێ سورداشیێ، کانی وەردە خەلەکانیێ

بەژنا شێخ مەحمود، کەکێ شێخ قادر، بابێ لەتیف،

نەباتا تاکێ رووخانیێ

شێخ مەحمود ب سێ دەنگا گازی دکەن

کەریمێ فەتاحێ ب گەلی عەگیدا، بۆ من دەست هەلاتەکێ بکە،

ئەڤە سێ رۆژە، دەمێ ئاسێ بین، ل چیایێ سورداشیێ.

یان لەشوێنێکیتردا واهاتووە:

بابێ بابم شێخ مەحمود لەگەر دەزگای داینایە

بەخۆی لە داریکەلی، خێوەتی لێهەردایە

کەریمی فەتاح بەگی، عەسکەری تەعلیمدایە

حەمەی سەید سەلیمی لەدەوریدا سووڕایە

بابێ بابم شێخ مەحمود، تو سەرکردەی کوردانی

لۆی دێ نۆ تابوور عەسکەر لە شاری سولەیمانی

شێخ مەحمود دەبتە مەلیك خودا بەخۆی دەزانی

بابێ بابم شێخ مەحمود، بەخۆ و بە سێ ئامۆزا

لۆی هات دوو تابوور عەسکەر، بە تۆپ و مەترەلۆزە
شێخ مەحمود قوماندار بی، دنیا نابیّ ئارۆزە
بابی بابم شێخ مەحمود، لەگەڵ دەزگای داینایە
خۆی لە چیای سورداش و ئۆردوگای لە سەحرایە
چەند قارەمانی جەوهەردار و قوماندار لەگەڵدایە
کەریمی فەتاح بەگی، عەسکەری تەدریبدایە
لە عەسکەری دەخوڕی، ئیستاعید راوەستایە
بەیتەکانی گەرمیان و شێخ مەحمود

نموونەی هۆنراوەیەکی شاعیرێکی میللیی گەرمیان، کە ناوی مەلا ئەحمەدی زەنگنە بووە لەسەر شەڕی ئاوباریك، هۆنراوەکە لە دیوانێکی دەسنووسیدا لای مەلا عەبدولقادری کوڕی پارێزراوە:

سوپای شێخ مەحمود وەقتیّ زاناشان
دوژمن داخڵبی وەرەزمەگاشـــــــان
وەئاواز بەرز فەریق کەرد ســەدا
ئەلبیسەی ژنان مەکەن وەوەردا
عەبدولکەریم نام ئاغای زەنگەنە
مەشهورەن چەعام ساحێب نگینـــــە

محەمەد زادە ئەسڵ و نەسەبخاس
حەملە مەوەردەش وە چەپ و وەراس
جەنگش ئەو جەنام عالەم مەشهووربی
جان و سینگەی ئەو دایم مەعموربی
یەك شێخ رەشید نام برای شیخ فەریق
جەپەنها ئەڵڵا تەوفیق بی رەفیق
غیرەتکێشی کەرد جەپەنهانەوە
سێ نەفەری کوشت جەکۆلانەوە

ئەم بەیتانەش شاعیرێکی میللی وتوویەتی لە سە شەڕی ئاوباریك و لە مام چاوشین زەنگنەوە وەرگیراوە:

باران ئەواریێ تەرزە ئەخشێ
گولەی شێ مەحمود دوژمن ئەکوژێ
تەیارەچەرموو بانەوبان ئەکا
بۆردمان مەلیك کوردسان ئەکا
لە شەڕ ئاوباریك دوژمن شکاوە
ناوی شێ مەحموو تەنیا لەناوە
هەردوو ئەولکەریم ئاغای زەنگنە زوان

بوونە پشـــــتیوان مەلیك كوردســـتان

چاوشــــــینە درێژ وەك شێری مەیدان

ئـــــازا و مەردانە ماتلی كردە شـــان

ســــــــەنگەری لێدا لەنـــاو قەورسـان

هــــەروەتەنیا خـــۆی دوژمنی شكان

تەقەی ترەقە چــرپەی ئەســــــپەڕەش

شێ مەحموو خستی لەش لە بانی لەش

ئەوا ئۆردوو هــات بە پێنج و بە شەش

كوانێ شێ مەحموو سواری ئەسپەڕەش

دەقی بەیتە فۆلكلۆرییەكان:

شێخم شـــێخ نییە قـــاقـــانی چینـــە

ئـــــەڵقەی بەرمەجلیس كورسی نشینە

یا خـوا شــێ مەحموو بە گوڵە ژاڵە بی

دایم لە ســـونحی چواردە ســــــاڵە بی

پیـاڵە و ژێرپیاڵە تــــــەختەكەی زیوە

خۆزگەم بەو كەسە شێ مەحمووی دیوە

تەیـــــــــارەچـەرموو بـــــانەڵبان ئەكا

داوای مـــــــەلیکی کوردســـان ئەکا

یا هـــوو یا مەن هوو مەل وەحەواوە

کۆڕی زیـــــکری تێ لەڕێی بەغـــاوە

قـــەلاێ هەورامان پلـــەپلـــــــەیە

لەسەر شـــــێ مەحموو شەڕەخەنجەرە

یاخــــــوا شێ مـــەحموو باوتبێتەوە

لەگەڵ شێ قـــــــــادر ئاشتتبێتـــەوە

ئەوا ئۆردوو هـات بە پێنج و بـــەدوو

کوانێ شێ مەحموو ســـاحێبی ئۆردوو

ئەوا ئۆردوو هات بە پێنج و بە شەش

کوانێ شێ مەحموو سواری ئەسپەڕەش

ســـوار سواربوو چـرپەی ئەسپی رەش

کوشـتارێبکە لــــەش لە بانی لـــەش

پیـاڵە و ژێرپیاڵە تەختەکـــــەی زیوە

خۆزگەم بەو کەسە شێخ مەحمووی دیوە

ســەماوەری زەرد دەســـــکەکەی زیوە

رەحمەت لەو دایکە شێخ مەحمووی دیوە

یا شێخ مـــــــەترسە بۆمبا هیچ نییە

حاجی کـــــــاك ئەحمەد لێتغافڵ نییە

ئەوا مـانگ هەڵهات دای لە ترشەکان

مـــەلیك ناندەخوا، لەگەڵ ئایشە خان

ئەوا مانگ هەڵهات دای لەسەر سینی

مــــەلیك نانئەخـــوا لەگەڵ ئەفەنی

تەیارە هـــاتووە حــــــاجی لەقلەقە

بەری ئــــــــــاوێنە پشتی مەفرەقە

هەی داد هـــەی بێداد نەمەنەن هۆشم

شێخ مەحمود یەخسیر بۆیە رەشپۆشم

هەر خۆم وەقوربان مشکێکەی سەرت

گولە کاریـــکرد لە شوێن خەتـــەرت

تەیارە رەشــــــــەی لانەولان ئەکـا

نۆدێ و گــــــەورەدێ بۆردمان ئەکا

تەیارە هاتـــووە بە پێنج و بە شەش

بۆردمانیکرد بـــــەر ئەشکەوتەڕەش

کوڕگەل مەترســــن بۆمبا هیچ نییە

حاجی کــــاك ئەحمەد لێیغافڵ نییە

بابۆی شێخ لـــەتیف، زەعیمی کوردەن

وەرانوەر دوژمـــن، وەدەس و بوردەن

ئاخم پـــەرێ شێخ، بـــەند و یەخسیرەن

چەشـــــــــارێ بەغدا، دەس وەزنجیرەن

دەر چەپان دەرد گشـــــت دەردێ کاری

چەوەڕای تووبیم کـــەی تەشـــریف باری

دڵ کـــــووچە نییەن دەروون شار نییەن

کەس چـــەدەرد کـــەس خەوەردار نییەن

بـــــالاکەت بەرزە نە کـــــوڵ نــە درێژ

خۆزگەم بەو حەوزەی لێیئەگری دەسنوێژ

داڵەمێز عاجز پیر رۆســــــــــەم ماتە

ساقی لوول و تەڕ نەرگز بــــــــالاتە

قەسەمخواردووە قەســــــەمخوار بووگم

وەچاوەکانت گرفتـــــــــــار بــــووگم

وەفوای بـــــــالات بم گەردن زەردەکەم

بەفری لانزار هــــــــــــەرەسکەردەکەم

هەســـــارەی عاسـمان گشتی خەمبووە

هەســـــارەکەی من شـــەوقی کەمبووە

ســـوار سـواربوو لـــــە هەردە و چیاوە

پێســـەی پڵنگ وەبــــــان زینی تەلاوە

سـیروان هـــاتووە وەبـــەرزیی داران
ئەدا لە چـــەکمەی شـــۆڕە سواران
قـــەزات لە مـــالّم قەزای قشلاّخی
ئاو لە شەتاو خۆر لـە حوکمەت یاخی
دەشتی شـێروانە داچێـــــــنم بە جۆ
لەبەر خـاترەکەی مایـــنە بۆرەی تۆ
سوار ســـــواربوو بەر لـوولەی مەلەل
وەخێر بێیتۆ ســـــەر دەلیلـەی گەل
زێن و نـــەرمەزێن لەقـــاو مرواری
شـــــێخم بانگئەکا بۆ بەرســواری
هەر خۆم وەقوروان تووکی تەکمەت وم
بریقەی فـەقیانەی سەری چەکمەت وم
سوار هەی ســوار لەشکـــر وەلەنگەر
دەسەی بۆرەســوار خۆی دا وەسەنگەر
لەشکر شـــــەڕئەکا ملــە وەملــە
جواو بنێرن بێت بــــارووت و گولـە
تفەنگ بکەن شـــان ڕەزن بوەســە پێڵ
دوژمـــن بەدبەخـــتە نەتکوژێ وەفێڵ

دەس وەدەسەســـــڕ سەوز و دێزەوە
شـــان وەتفـــەنگ نوقرە ڕێـــزەوە
ســـیروان هاتووە وەبەرزیی بییەکان
ڕێگەی بـــڕیوە لە تفەنگچییـــەکان
ســوار خۆم وەقوربان سواربوونت بام
پا لە ئاوزەنگی دڵ لە قینـــــت بام
هەڵکێشە خنجێر دەبانـی دەمڕەش
بیدە لـە دڵەکەم بیکە بە حەو بەش
هەڵکیشـــــــە خنجێر وەکێلانەوە
جـــــــەرگم ببڕە وەئێســـقانەوە

ســــــــۆزی دەروێـــش

شێخم شێخ نییە قاقـــــانی چینە
ئەڵقەی بەر مجلیس کـــورسی نشینە
کزەکزمە چۆن گۆشــــــت وەچۆوە
هەر ئەینەڵ هەقمە تـا ڕۆژ مەبۆوە
تۆ لە سلێمـــــانی ماڵت کردە ماڵ
منیش والێرە بوومــە کۆی زووخاڵ

مـایـنـەکـەت بــــۆرە رەختـەکـەی شیلان
کـەمـەنکێشت کـــرد شیعە لە تاران
هــــەورێ هاوردی رووی عـاسمان تاڵە
یا شـــــێخ هاوارە تـەکێ بەتــــــاڵە
هەر خـــۆم وەقوربان شێخی پڕکەماڵ
سێنگ بەحـری نوورین پڕ لە دای لاڵ
هەر خۆم وەقـــوربان شێخی بەرکەماڵ
سەما و سەرزەمین بوو بەکۆی زووخاڵ
زڕەی مـــــــاینەکەت بکە وەمـلاوە
پـــــەردەی ســـــیایی لەم دڵمە لاوە
وەفـــوای بـــالآت بم لە دوورۆ هاتی
وەك مـانگی چواردە لە کەل دەرهاتی
هەناســـەکەی من دای لەســەر بەرزان
دای لە پـــیرەدار زووخاڵ کرد هەرزان
وەلای کێ بووەم باوکە شێخ دایی خەمانم
کێ مەڵهەم بکا لــە ڕووی زامــــــانم
شێخم شـێخ نییە وەك شــــــۆڕەبییە
هەرچـــەن زەین ئەکەم لە وێنەی نییە

شێخم شـــێخ نییە وەچڵێ گیـــاوە
دەسی واوەدەس غـــەوزی بـەغاوە
بدە لـــە تـــــەپڵ لـــە دەرەڕاوە
لەشکر تیپی بەـــست بە ورد و شاوە
ســەرێ لەڕێی تــۆ بەردەواز نـەوێ
حاشـــا لەو سەرە من قەت نامەوێ
کۆتـــــرەی دارەوەن پـــایز بڕیـــاوم
شـــــەو تا بەیانی پـەی تۆ گڕیاوم
وەی هەناسـەکەم دەرمەچوو دەم دەم
پـەڕاو شینمە کرد بێستوون کەم کەم
تــــەمە دوکەڵە ســـەرکێوە هەردە
خەمە مەینەتە ســـــــزایە دەردە
سەر بێرە وەدیار شــــایی مەرگەکەم
دەسبکێشە بان سپی مـــەرگــەکەم
ئاگـــــرێ ئەگـــڕی وەزمنـــاکـۆوە
ئەو ئـــــاگرە من بووم وەبۆنەی تۆوە
قەزات لە مـــــاڵم دەردت لە کێوان
زەرەر نەبەری وەدەســـــــــی دێوان

لەکەل هـــــــاتەبان وامزانی خـــۆرە
نەمزانی شێخم مشکێکـــــەی مۆرە
هەر کەس شێخو من وەشـێخ مەزانۆ
بەڵکم بایــــــەقوش جـــەیانەش وانۆ
ســــەرێ بەرزۆکە روو لە بـێروون کە
ســــەیری قرچە قرچ پیرە دەروون کە
ئیمڕۆ لە رۆڕۆی دڵەی ناشــــــــادم
شێخی دوور وڵات کـــەوتووەتە یادم
خۆ من پـــــــیربووم کـــۆڵ بەکۆڵەوە
پاڵم دا وە پـــــــــاڵ تەکێی چۆڵەوە
دەردێکم گرتووە شـــــای دەردەکـــانە
لــــوقمانی حــــەکیم لێیسەرگەردانە
نەزان و نـــەفام مــــن هیچ نازانـــــم
هاتمە مـــــــەدرەسەت قـــانوون بزانم
خۆ من دەروێش نیم بـــــۆت تالوقاتم
خوا بۆمبکا مــن جانفیداتـــــــــــم
لەســــــــــەر کلاوان خۆزگە بازیـــیە
راگەی شـــــــــێرانە جێی شانازییە

دیسان شکیاوە شـــووشەی مەیـنەتم
دنیام چــوو لـــەدەس هەم قەیامەتم
جبەی قـاقانی هەڵکێشە لــەبـــەر
دەروێش دەروێش کە ئەچی بۆ سەفەر
ئێران و تـووران وەسپ و ســەناتەن
گەردنە زەردەکـــەت لە عالەم تاکەن
قەزات لە مـــاڵم شێخی هەیکـەلی
ئەولایی ئەحـــــمەد نەتەوەی عـەلی
بدە لە تەپڵ وەك جـــاری جـــاران
دڵ بووە بە نەرگس ســـاڵی بێباران
مەڕوانە رەنـــگم رەنـــگم هەرواسە
بڕوانە دڵەکــــــەم وێنەی پــەلاسە
دڵەکەم هــــەڵدڕە وەنـووکی نەشتەر
هیچی تیانییە لە زووخـــــاو بەتەر
بۆ لای کـــێ بـــووەم دایی خەمانم
کێ بیکا تیمار لە ڕووی زامـــــانم
یاخوا لەدوای تۆ چەرخ چەمەر بــێ
نە شەوقی مانگ و نەزەردەی خۆر بێ

سەنگێ لەو سـەنگە بکەم وەسێوەر
پاڵی پێـــــوەدەم وەرەنجی بێوەر
ئێوارەوەختە جوابــێ ژنـــــەفتم
لە کەل هەڵدێریام لە کەڵوەز کەفتم
دەسم لێمەدەن جـــەستەم خەستەیە
با نـــەکولێتۆ مارانگەســــتەیە
سووتیام و برژیام بووم بە قەقەنەس
گەردم با بردی پێینەزانی کـــەس
ئەترســـــــم بمرم داخ لەدڵم بێ
خاکی عەرەبســـان ئاو و گڵم بێ
نە وەرۆژ ئارام نە وەشـەو خەومەن
چو نەی چەم گل کـەرد گلاراومەن
نـەدەردم وێنەی دەردەدارانـــــــە
نـــە زامم چون زام گەستەی مارانە
یاخوا کەس وەك من نەکەوێ کۆسی
نەڕوانێتە چـۆڵ هەوارەی دۆســـــی
ئاگرمـــــــگرتووە وەك پیرەداران
ناکوژێمەوە مـــــەگەر بە بـــاران

من و قەلـــەڕەش کردمانە گـــرەو
ناوسکی مـــن رەشتر لەسەر باڵی ئەو
هـــەر تەمـــــێ لەبان کێوێ ساکنە
ئـــــەوە تـــەم نییە هەناسـەی منە
شەماڵ توو مەیە من خۆشـــم نییە
سەرچاوەی غەمان لەلام جـــەم بییە
خەڵکی خەمسێنە من خـەمفرۆشم
هەروەك سـەماوەر دایم لە جۆشـــم
توو مەڕۆ مەڕۆ با خۆم بگەیەم پێت
بزانم ئەو گـــوللە لەکوێ داییەلێت
دەرمان دەردەکـەت لە سلێمانـــییە
دەرمان دەســـــناکەوێ ماڵویرانییە
خەم نان و خەم بەرگ خەم توو برامیت
وەهەرکوێ بچم رەفیقـــی رامـــــیت
دەسە سوارەکەی ماوت پۆشـــم ڕۆ
هەم والی چین و هــەم سەرکەشم ڕۆ
دەنـــگ تێ دەنگی پـــانـــاڵ تـــێ
دەنگ شۆڕەسواران شەو وەشەماڵ تـێ

دەنـــگەکەم نایکا بۆتبێژم بەدڵ
کێوان گڕبگرێ شەتاو بێتەکـوڵ

●●●

## سەرچاوە

بۆ نووسینی ئەم باسە تێکڕا سوود لەم سەرچاوانە بینراوە:

١) مەحمود مەلا عیزەت: حکومەتی کوردستان لەناو مەتەڵی سیاسەتی بەریتانیادا (١٩١٨-١٩٢٤)، سلێمانی/ بنکەی ژین، (٢٠٠٦).

٢) یادنامەی شێخ مەحمودی حەفید، سلێمانی/ بنکەی ژین، ساڵی (٢٠٠٦).

٣) شاری کفری لە تەرازووی رەسەنایەتی و شارستانییەتدا، سەلاحەدین عەبدولحەمید، چاپخانەی رەهەند/ سلێمانی/ ٢٠١٢ چاپی دووەم.

٤) حەمە رەشید خانی بانە (١٨٩٨- ١٩٧٤) نووسینی (کەیوان ئازاد ئەنوەر)، سلێمانی، ساڵی (٢٠٠١).

٥) هۆنراوە و چیرۆکی فۆلکلۆری کوردەواری/ بەرگی یەکەم کۆکردنەوە و ئامادە کردنی: **محەمەد** حەمە ساڵح تۆفیق، سلێمانی، ساڵی (٢٠٠٠).

٦) گەرمیان.. رابردووی نزیك و ئاییندە، شێخ **محەمەد** شاکەلی، سلێمانی، چاپخانەی کارۆ، / ٢٠٠٣.

٧) هەڵبژاردەیەك لە هۆنراوە و فۆلکلۆری کوردی ناوچەی گەرمیان بەرگی سێهەم/ کۆکردنەوەی: ابراهیم باجەڵان و هەردەوێڵ کاکەیی، سلیمانی، ٢٠٠٤، چاپخانەی شڤان.

٨) (١٩١٧- ١٩٢٦) "Gertrud Bell " Letters دەسنووسە و لەلایەن نووسەرەوە وەرگێڕدراوە و ئامادەیە بۆ چاپ.

٩) المس غيرترود بيل : فصول من تأريخ العراق القريب ترجمه: (جعفر الخياگ) (١٩١٤ - ١٩٢٠).

١٠) چەندین کەسایەتیی بە ساڵداچوو و گۆرانیبێژ و بەیتخوانی ناوچەی گەرمیان.

## لە یاداشتەکانی دەورێش حوسێنەوە
## رزگارکردن و هێناوەی شێخ مەحمودی حەفید
## لە بەغداوە ساڵی ١٩٤١

**ئیبراهیم باجەڵان**



وەکو ئاشکرایە لەلای شارەزایانی مێژووی کورد و بزووتنەوەی رزگاریخوازی گەلی کوردستان رۆڵی شاری (کفری)و دەوروبەری لە ئامێزگرتن و خزمەتکردنی کوردایەتی بەهۆی پێگەی جۆگرافی و ستراتیژی ناوچەکە و کوردپەروەری و دڵسۆزی دانیشتوانەکەیەوە بەتایبەت لە سەردەمی شۆڕش و راپەرینەکانی شێخ مەحمودی حەفید لە سەرەتای سەدەی بیستەم بێگومان ئەوەی زانراوە و نووسراوە سەبارەت بە گەڕانەوەی شێخ مەحمود لە دوورگەی (هەنگام و کوێتەوە) لە سەرەتای بیستەکانی سەدەی رابردوو گەڕانەوەی بۆ کوردستان و هێنانەوەی بەمەبەستی دامەزراندنی بە حوکمدار وپاشان بە مەلیکی کوردستان

یەکەمجار کە بە ئاهەنگێکی شکودار و بەخۆشی و شایلوغانەوە، مانەوەی لە کفری بۆ ماوەی سێ ڕۆژ لەو گەڕانەوە مێژووییە کە چەندین بابەتی لەسەر نووسراوە، بەڵام ئەوەی کە کەم کەس دەیزانێ گەڕانەوەی دووەمیەتی بۆ کوردستان بەنهێنی و بەهاوکاری چەند کوردێکی قارەمان و دڵسۆزەوە دیسان لەڕێگەی کفرییەوە کە بە سەلاحییە ناوهێنراوە، ئەم گەڕانەوەش لە ڕۆژگارێکی سەخت و ناهەمواربووە لە مێژووی کوردا، مایەی شانازیمە کە لەگۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ ژمارە ١٢١ مانگی ئازار ساڵی ١٩٨٩ لە بەغدا بلاۆکرایەوە، دەنگدانەوەیەکی باشی هەبوو دواجاریش لەگۆڤاری سیروان ( ژمارە ٧ پایزی ٢٠٠٩) بلاۆکرایەوە لەگەڵ چەند زانیارییەکی نوێ کە لە پاش رزگاربوونی خانەقین دەستمکەوت بەپێوستمزانی لەم دیدارەدا بیخەمەبەر دیدی ئامادەبووان و خوێندەواران وەکو بەڵگەیەکی پرشنگدار و مێژووی کورد و کوردستان، لە بەرواری (٣) مایس ١٩٣١دا شێخ مەحمودی حەفید لەژێر کاریگەری ئەو بارودۆخە ناهەموارە تێیکەوتبوو بڕیاریدا بەیەکجاری واز لە خەباتی چەکداری بهێنێت و پشووبدات،

لە ١٤ی مایسی هەمانساڵدا شێخی حەفید لە گوندی پیرانی کوردستانی ئێرانەوە گەیشتە شارۆچکەی پێنجوێن و ئەوجا لە پاش گفتوگۆیەکی دوورودرێژ لەگەڵ (کاپتن ڤیڤان هۆڵت) نێردراوی مەندوبی سامی بەریتانی لە بەغدا بەئامادەبوونی موتەسەڕیفی سلێمانی

( ئەحمەد تۆفیق بەگ) شێخ خۆی تەسلیمی میری کرد، ئیدی لەلایەن خەڵکی دەڤەری پێنجوێنەوە وپاشان لەلایەن جەماوەری سلێمانییەوە فرمێسکی گەرمی بۆ ڕێژاو دەستەکانی ماچکران و بەسۆز و حەسرەتەوە مالئاوایلیێکرا.

بەوجۆرە شێخ مەحمود ڕەوانەی بەغدا کرا و لەوێشەوە بۆ ناسرییە و دوایی بۆ سەماوە و دواتریش بۆ عانە دوورخرایەوە.

ساڵی **١٩٣٣** جارێکیتر ناردیانەوە بەغدا و لەوێ بە دەستبەسەری و خانەشاری ساڵانێکی بردەسەر، لە ٢٠ی مایسی ١٩٤١دا شێخی حەفید بە قۆستنەوەی بارودۆخی (هەراکەی ڕەشید عالی گەیلانی بزووتنەوەی مایس) دەرفەتی هەڵهاتنی لە بەغدا بۆ هاتەپێش و ئەوجا لەپاش سەفەرێکی دوورودرێژ بە چەندین ناوچەدا بە سەلامەتی گەینرایە شوێنی مەبەست (سیتەك).

ئەوەی مەبەستمانە لێرەدا باسی رزگارکردنی شێخی حەفید و هێنانەوەیەتی بۆ کوردستان کە ئەنجامدەرە سەرەکییەکەی کەسێکی جوامێر و کوردپەروەری خەلکی خانەقین بووە بەناوی (دەروێش حسێن) وەك لەمیانەی یاداشتێکی تۆمارکراوی خۆیدا بۆمان بەجێماوە.. جا بەرلەوەی یاداشتەکە دەقاودەق وەك خۆی تۆماربکەین، وا پەسەندە تیشکێك بخەینەسەر ژیاننامەی خاوەنەکەی.

حسێن کوڕی عەبدوڵڵا کوڕی شوکری کوڕی عەزیز کوڕی میرزا ساڵی ١٨٩٤یان١٨٩٥ز لە سنە هاتووەتە دنیاوە و بە منداڵی لە (حوجرە) خوێندوویەتی، پاشان بە فەقێیەتی چووەتە سلێمانی و لەوێ بە (فەقێ حسێن) ناسراوە لە تافی لاوێتیدا هاتووەتە شاری خانەقی و دەستیداوەتەکار و کەسابەت، لە ساڵانی نێوان ١٩٣٥-١٩٤١دا لە کۆمپانیای نەوتی چیاسورخ (لە سنووری قۆرەتوو) بووەتە کانتینچی – دوکاندار و خواردەمەنی و خەڵووزی فرۆشتووەتە کارمەندانی کۆمپانیاکە کە بەڕێوبردنی بەدەستی ئینگلیزەوە بووە، پاش پەککەوتنی کۆمپانیاکە، گەڕاوەتەوە بۆ شاری خانەقی و لەوێ دوکانێکی فرۆشتنی کەرەستە و پارچەی یەدەك (سپێر)ی کردووەتەوە و بەیەکجارەکی جێگیربووە، لەهەمان شاردا (ڕۆژی١٥/١١/١٩٧٨) کۆچیدواییکردووە و لە گۆڕستانی (پاشا کۆپری) نێژراوە، دەرویش حسێن (کە بە فەقێ حسێنیش دەناسرا) کەسێکی کوردپەروەرە و جوامێر و هێمن و دڵ و دەروون پاك و خواپەرستی ئەهلی تەریقەت و دۆستێکی نزیك و دڵسۆزی پێشەوا شێخ مەحمودی حەفید بووە کە ئەویش (دەروێش حسێنی) بەهۆی هەڵوێست و خەسڵەتە جوانەکانیەوە زۆر


دەروێش حسێن

خۆشویستووە، هەروەها شێخی حەفید لە سۆنگەی بڕوا و متمانەی تەواوی بەو پیاوە مەردە ئەرکی جێبەجێکردنی هەندێ کار و چالاکی تایبەتی پێڕاسپاردووە پێش رزگارکردنی و پاش ئەوەش، گرنگترینیشیان سەرپشککردنی بووە بەڕاپەراندنی ئەرکی رزگارکردنی (واتە شێخ) لە بەغدا و هێنانەوەی بۆ سنووری لیوای سلێمانی، ئەمیش لێهاتووانە و دڵسۆزانە ئەو کارانەی ئەنجامداوە، ئەم زاتە لە ژیانی پیشەییدا وێرای کاسبی و دوکانداری وەستا و پیشەگەرێکی هونەرمەند و دەستڕەنگینیش بووە لە بواری دروستکردن و نەخشاندنی کەرەستە و تفاقگەلێکی دەگمەن ودانسقەی وەك (مشت و کێلانی خەنجەر، تەزبێح، دارجگەرە و جگەرەدان، قەڵەم لە شاخ) ئەمە جگەلە چاککردنەوەی سەماوەر و بەرگرتنی کتێب.. هتد. واش باسدەکرێت کە ئەو خەڵکی بناری بەمۆ (هۆرێن – شێخان)ی فێری دروستکردنی خەڵووز کردووە، هەمیسان ئەم زاتە کەسێکی رۆشنفکر و خوێندەواری سەردەمی خۆی بووە و زۆر حەزی لە خوێندنەوە کردووە (نەخاسمە خوێندنەوەی مێژووی کورد). لەو میانەدا گەلێك کتێب و دەستنووسی جۆراوجۆری کۆکردووەتەوە، وەختیکیش کۆچیدواییکردووە کتێبخانەیەکی دەولەمەندی پڕ لە پەرتووك و دەستنووس و گۆڤار و غەزەتەی کوردیی هەمەجۆری لەپاش خۆی بەجێهێشتووە کە پێشکەشکرا بە حاکم محەممەدسالح ئەردەلان کە خزمی نزیکی بووە.

لە بواری نووسین و هۆنینەوەی شیعریشدا بە کوردی و بە فارسی توانایەکی باشی بووە، ئەمەش بەڕوونی لە دەستنووسە بەجێماوەکانیدا بەدەردەکەوێت کە بەگشتی بریتییینلە یاداشت وشیعر و بابەتگەلی ئەدەبی لە شیعرەکانی وەك ( خۆبەختکردن بۆ نیشتمان و غەمباری ئازادی و گلەیی لە ژیان و چاوپێکەوتنم بە قۆتعەی یانەی سەرکەوتن لە بەغدا ساڵی ١٩٤٣) عەبدولباقی خان شێوەنی شێخ مەحمودی نەمر و).. هتد، ئەمەش نموونەیەکە لە شیعرەکانی:

دونیا دیدەن

من لە شـــــۆڕش هـــــاتمە دونیایەوە

لە عیدامی (هەمزە) ئاغـا ترسم شکاوە

میرزا مارف لە بیرم دێت لە سێدارەدراوە

دڵم بە خوێنی ئەو شـــەهیدانە ئاگردراوە

روحی کـــوردی لە دڵم وا گەشـــــاوە

ناکوژینەوە هەتاکو حەیاتم لە دونیا ماوە

(لێرەشدا جێی خۆیەتی ستایشی بەڕێز ئەمیر ئەحمەد دەربەند فەقرەیی بکەین بۆ پاراستنی ئەو دەستنووسانە کە پاشان کەوتە لای بەندە).

هەڵبەتە دیارترین ئاسەوارەکانیشی لەم میانەدا یاداشتە بەنرخەکەیەتی لەمەڕ وردەکاریی رزگارکردنی شێخی حەفید و هێنانەوەی لە بەغداوە بۆ کفری و پاشان بۆ کوردستان ئەمەش دەقەکەیەتی وەك خۆی:

رزگارکردنی شێخ مەحمود ١٩٤١/١١/٢٢

لە بیست و دووی یانزەی ساڵی هەزار و نۆسەد و چل، چوومە بەغدا لە خزمەت شێخ مەحمودی ئەمر بۆ سەرلێدان، شێخ فەرمووی: ئێوە پیاوی دڵسۆزی کوردن بۆیە منتان..[١]

لە بەغداوە بۆ خاکی کوردستان هەموو سەد و پەنجا کیلۆ مەترە ناتوانن راوێژێ بۆ من بکەن لە بەغدا دەرچم؟

منیش عەرزم کرد: یا شێخ لەمکاتە بەولاوە حازرم بۆ دەرکردنت.. ئیتر لەوێوە هاتمەوە بۆ خانەقی (دەروێش عەزیز مەحمود جاف) زۆر رەفیقم بوو، خەبەردارمکرد پێکەوە چووین بۆ بەغدا بۆ خزمەتی شێخ دووبارە راوێژێکی باشمکرد بۆ دەرچوون، فێلێکم دانا دوای ئەوە گەڕاینەوە بۆ خانەقی چووم بۆ چیاسوورخ خەریکی کارکردن بووم شت رێکبخەم (....)[٢] خەبەری وەرگرتبوو.. کەوتە تەعقیبی منەوە لەبەرئەوە هەلاتم بۆ سلێمانی لە رۆژی ١٠/ ١/ ١٩٤١ دەی مانگی یەك ساڵی هەزار و نۆسەد و چل و یەکدا لەوێ ئیشی خۆمم تەواوکرد دیسان هاتم بۆ چیاسوورخ، بەلام لەم ماوەیەدا (محەممەد سالح سلێمان)م[٣]

کردبوو بە جێگری خۆم ئینجا لە (خانەقی) هاتینەوە، هاتاکو دوانزەی مانگی دووی ساڵی چل و یەك ۱۹٤۱/۲/۱۲، هاتوچۆی بەغدام دەکرد، چوومە خزمەتی (شێخ مەحمود) فەرمووی: دانیشن چاوەڕێی کات بکەن، هاتمەوە بۆ (خانەقی) پانزە رۆژ لە خانەقی بووم رۆژێکیان (خەلیفە محەممەد ئەمین) ناوێك خەلیفەی (شێخ عەبدولڕەحمانی شێخ غەفور) بوو هاتبووە خزمەتی شێخ لە بەغدا، ئینجا لە بەغدا گەڕاوە هات بۆ خانەقی وتی: شێخ فەرمویە دەبێت بییێت بۆ بەغدا بەبێ دواکەوتن، منیش چوومە بەغدا لە خزمەتی شێخ (۱۵) پانزە ڕۆژ مامەوە خەریك دەرچوون بووم لەگەڵ چەند کەسێکیتر بەلاّم سەرنەکەوتین، عەرزی شێخم کرد کەوا دوو هاورێیترم لە خانەقی هەیە، یەکێکیان (عەزیز مەحمودی میکایەلّییە و ئەویتریان (محەممەد ساڵح سلێمان)ە.. هاتمە لای (عەزیز مەحمود) لەگەڵی قسەمکرد، لەپێشا ناڕازیبوو بەلاّم بەهەرجۆرێك بوو رازیمکرد و وتم: من هاورێم هەیە چونکی لەگەڵ ئێوە قسەمانکردووە و سوێنمانخواردووە، بەلاّم وتی: بۆ بەغدا نایەم لای ولاّغەکان تۆ لەکوێ بلّێی من دادەنیشم.. تەگبیرمانکرد لە (سەرقەلاّ) لە ماڵی (عەزیز خانی کوڕی برایم خانی دەڵو) و بڕیار لەسەر ئەوە درا ئەوڕۆژە کە ویستم لە بەغدا دەربچم تەلیفۆنێکی بۆ بکەم بۆ ماڵ (حەمەی حەمە خان) لە (سیلاحیە-کفری)، لە رۆژی دواییدا چووین بۆ چیاسوورخ ئەسپەکەم لە چیاسوورخ

بوو، سواری بووین و چووین بۆ خزمەت (شێخ عەزیز).. شێخ عەزیز خۆشی ماینێکی چاکی بوو داینابوو بۆ شێخ مەحمود. ولآغەکانمان ناڵبەنیکرد (عەزیز مەحمود) بردی لەگەڵ دوو کەسیتر یەکێکی (حەمەی سلیمان) ئەویتریان (وەلی)، ناونیشانمان ئەوەبوو کە دابوومپێی و خۆم گەڕامەوە بۆ بەغدا.

- دەرچوونمان لە بەغدا لەگەڵ شێخ مەحمود

- حرکتکردن لە خزمەت حەزرت شێخ مەحمود لە بەغدا:

لە رۆژی سێ شەمە ٢٣ی ربیعولسانی هیجری موقابل ١٩٤١/٥/٢٠ سوبح سەعات دەی عەرەبی لەوڕۆژە دەرچووین و لە سەعات سێ گەیشتینە (سەرقەلآ) لە بەغداوە تا (سەرقەلآ) پێنج سەعات لە (سەرقەلآ)وە بۆ (کۆزەی روغزایی) لە سەعات هەفت سواربووین و لە سەعات نۆ و نیم ٣٠/ ٩ گەیشتینە ماڵی (عەزیز) (٧) لە (پەلەوشك).. دانیشتین بۆ چایخواردن لە سەعات ١١:٥ یانزە و پەنچا دەقیقە لەگەڵ مفرەزەی پۆلیس کەوتینەشەڕ و دوو ئەسپ لە پۆلیس کوژرا و پۆلیس شکا و هەڕایانکرد() لەبەعد شەڕەکە سواربووین تا سەعات ٩ی سوبح گەیشتینە ئاوایی (درۆزنە) خەریکی نوێژکردن لەبەعد چایخواردن هەتا سەعات نۆ و نیو ٣٠/ ٩ نوێژی عەسرمان کرد و سواربووین خزمەتێکی خراپیاننەکردین لە ماڵی شێخ ئەحمەد عیسا سەرکاری (درۆزنە) خزمەتێکی چاك و باشی کرد، بەعد سواربووین لە

نوێژی مەغریب [١٤] گەیشتینە (بانیمۆرت) لە ماڵی (شێخ مستەفا شێخ عەبدولقادر) لەبەعد چای بەیانی سواربووین بۆ کەژی (سەگرمە) لەسەر کانی و ئاوێکی چاك، حەزرەتی شێخ ئەمری فەرموو پارەبدەنە

یەك نەفەر لەو ئاواییە بەس (پەز) بکرێ و شەکر و چا دروستکەن نان و کەباب دەخۆین [١٥].. ئەو وەقتە سواردەبین دەرۆینەخوارەوە لەم کەژە، منیش لەوکاتە پارچە هۆنەرێکم موبارکبادی بۆ حەزرەت شێخ نووسی و ئەمەیە:

موبارکت بۆ قوربان بەشادی موبارکت بۆ
هـــــەوای بــــەرانان و هـــــەوارانی نــۆ
رەنگێنە بە شـــــەوق و شــــەجاعەتی تۆ
کوردانی بەدبـــــەخت بە قــــۆربانت بۆ

لەبەعد فەراحی و خۆشی لە سەعات ٩:٣٠ نۆ و نیو عەرەبی نوێژی عەسرمان کرد، سواربووین بۆ (نەوتی) ئەو شەوە تا سەعات پێنچ (٥)ی عەرەبی لەوشەوە گەیشتینە (نەوتی) تا سەعات (٨) هەشتی رۆژ سواربووین بۆ (سۆڵە) لە سەعات (١٠)ی عەرەبی گەیشتینە (سۆڵە)، ئەوشەوە لەوێ ماینەوە لە سەعات (٨) هەشتی رۆژ لە سۆڵە سواربووین بۆ (شارباژێر) لە سەعات دوانزە (١٢) گەیشتینە چەمی تانجەڕۆ، نوێژی مەغریبمان کرد، سواربووین لە سەعات سێ عەرەبی گەیشتینە (خەراجیان)[٩] لەوێ نان و ماستمان خوارد، من و دوو سواریتر گومبووین لە سواری خۆمان.. کەوتینە رێگەی (سیتەك) شەو لە سەعات (٨) هەشتی عەرەبی لە دەشتی (سیتەکە کۆن) سی ماڵمان

دۆزییەوە بە گلاّی دار دروستکرابوون، پیامان کرد و یەکێ لە سوارەکان ڕۆیشتە دەرماڵەکە بانگیکرد:

- خاوەنماڵ، خاوەنماڵ جوابیدا و وتی: ئەوە کێیە؟

- سوار: ئێمەین سێ سوارین جێگەمان دەوێ.

+ خاونماڵ: برا مەگەر ئێمە لە ماڵ دەرچین ئیوە بێنەژوورەوە.

ئاخری ئێمە لە خاوەنماڵەکە غەدرمانکرد، یەك پیاو و دوو ژن بوون، دەرچوون لە ماڵ، ئیمە چووینەژوورەوە.. یەك سەعات نووستین، لەپاش یەك سەعات لە خەوهەڵساین، نانی جۆ لەگەڵ ماست حازرکرابوو، هەرچەند نانەکە هەر بەرد بوو، بەلاّم خراپنەبوو لەلامان.. پاش ئەوسا گۆشت چاکتر خورا لەپاش ئەوسا سواربووین بۆ (سیتەك)، دوو سواری شێخ وەدوامان هاتن.. ئەمری شیخیان هێنا بۆ من بچم بۆ چنگنیان.

بەڵی ئەمەیە من و دەرویش عەزیز مەحمود دوو مانگ لە خزمەت شێخ ماینەوە لەپاش دوو مانگ ئەمری عەفوی حکومەتمان بۆ هات و هاتینەوە بۆ خانەقین.

لە ئەوەڵ ڕۆژ لە خانقین کەوتینەڕێگا بۆ بەغدا

ڕۆژی پێنجشەمە ١٩٤١/٢/٥

- لە بەغدا بۆ سلیمانی ڕۆژی سێشەمە ١٩٤١/٥/٢٠

- لە سلێمانییەوە بۆ خوڕخوڕ ١٩٤١/٧/١٢

- لە خورخورِ بۆ خانەقین جومعە ١٩٤١/٩/٥

پاش بلاّوکردنەوەی یاداشتەکەی دەرویش حسێن چەند بابەتێك لە کوردستان و بەغدا و لەدەرەوەی وڵاتیشدا بلاّوکرانەوە کە راستییەکانی یاداشتەکە دووپاتدەکەنەوە.. مامۆستا محەممەد رسول هاوار لە کتێبی شێخ مەحمودی قارەمان و دەولەتەکەی خوارووی کوردستان چاپی لەندەن ساڵی ١٩٩١ز - لە بەشی حەڤدەهەم لا ٧٩١ - بەرگی دووهەم لەژێر ناونیشانی چۆنیەتی گەڕانەوەی شێخ مەحمود بۆ کوردستان دەڵێت: عەلائەدین سەجادی لە کتێبی ( شۆڕشەکانی کورد و کۆماری عێراق)، چاپی ساڵی ٩٥٩، بەمجۆرە باسی گەڕانەوەی شێخ مەحمود دەکات: لە مانگی مایسی ١٩٤١دا کە هەرای رەشید عالی دەستیپێکرد، شێخ مەحمود ئەوی بەهەڵزانی لە بەغداوە روویکردە بەعقوبە و لەوێوە (فەقێ حسێن) و (عەزیز مەحمود) کە لە دۆستە دڵسۆزەکانی شێخ مەحمود بوون ولاّغیان بۆ هێنا، شێخ مەحمود بەرەو داریکەلی رۆیشت.. ئەمجا خوالیخۆشبوو هاوار دەنوسێت و دەلێت: لەباسێکدا کە لەلایەن ئیبراهیم باجەلاّنەوە دەربارەی یاداشتەکانی ئەو (فەقێ حسێن)ەی کە (عەلائەدین سەجادی) ناویهێناوە لە گۆڤاری رۆشنبیری نوێ ژمـــــارە (١٢١)ی مانگی ئازاری ساڵی ١٩٨٩ لە بەغدا بلاّوکراوەتەوە کە ئیبراهیم باجەلاّن (دەروێش حسێن) ناویهێناوە لەپاش ئەم پێشەکییە، دەقی بابەتەکەی خۆی دەنووسێت، سەیر ئەوەیە لەو یاداشتەی دەرویش

حسێندا باسی ئەو سوارانەی نەکردووە کە شێخ مەحمود لە شێخ لەتیف داوایکردبوو، بێگۆمان ئەگەر سوارەکانی شێخ لە تیف نەگەیشتبنە کنگریان، بەلاّم لەڕێگا هەر بەیەککەیشتوون، بەوەدا دەروێش حسێن دەلێت: لە تانجەرۆ ئێمە رێگەمان لێونبوو کە دیارە شێخ مەحمود لەگەڵ سوارەکانی شێخ لە تیفدا رووی کردۆتە سیتەك، دەربارەی ئەو یاداشتەی کە دەورێش حسێن لە شێخ بابا عەلی شێخ مەحمودم پرسی وتی: لەڕاستیدا ئەوی ئەو بەو دوورودرێژییە باسیکردووە نەمبیستووە، بەلاّم ئەو دەروێش حسێنە و هاوڕێکەی کە باوکم هاتەوە، ئەوانەشی لەگەڵدا بوون، ماوەیەك لە سیتەك باوکم هێشتنیەوە کە ترسیان لەسەر نەما ئەوسا گەڕانەوە بۆ شۆێنی خۆیان.

ئەگەر قسەکانی شێخ بابا عەلی بەراورد بکەین لەگەڵ نووسینکەی دەروێش حسێن کە دەلێت: من و عەزیز دوومانگ لە خزمەت شێخداماینەوە و لەدوای دوومانگ عەفوی حکومەت دەرچوو، ئێمەش گەراینەوە شۆێنی خۆمان.. دووپاتی راستییەکانی یاداشتەکە دەکاتەوە، جگەلەوەی کە دۆستایەتی دەروێش حسێن لەگەڵ شێخی نەمردا دەگەڕێتەوە بۆ سالاّنی پێش ١٩٤١، پاش ئەو مێژوویەش هەر بەردەوامبوو.. ئەم بۆچونەش لە خۆمەوە نایلێم، بەڵکو پاش ئەوەی چاومکەوتە هەندێك لە رۆژژمێرەکانی خوالێخۆشبوو دەروێش حسێن کە لەپاش رووخاندنی رژێم و رزگاربوونی خانەقین لەڕێگای هونەرمەند

(جەلیل باوەخان)ەوە دەستمکەوت، بۆ نموونە لە رۆژی سێشەمە (٨)ی شوباتی ساڵی ١٩٤٤ز بە خەتی دەروێش حسێن نووسراوە:

زیارەت حەیاتی ١٩٤٤

چوارشەممە ٩ی شوباتی ١٩٤٤ وادیارە دووجار چاوی بە شێخی نەمر کەوتووە، ئەمجا نووسراوە: رۆیشتنی جەنابی رەفیق حیلمی بەگ و ماجید بەگ بۆ سلێمانی بۆ زیارەتی حەیاتی، سەعات شەش.

نابێت ئەوەشمان لەیادبچێت ساڵی ١٩٤٤ کە نوری سەعید پۆستی سەرۆکوەزیرانی عێراقی وەرگرت، نیازی وابوو چارەسەری کێشەی کورد بکات، بۆیە پۆستی وەزیری دەوڵەتی سپاردە (ماجید مستەفا) کە ئەفسەرێکی کوردبوو، ئەم راستییە بەڕوونی لە کتێبەکەی (ئالوسیان رامبو- تۆمابوا)ی فەرەنسی و دۆستی ناسراوی کورد باسکراوە، (عەزیز عەبدولئەحەد نەباتی) ئەم کتێبەی کردووەتە عەرەبی و ساڵی ١٩٩٨ لە هەولێر چاپکراوە، لە لاپەرەی ١٠٤دا باسی ئەوەی کردووە کە بارزانی داوای دامەزراندنی ویلایەتێکی کوردی کردووە کە کەرکوك و سلێمانی و خانەقین و دهۆك لەلا خۆی بگرێت، وادیارە پێش ئەوەی شاندەکە سەردانی بارزانی بکەن چاویان بە شێخی نەمریش کەوتووە و دەروێش کارئاسانی بۆ ئەو چاوپێکەوتنە کردووە و مێژووەکەی لە رۆژمێرەکەدا نووسیوە.

دیسان شایانی باسە کە لە ١٩٤١/٢/١٧دا پاش گەڕانەوەی دەروێش حسێن بۆ خانەقین، شیعرێکی بە فارسی بۆ جەنابی شێخ نووسیوە و دەڵێت:

هەر سەحەر کە از خواب شوم بیدار
روکـــــونم بە سوئی بەغداد زشوق یار
این یار کیست دلی مرا کرداست جاگی
نەسل حەیدەر است وز اولاد احمد کاکی...

پێوستە ئەوەش بلێم کە لەپاش بلاۆکردنەوەی یاداشتەکەی دەروێش حسێن مێژوونووسی هێژا پرۆفیسۆر کەمال مەزهەر بابەتێکی لە ڕۆژنامەی (العراق) بلاۆکردەوە و دەستخوشی لە نووسەر کرد و بلاۆکردنەوەی یاداشتەکەی بەرز نرخاند.

کاتێك بەوردی سەرنجی یاداشتەکەی دەروێش حسێن دەدەین بۆماندەردەکەوێ کە (دەروێش حسێن) چەندێك هێمن و لەسەرخۆبووە، حەزینەکردووە لە دەرکەوتن، بەڕادەیەك یەکێك لە دانیشتوانی دێی (پەلەوشك) دەڵێت: کاتێك پۆلیسەکان گەیشتنە (پەلەوشك)و کەوتنە شەڕ و تەقەکردن لە شێخ مەحمود و هاوریەکانی، (دەروێش حسێن) پاش ئەوەی شێخ بۆیدەرچو سەعاتێك لەپاش ئەوەی کە (شێخ مەحمود) دەربازیبوو هەر تەقەی لە پۆلیسەکان دەکرد و پارێزگاری لە دەورپشتی شێخ دەکرد دوای ئەوە گەیشتە دێی (کاکەبرا) لەوێ نانی ئێوارەی

خوارد، هەروەها دەڵێت: کاتێك شێخ و هەڤاڵەکانی دەرچوون (بەرماڵەکەی) لە ماڵی کۆێخا (عەزیز) مابەجێوە.. تاکو ئەم ساڵانە خەڵکی بۆ تەبەروك لێاندەبرد، هەروەها جێگەی سەرنجە کە کاتێ دەگەنە (سەگرمە و بەرانان) دەروێش حسێن شیعری پیرۆزبایی بۆ شێخ دەلێت وادیارە لەو جێگەیەدا چونکە نزیکی داریکەلی یە لەیەکجیابوونەتەوە، بەلاّم دەروێش حسێن پاش چوار مانگ واتە لە پاییز گەڕاوەتەوە بۆ خانەقی، هەرچەندێکیش گۆمانم لەوە هەیە کە دەلێت: (ئەمری عەفوم بۆ هات) وابزانم لەبەر خۆپاراستن وەهای نووسییە و بەدرێژە باسی دەوری خۆی ناکات هەروەکو لەپێشەوە وتم دەروێش حوسێن چاوەڕێی ڕۆژێکی لەبارتری کردووە بیرەوەرییەکانی بەتەواوەتی بنووسێت بەهەرحالێك بێت یاداشتەکانی خوالێخۆشبوو دەروێش حسێن شایانی ئەوەن کە بە پێنووسی زێڕین و بە ئاوی زێڕین بنووسریتەوە، سەربەرزی و ناوچاکی هەتاهەتایە بۆ قارەمانانی کورد و ڕۆڵە دلسۆزەکانی ئەم گەلە.

•••

## سەرچاوەو پەراوێزەکان

١) شۆڕشەکانی کورد و کورد و کۆماری عێراق، عەلائەدین سەجادی، چاپخانەی مەعارف، بەغدا، ١٩٥٩ز - لا (١٣٩)

٢) ئەم چەند وشەیە بۆمان نەخوێنرایەوە

٣) ناوی کابرایەکە لەلایەن ئینگلیز و دەسەلاتداری کۆنەپەرەستی پێشووبووە، لەبەر کەسوکاری نەماننووسی.

٤) (محەمەد سالح سلێمان) بە محەممەد سالح دەلۆ بەناوبانگە لە ساڵی ١٩٦٢-١٩٦٣ لە بەمۆ شەهێدکرا.

٥) (کە) لە دەستنووسەکە نەنووسراوە.

٦) مەلا (سەید حەکیم) خانەقینی ١٨٩٢-١٩٥٧ یەکێکە لە دامەزرێنەرەکانی کۆمەڵەی (هیوا)و دوا ئەوساش بەشداری بزوتنەوەی نیشتمانی کردووە.

٧) ناحیەیەکە سەربە قەزای (کفری)یە.

٨) راستییەکەی (١٠) ساڵە، چونکە لە (١٣مایس ١٩٣١ تاکو مایسی ١٩٤١) دەسبەسەربووە.

٩) کفری

١٠) شێخ عەزیز ی ئەلیپەکان لە دێی خورخوڕ لە ناوەی قۆرەتوو خاوەنی تەکیە و دێوەخان بوو.

١١) عەزیز - عەزیز سلێمان- قوێخای (پەلەوشك)ە.

١٢) هەڕایانکرد: هەلاتن.

١٣) درۆزنە: لەم یاداشتە دووجار ناوی دروزنە بەرچاوماندەکەوێت، چونکە دوو ( درۆزنە) هەیە یەکێکیان نزیکی تێلەکۆیە و دووهەمیان درۆزنەی شێخ عیسا، نزیکی سەرچاوەی ئاوەسپیە کە سەربە ناحیەی گوگتەپەیە لە چەمچەماڵ.

١٤) خەراجیان: گوندێکە نزیکە سلێمانی و ماستی (خراجیان) بەناوبانگە.

١٥) گومبوون: ونبوون.

١٦) کۆزەی رۆغزابی: وا لە بنەی جاف لەنێوان سەرقەلا و ئومەرملدا.

١٧) پەلەوشك: دێیەکە لە بنەی جاف.

١٨) بانیمورد گوندیکی نزیك قەرەداغە.

١٩) سەگرمە: شاخێکە لەنێوان سەنگاو و قەرەداغ.

٢٠) زۆربەی ئەم زانیارییانە کە لەم یاداشتەدا ناویانهێنراوە لە خوالیخۆشبوو مامۆستا مەلا رەشید قەواڵی وەرمگرتبوو لەکاتی خۆی.




## پەیوەندییەکانی شێخ مەحمود و ناوچەی کفری

### حسێن ئیسماعیل خان دەلۆ

پێشەکی:

لە گەرمەی شەڕی جیهانی و پاش شەڕیش ناوچەی کفری ویستگەیەکی گرنگی خەبات و شۆڕشەکانی شێخ مەحمود بووە، بەدرێژایی جووڵانەوەکانی شێخ مەحمود خەڵکی شۆڕشگێڕی ناوچەی کفری هەوادار و لایەنگری خۆیان بۆ سەرکردەی جووڵانەوەکە و مەکۆی شۆڕشەکە هەبووە و هەمیشە ئینتیما و وەلائیان بۆ کوردایەتی و نەتەوەپەروەری لەو ئانوساتە چارەنوسسازانەدا هەبووە.

ئەم لێکۆڵینەوەیە پێکهاتووە لە (پێشەکی و دەروازە و سێ تەوەرو دەرئەنجام) کە بەمشێوەیەیە: تەوەری یەکەم باس لە پەیوندییەکانی نێوان ناوچەی کفری و شێخ مەحمود پێش دامەزراندنی دەوڵەتی عێراق دەکات و چەند باسێك لەخۆدەگرێت (باسی یەکەم: أ. رۆڵی هۆزەکانی ناوچەکە لە شەڕی شعێبەدا، ب. هێرشی سوپای ئینگلیز بۆ سەر ناوچەکە، ج. گرنگیدانی بەریتانیا بە ئیدارەی ناوچەکە، باسی دووەم: أ، هەڵوێستی خەڵکی ناوچەی کفری دوای جەنگی یەکەمی جیهانی، ب. کفری وەك وێستگەی پەیوەندییەکانی شێخ مەحمود لەدوای جەنگی یەکەمی جیهانییەوە، هەروەها تەوەری دووەم چەند باسێك لەخۆدەگرێت و باسی یەکەم: أ. هۆکارەکانی راپەڕین و سەرهەڵدان لە ناوچەی کفریدا، ب. سەرهەڵدان و رابوونی ناوچەی کفری و دەوروبەری لە ساڵی ١٩٢٠دا، ج. گفتوگۆ و دانووستانی نێوان هەردوولا، باسی دووەم: أ. هێرشکارییەکانی ئینگلیز بۆ داگیرکردنەوەی شاری کفری، ب. هاوخەباتی نێوان خانەقین و کفری، ج. هاوخەباتی نێوان دوزخورماتوو و کفری.. کوتا تەوەریش کە تەوەری سێیەمە ناوچەی کفری لەنێوان ساڵانی ١٩٢١- ١٩٤١، سێ باس لەخۆدەگرێت:

- باسی یەکەم: شاری کفری یەکەم وێستگەی خەباتی شێخ مەحمود بوو لە ساڵی ١٩٢٢،

- باسی دووەم: ڕۆڵی خەڵکی ناوچەی کفری لە شەڕی ئاوباریکدا ١٩٣١،

- باسی سێیەم: ڕەنگدانەوەی ڕاپەڕینی مایسی ١٩٤١ لە ناوچەکدا.

هیوادارم بەم لێکۆڵینەوە بەشێك لەڕاستییە مێژووییەکانم خستبێتەڕوو.

دەروازە

شاری کفری هەر لە دێرزەمانەوە لە سەردەمی ئەکەدییەکانەوە مەڵبەندی نیشتەجێبوون بووە و لە سەردەمی عوسمانییەکاندا ناوەندێك بووە بۆ ئاڵوگۆڕکردنی پۆستەی نێوان بەغداد و کەرکوك، بەڵام لەپاش دروستکردنی شاری سلێمانی ١٧٨٤ شاری کفری کەوتەژێر کارتێکردنی شاری سلێمانی لەڕووی ڕۆشنبیری و کۆمەڵایەتی و بازرگانییەوە بووژایەوە و پەلوپۆی هاویشت، لەهەفتەیەکدا چەندین کاروان بە بارەتووتن و کەتیرە و پێستە و مازووەوە لە سلێمانییەوە ڕوویان لەم شارە کردووە و لەکاروانسەرا و خانەکانیاندا بار و بارخانەیان دەخست و بەهەمانشێوە لە بەغداوە بە بارەکوتاڵ و کەلوپەلەوە دەگەڕانەوە بۆ سلێمانی بەکفریدا دەڕۆیشت، بەمشێوەیە کفری کەوتەسەر شارێگای نێوان سلێمانی و بەغداد، لە سەردەمی بابانەکانەوە چەند جارێك هەوڵیانداوە شاری کفری بخەنەناو قەڵەمڕەوی دەسەڵاتەکانیاوە لە ساڵی

١٨١٢ ئەوڕەحمان پاشای بابان کفری و دەوروپشتی بە لەشکرێکەوە خستەناو بازنەی دەسەڵاتی خۆیەوە و والی بەغداش لەئەنجامدا هێرشێکی فراوانی کردەسەری و چەندین رۆژ لە (دهوڵخانە) شەڕ لەنێوان هەردوولادا بەردەوامبوو، لەدوای رووخانی میرنشینی بابان لە ساڵی ١٨٥١ چەند کەسێکی دیاری ئەم بنەماڵە هاتنە کفری و تێدانیشتەجێبوون لەوانە (قادر پاشا و سمایل بەگی برای) کە چەندین کۆشك و خانوویان دروستکرد کە خەڵکیش چاویان لێبڕیی و گەڕەکێك تاکو ئێستا بەناوی (سمایل بەگ) ناسراوە، مەجید پاشا کە کوڕی قادر پاشا بوو لە چەندین شوێن قایمقام بووە، بەڵام پاشتر خانەشینبووە، کۆشکێکی دوو نهۆمی دروستکرد تاکو ئێستا وەکو شوێنێکی شوێنەواریی لە کفری ماوەتەوە، کتێبخانەیەکی گەورەیان لە دیوەخانەکەیان هەبووە، بەهەمانشێوە بنەماڵەی سادات لە سلێمانییەوە هاتوونەتە ناوچەکە و رۆڵیان لە پەرەپێدان بە رۆشنبیری ئەم شارە هەبووە، کاك ئەحمەدی شێخ بەم شارەدا چووەتە حەج ئەمریکردووە مەدرەسە و تەکیە و مزگەوتی تێدادروستبکرێت، چەندین گەڕێدە و گەشتیار بەم شاردەدا تێپەڕبوون و تێبینی خۆیان لەسەر نوسیووە چەندین خەڵکی دەستڕەنگین و خاوەنپیشە لە سلێمانی و قەرەداغ و دەوروبەریەوە هاتووەنەتە کفری و تێدانیشتەجێبوون.

تەوەری یەکەم: پەیوندییەکانی نێوان ناوچەوی کفری و شێخ مەحمود پێش دامەزراندنی دەوڵەتی عێراق

باسی یەکەم:

أ. رۆڵی هۆزەکانی ناوچەکە لە شەڕی شعێبەدا[1]

لە پایزی ١٩١٤ هەموو جیهان بەرەو ئاگری شەڕێکی بەرفراوان چوو کە جەنگی یەکەمی جیهانی بوو، بەشداریکردنی دەوڵەتی عوسمانی لەو جەنگەدا لە سەرەتاکانی تشرینی دووەمی ١٩١٤ بووە بڕیاردەری چارەنووسی دەسەلاٌتی عوسمانی لە باشووری کوردستاندا، بەڵکو زیاتر لەمەش دواتر چارەنووسی هەموو ئیمپراتۆرییەتەکەی دیاریکرد. کاتێك شەڕی جیهانی هەڵگیرسا تورکەکان بانگەوازی غەزایان دەکرد،[2] لەو ئانوساتەدا فتوای سوڵتانی عوسمانی کە تەنها لەڕووکاردا شێوازی غەزای پێوەدیاربوو، بەلاٌم لەناوەڕۆکدا پاراستنی پلەوپایەی خۆی و سەروەری دەوڵەتەکەی بوو، کاری خۆی کرد و زۆربەی هەرەزۆری کۆمەلاٌنی موسڵمانی نێودەوڵەتەکەی لەخشتەبرد و ئەوانی بۆ ناو توونی ئەو جەنگە جیهانییە هاندا و راپێچیکردن.[3]

لەلایەکیدیکەوە بانگەوازی (جیهاد و غەزا) بۆ سوودوەرگرتن لە بزواندنی هەستی ئایینی خەڵکی دڵساف و ساکاربوو، بۆ ئەم کارە (شێخ ئیسلام)ی ئەستانە و مەلا و گەورەپیاوانی ئایینی دەوڵەتی عوسمانی بە دەیان فەتوایان بۆ شەڕی کافران دەرکرد،[4] رایگشتی لەژێر کاریگەری

ئایینیدا بوو بۆیە ژمارەیەکی بەرچاو کە لەنێوان (١٠ ـ ١٥) هەزار چەکدار بەهەموو نەتەوەکانەوە لە شەڕی ((شعێبە))دا بەشـــدارییان کرد،[٥] بەو بانگەوازە هەستی ئایینی میللەتی کوردیان بزواند، بەهۆی پیاوە ئایینی و سەرۆکهۆزەکانەوە هەزاران کەس چوونە پێشەوە بۆ ناو گەرمەی شەڕەکە[٦] و بە چەك و کەرەستە و تفاقی جەنگی خۆیانەوە هاوبەشییانکرد.

ئەوەبوو هەزاران کەس لە رۆڵەکانی کوردستان کە ساڵەهای ساڵ بوو لە حەژمەت زوڵم و ستەمی عوسمانییەکان دەیانناڵاند بەدەم بانگەوازەکەیانەوە چوون و خۆیان بۆ شەڕی داگیرکەری نوێ سازدا و گشت مەینەتی و نەهامەتییەکانی ساڵانی دوورودرێژی حوکمی عوسمانییان بەلاوەنا و چاوپۆشیانلێکرد هەر ئەو هەستە ئایینپەروەری و هاونیشتمانییە بوو وایکرد لە شۆڕەسوارانی گەلی کورد بە چەك و تفاقی خۆیانەوە بەرەو باشووری عێراق رێگا بگرنەبەر و لەوێندەر بەیاوەری سوپای عوسمانی خۆیان بۆ پەلاماردانی هێزەکانی ئینگلیز ئـامادەبکەن،[٧] بەمەش دەردەکەوێت هەستی ئایینی لەو سەردەمەدا زاڵبووە و رەنگدانەوەی لەسەر هزر و کرداری تاکی کوردی هەبووە. لە بەهاری ساڵی ١٩١٥ لەلایەن ژەنەراڵێکی دەوڵەتی عوسمانییەوە برووسکەیەك ئاراستەی "شێخ مەحمود (١٨٨١ - ١٩٥٦)" کرا، تێیدا هاتبوو: (بەم نزیکانە دەگەمە سلێمانی.. سەردانێکی بەرێزت دەکەم بۆ کارێکی

گرنگ) برووسکەکە لە نیوەی دووەمی مانگی ئاداردا گەیشتەدەست شێخ مەحمود لە سلێمانی،[8] لەکاتێکدا شێخ مەحمود وەڵامی بانگەوازەکەی دایەوە و ئامادەباشی خۆی دەربڕی داوای لە سەرۆکهۆزەکانی (.. داودە و زەنگەنە و دەلۆ و بەیات و جاف.. هتد) کرد بۆئەوەی هاوکاریبن بۆ رووبەڕووبوونەوە لەگەڵ سوپای ئینگلیزدا،[9] کەسایەتی شێخ کاریگەری بۆ کۆکردنەوەی هێزەکان هەبووە.

سەرچاوە مێژووییەکان باس لەوەدەکەن ساڵی ١٩١٥ ژمارەیەکی بەرچاو[10] سوارەی کورد بەسەرۆکایەتی شێخ مەحمودی حەفید کە لە بەشێکی کوردستاندا بەرەو شعێبە چوون بە هاوکاری لەگەڵ خێڵە عەرەبییەکان و لەژێر سەرکردایەتی عوسمانییەکاندا تاکو رێ لە پێشڕەویی هێزەکانی بەریتانیا بگرن.[11]

شانبەشانی شێخ کۆمەڵێك لە سەرۆکهۆز و ناودارەکانی گەلی کورد لەو جەنگەدا بەشداربیانکرد وەك: "سەیید ئەحمەدی خانەقا (١٨٦٨ - ١٩٥٢)، ئیبراهیم خانی دەلۆ (١٨٧٤ - ١٩٢١)،[12] رەفعەتی ئیسماعیل بەگی داودە و نامیقی عەلی ئاغای داودە و (کەریم بەگی جاف (١٨٨٩ -١٩٤٩)و حەمە عەلی بەگی جاف) و[13] کەریم بەگی هەمەوەند.. هتد"،[14] جگەلەو سەرۆکهۆزانە چەندین کەسایەتیدیکەی ناوچەی کفری هاوکار و بەشداربوون لەو جەنگەدا وەکو محەمەد ئەمین محەمەد خورشید داودی (حەققی ١٨٩٢- ١٩٥٩)و برایم

حەمە خانی گێژ (١٨٨٠- ١٩٦٨)و حـــــاجی قادری مەحموی شاتری (١٨٩٠ -١٩٧٨) و چەندانیتر،[١٥] ئەمانە بەهەموو هێز و توانایەکی خۆیانەوە چوونە ئەو شەڕەوە، هەرچەندە لەژێر کارتێکردن و کارێگەری ئاییندا بوو، بەڵام کاریزمای کەسایەتی شێخ مەحمود فاکتەرێکی سەرەکی بوو بۆ کۆکردنەوەی ئەو چەکدارە کوردانە.

بەشی هەرەزۆری ئەوانەی چوونە شەڕی ئینگلیز پێکهاتبوون لە لایەنگرانی شێخ مەحمود و کوڕگەلی داودە و دەلۆ و زەنگەنە و گل و رۆژبەیانی و هەمەوەند و جافی دەوروبەری کەلار،[١٦] جەنگاوەر (موجاهید)ەکان سەرەتا ژمارەیان گەیشتە (١٢) هەزار غەزاکەری عەرەب و (٢) هەزار غەزاکەری کورد و تورکمان،[١٧] ئەو هێزانە لە نیسانی١٩١٥ خۆیان گەیاندە شعێبە لەوێ بە هاوبەشی جەنگیان لە دژی هێزەکانی ئینگلیز کرد،[١٨] سەرلەبەیانی رۆژی ١٢نیسانی ١٩١٥ هێزەکانی عوسمانی بە سەرکردایەتی سلێمان عەسکەری هێرشیانکردەسەر هێزەکانی بەریتانی، بەڵام هێزەکانی ئینگلیز خۆڕاگربوون لەو شەڕەدا و دژە هێرشیانکردەسەر هێزەکانی عوسمانی و ژمارەیەکی زۆریان لە هێزی عوسمانی کوشت.[١٩]

کاتێك هێزی هۆزە کوردەکان گەیشتە"شعێبە" بەرەوڕووی تۆپبارانی خەستی هێزەکانی بەریتانیا بوونەوە کە بۆ ئەوڕۆژگارە و بۆ کۆمەڵی کوردەواری شتێکی نوێ و چاوەڕواننەکراوبوو، هەرچۆنێك بێت

پاش دوانزە کاتژمێر شەڕی سەخت، هێزەکانی سوپای عوسمانی و هاوکارانی بەسەختی تێکشکان و بەزوویی لە بەرەی شەڕەکە پاشەکشەیانکرد، پاش ئەوەی چەند کەسیان لێکوژراو و سەدان کەسیان لێبریینداربوو، سەبارەت بە هێزی هۆزە کوردەکان "ئەحمەد ئاغا و قادر ئاغا" لە هۆزی زەنگەنە "نامق ئاغا" لە هۆزی داودە و چەند جەنگاوەریتر بوونە قوربانی، جگەلە بریندار بوونی دەیانیتر.[٢٠]

بەهۆی ئاگری چەکە قورسەکانی بەریتانیاوە کوردەکان و عەرەبەکان لە شەڕی شعێبە زەرەرمەندبوون، ئامارێکی تەواو لەبەردەستدانییە کە کوردەکان چەند کەسیان کوژران، بەڵام هەندێك سەرچاوە ئاماژە بەوەدەکەن (٣٠٠٠)کەس لە کورد و عەرەب کوژران، هەندێك لەو کەسایەتییە ناودارانە کە کورد بوون و لەو شەڕەدا کوژران دەنگدانەوەی زۆری لە کوردستان هەبوو.[٢١]

لەکاتی گەڕانەوە شێخی نەمر لە کفرییەوە لەرێگا لەماڵی برایم خانی دەلۆ لایدا شەوێك حەسایەوە و نەخشەی هاوکاریکردنیان دانا،[٢٢] شەڕی شعێبە بۆ گەلی کورد مەغزا و رەهەندی سیاسی و کۆمەڵایەتی خۆی هەبوو، هەرچەندە تاڕادەیەك کوردەکان بەرگریان لە دەوڵەتی عوسمانی کردووە، بەڵام هاوکات دەرکەوتنی کەسایەتییەکانی کورد بەتایبەتی شێخ مەحمود لەو هەلومەرجە هەستیارەدا بووە فاکتەرێك کە لەئاییندەدا لە هاوکێشە سیاسییەکاندا زیاتر ئامادەیی هەبێت و رۆڵی

خەڵکی ناوچەی کفری پاشتر لە ڕووداوە سیاسییەکاندا بەکردەنی دەرکەوت، پاشتر بووە هۆی کۆتایی پەیوەندییەکانی نێوان نەتەوەی کورد و دەوڵەتی عوسمانی و سەرەتای دەستپێکردنی پەیوەندی نێوان کورد و بەریتانییەکان.

ب. هێرشی سوپای ئینگلیز بۆ سەر ناوچەکە

لە زستانی ساڵی ١٩١٧ ئینگلیزەکان دەستیان بەسەر خانەقیندا گرت و هیچ گرفتێکی ئیدارەیان تووشنەبوو، پاشتر لە ساڵی ١٩١٨ بەرەو ناوچەی کفری چوون بەتایبەتی بنەماڵەی تاڵەبانییەکان و سەرۆکی ئایینی سەیید ئەحمەد خانەقا لایەنگری بەریتانیا بوون،[٢٣] ئەو پەیوەندییانە کارێگەرییان لەسەر هێرشکاری بەریتانییەکان بۆ ناوچەکە هەبوو.

لەکاتێکدا تورکەکان لە باکوورەوە سەرکەوتنیان بەدەستهێنا ئینگلیزەکان هەوڵیاندا لە باشوورەوە شوێنپێیان لەقبکەن بۆیە ژەنەراڵ مارشاڵ (W. M. Marshall) (دوای مردنی ژەنەراڵ مۆد لە تشرینی دووەمی ١٩١٧ بووە فەرماندەی هێزەکانی بەریتانیا) هەوڵیدا هەڵمەتەکەی (حملە) دنستر ڤیلد (سەرپەرشتی هێزەکانی بەریتانیای لە ئێران دەکرد) بەهێزبکات، چونکە ڕێگای نێوان هەمەدان و قەسری شیرین بۆ بەریتانییەکان مەترسیدار بوو ئەو پڕوپاگەندانەی ئەڵمان و

تورکەکان لەنزیك کفری دەیانکرد بۆ بزواندنی هۆزەکانی رۆژهەڵات کارێگەرییان لەسەر ئەو رێگایە هەبوو، بۆیە ژەنەراڵ مارشاڵ بڕیاریدا هێزەکانی تورك لە قەرەتەپە و کفری و دوزخورماتوو دەرپەڕینی و خۆی دەڤەرەکە داگیربکات،[٢٤] ئەوکاتەی ئینگلیزەکان گەیشتنە بەغداد، رووسەکان لەخانەقیندا هێزەکانیان مۆڵیاندابوو ئینگلیزەکان لەپێشڕەویدابوون تاکو مەنسورییە زۆر بەخێرایی هاتن.[٢٥]

لەکاتێکدا کە هێزەکانی بەریتانیا بەدرێژایی رووباری دیالە دەهاتن عوسمانییەکان هێزەکانیان لە رۆژئاوای رووبارەکە جێگیربوون، لەوکاتەدا دانیشتوانی ناوچەی کفری ئەو ناوچەیان چۆڵ کرد کە عوسمانییەکان داگیریان کردبوو،[٢٦] ئەوکات ئینگلیزەکان بەهۆشیارییەوە بەرەو خانەقین کشان کە لەو سەردەمەدا هێزی رووسەکان داگیریانکردبوو ئەوەبوو لەدوای شکاندنی ئەو هێزە لە کانوونی یەکەمی هەمان ساڵەدا خانەقینیان داگیرکرد.[٢٧] لە برووسکەیەکدا کە ئەفسەری سیاسی بەریتانیا لە بەغداوە لە رۆژی ١٦ی تشرینی دووەمی ساڵی **١٩١٧** ناردوویەتی بۆ وەزارەتی دەرەوە کە تێیدادەڵێ: ((لە رۆژی **١٣**ی تشرینی دووەمی هەمانساڵدا بە فڕۆکە گەیشتمە (خانەقین و کفری)،[٢٨] بەمەبەستی بینینی ئەفسەرە سیاسییەکانمان، بۆمدەرکەوت کە هەموو دانیشتووان حەزبەوەدەکەن کە سلێمانی داگیربکەین هەر بە هێزێکی بچووك بۆئەوەی دەست بەسەر هەموو ئاژاوەیەکدا بگرین)).[٢٩]

لە سەرەتای کانوونی یەکەمی١٩١٧سوپای بەریتانیا هێرشیهێنایەسەر سوپای تورك لە قەرەتەپە شەڕێکی چوار رۆژە روویدا ژمارەیەکی زۆر دیل و کوژراو لەنێوان هەردوولا هەبوو،بەریتانییەکان بۆیاندەرکەوت ئیتر لەمەولا ناتوانن بەبێ زەرەروزیان بۆ پێشەوە هەنگاوبنێن بۆیە لەرۆژی حەوتی هەمانمانگدا لە قەرەتەپە کشانەوە.[٣٠]

لە ٢٦ی نیسانی ١٩١٨ ژەنەراڵ (ئیگرتن) فەرماندەی فەیلەقی (٣) بوو، سێ رەتڵی ئامادەکرد کە ئامانجیان گرتنی قەرەتەپە و دوزخورماتوو بوو، تورکەکان هەستیان بە ئامادەکارییەکانی بەریتانییەکان کرد بڕیاریاندا تیپەکانی خۆیان پاشەکشەپێبکەن بەرەو باکوور، لەگەڵ دەستپێکردنی بەریتانییەکان بە هێرشکاری لە رۆژی ٢٦ی نیسانی ١٩١٨ توانیان قەرەتەپە داگیربکەن،[٣١] دواتر بەرەو ناوچەی کفری چوون بەتایبەتی بنەماڵەی تاڵەبانییەکان و کەسایەتی ئایینی سەیید ئەحمەد خانەقا لایەنگری بەریتانیا بوون،[٣٢] لە کۆتایی نیسانی ١٩١٨دا هێزەکانی بەریتانیا بەخێرایی پێشڕەوییانکرد و لەماوەیەکی کەمدا قەرەتەپە و کفری و دوزخورماتوویان گرت و ئەم چوونەپێشەوەیە زەمینەی بۆ بەریتانییەکان سازکرد پەیوەندی نزیکتر لەگەڵ شێخ حەمیدی تاڵەبانیدا گرێبدەن، بۆ یەکەمجار هێزەکانی کورد دژ بە تورك بەکارهێنران هێزێکی کورد کە لە نزیکەی دووسەد پیاوی باجەلاْن و دەلۆ و سوورەمەیری پێکهاتبوو، لە نیسانی ١٩١٨ پەلاماری

هێزی عوسمانییەکانیان لەسەر رووباری سیروان دا.[٣٣]

لەشکری ئینگلیز لە قۆڵی باکووری رۆژهەڵاتی بەغداوە پێشکەوت و رۆژی ٢٨ی نیسانی ساڵی ١٩١٨ توانی بچێتە ناوشاری کفرییەوە و دوای ئەوەش دوزخورماتوویان داگیرکرد،[٣٤] پاش داگیرکردنی کفری ئینگلیزەکان بانگەشەی ئەوەیان دەکرد کە پەیوەندی لەگەڵ هەندێك کەسایەتییە ناسراوەکانی کەرکوکدا بکەن.[٣٥]

لەدوای هێرشکاری رووسەکان جارێکیدیکە ناوچەی کفری بووە دەروازەی هاتنی سوپایەکی زلهێزی جیهانی کە دەیویست لەوێوە مل بۆ داگیرکردنی گشت کوردستان بنێ، ئەم هاتنەش شەڕوشۆڕێکی زۆری لێکەوتەوە، عوسمانییەکان هەرچەندە پرزە و بڕستیان لێبڕا بوو، بەڵام توانا سەربازییەکانی خۆیان کۆکردەوە بۆئەوەی پێشگیری لە هاتنی ئەو سوپایە بکەن کە بۆ داگیرکردنی ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی ئەوان هاتبوون، لەئاکامدا جەنگ قەوما و زیانێکی بێشومار لەڕووی مادی و مرۆییەوە بەر دانیشتوانی ناوچەکە کەوت.

ج. گرنگیدانی بەریتانیا بە ئیدارەی ناوچەکە

لە کۆتاییەکانی جەنگ و لە ٢٦ی تشرینی یەکەم ١٩١٨ ولسن جێگری حاکمی گشتی ئینگلیز لە عێراق مێجەر (نوئیل)ی[٣٦] بە حاکمی سیاسی ناوچەی لیوای کەرکوك دامەزراند، ئەو ناوچەیە نێوان زێی گەورە و رووباری سیروانی (کە ناوچەی کەرکوك بوو) ئەگرتەوە.[٣٧]

هەر لە مانگی ئاداری هەمانساڵدا کفری و کەرکوك لە قەڵەمڕەوی شێخ کرانەوە و کران بە دەڤەرێکی تازەی بەڕێوەبردن، کاپتن لیس ( G. M. Lees) لە ١٥ی ئاداری ١٩١٩ کرایە یاریدەدەری حاکمی سیاسی شاری کفری، ئەمەش بۆ شلۆقکردنی پەیوەندی خەڵکی ناوچەکە لەگەڵ شێخ مەحمود ناوبراو دەستبەکاربوو،[٣٨] لە دۆیـــــکۆمێنتی ژمــــــارە (F.O,371-5069)کە تەرخانکراو بۆ راپۆرتی ساڵی ١٩١٩ دەربارەی کەرکوك دەڵێ: (لێپرسراویەتی ناوچەی کفری کاپتن لیس. ئەی. رامید بووە، بەڵام لە ساڵی ١٩١٩ کاپتن ئی. جەی. دۆگلاس یاریدەدەری ئەفسەری سیاسی بەریتانی لە کەرکوك هەتا مانگی حوزەیرانی ١٩١٩ مایەوە، لەدواییدا نێردرا بۆ کفری)،[٣٩] ئەو جێگۆڕکێیە کە بە کاربەدەستان و ئەفسەرانی سوپای ئینگلیز کراوە میتۆدێك بووە بۆئەوەی بەباشترین شێوە بتوانن کۆنترۆڵی شارەکان بکەن، لەوڕووەوە کفری تایبەتمەندی خۆی هەبووە بۆیە دەبینین لەماوەیەکی کورتدا ژمارەیەکی زۆر لە لێپرسراو و کاربەدەستەکانی بەریتانیا بۆ شاری کفری گوێزراونەتەوە و چاودێری جموجووڵ و هەڵسوکەوتیان کردووە تاکو بزانن کێ لەوانە بەباشی شارەکە کۆنترۆڵدەکات.

ئەگەر شەنوکەوێکی رووداوەکان بکەین لە ساڵانی جەنگ سێ دیاردە لە هەڵوێستی کوردەکانی کوردستانی باشوور بەرامبەر دەوڵەتی

عوسمانی بەرچاودەکەوێت، یەکەمان: چەواشەبوونی کورد (بەتایبەتی لە سەرەتاکانی جەنگدا) بەهۆی بانگەوازی (غەزا) کە دەوڵەت رایگەیاندبوو بۆ سوودوەرگرتن لە توانا مرۆییەکان لەڕووی سەربازییەوە، هەر بۆ نموونە لە نیسانی ١٩١٥ شێخ مەحمود و ژمارەیەك لە چەکدارانی لەگەڵ کۆمەڵێك سەرۆکهۆز و خانەدانانی کورد بە بڕوای غەزا لە شەڕی شعێبە بەشدارییانکرد دژی هێزەکانی بەریتانیا، دووەم هەڵویستی کورد دواتر شێوازی یاخیبوونی وەرگرت لەبەرامبەر دەسەڵاتی عوسمانی، هەروەکو یاخیبوونەکانی دانیشتوانی ئامێدی و سلێمانی و ناوچەیتری کوردستان، مەبەست لەو یاخیبوونانەش بریتیبوولە بەشدارینەکردن لە جەنگ و پێشکەشنەکردنی یارمەتی و ئازووقە بە دەوڵەت، دیاردەی سێیەم: بریتیبوولە پەیوەندیکردنی کورد بە هاوپەیمانان بەمەبەستی رزگاربوون لە دەسەڵاتی عوسمانی بەتایبەتی لە دواساڵەکانی جەنگ کە هێزەکانی رووسیا و بەریتانیا لە کوردستانی باشوور نزیکببوونەوە، ئەوەتا شێخ مەحمود بۆ ئەو مەبەستە و بۆ بەدەستهێنانی یارمەتی بۆ کورد پەیوەندی بە دەسەڵاتدارانی رووسەوە کرد[٤٠]، گشت ئەو دیاردانە لەو قۆناغە هەستیارە مێژووییەدا بە ئامانج و مەبەستی بەدەستهێنان و دەستەبەرکردنی مافە نەتەوایەتییەکانی کورد بووە، پەیوەندییەکانی کورد لەگەڵ زلهێزەکانی دونیادا هەرچەندە هەڵکشان و داکشانی تێدایە، بەڵام هەموو

کۆششەکان بۆ دەرباز و رزگاربوون بووە لە چەوساندنەوە و زەبروزەنگی داگیرکەران.

باسی دووەم:

أ. هەڵوێستی خەڵکی ناوچەی کفری

دوای جەنگی یەکەمی جیهانی

هەروەك میرزا محەممەد ئەمین مەنگوری لە کتێبی حەقائقی بەسەرهاتی شێخ مەحمود لە پەنای ئیستقلالی کورددا دەڵێت: لە (١)ی کانوونی یەکەمی ١٩١٨ کولونیل (ولسن) لەسەر داوای کوردەکان پرۆتۆکۆلێکی بۆ کوردەکان واژۆکرد کە باشووری کوردستان (لە زابی گەورەوە هەتا دیالە) جگەلە خێڵەکانی ئێران هەموویان لەژێر سەرکردایەتی (شێخ مەحمود)دا بژین، هەروەها بێجگەلە ناوچەی کەرکوك و کفری ناخوازن سەربە دەسەڵاتی شێخ مەحمود بن و ئەیانەوی خۆیان بەجیا بژین[٤١]، عەبدولرزاق الحەسەنی لە "تاريخ العراق السياسي الحديث" باسدەکات بەمەرامی چارەسەرکردنی دۆزی کورد لە سەرەتای کانوونی یەکەم ١٩١٨ کۆلۆنێل (ولسن) بە فڕۆکە گەیشتە سلێمانی و لەگەڵ شێخ مەحمود کۆبووەوە کە نزیکەی (٦٠) سەرۆك و کەسایەتی کوردی تێدائامادەبوو، باسی بارودۆخی ئەو سەردەمەی کوردیان کرد[٤٢] بەڵام لە دۆیکۆمێنتی ژمارە (F.O,371-5069) کە تەرخانکرابوو

بۆ راپۆرتی ساڵی ١٩١٩(لە ١/١ساڵی ١٩١٩ تا ٣١/١٢ساڵی١٩١٩) دەربارەی کەرکوك دەڵێ: لە مانگی مارتی ١٩١٩دا (کاپتن میللەر) کرا بە سەرکردەی هێزی لیڤی (Levy)(43) لە کەرکوك لەو ماوەیەدا بانگەوازی (کوردستان بۆ کوردە) لەلایەن سەرکردەکانی کوردەوە بەرزکرابووەوە و لە ناوچەی کەرکوکدا (٩) کەس لە شێخەکانی کورد (سەرۆکهۆز و کەسایەتییە ناسراوەکان) هەریەکەیان بەناوی خەڵکی دێهاتی خۆیانەوە لەنێوان (٤ - ٥)سکالاّیاندابوو بە سەرۆکەکانیان.[٤٤]

لەو وێستگە مێژووییەدا جەمیل مەجید پاشای بابان کە کەسایەتییەکی دیار و بەرچاوی بنەماڵەی بابانەکانی کفری بوو، کاتێك رایوەرگیرا لەوەلاّمدا باسی لەوەکرد کە دەسەلاّتی کوردی مافی خۆیەتی و بۆماوەی باپیرانیەتی سەرەڕای ئەوەی کە بەریتانییەکان پەیمانی ئەوەیان پێدابوو کە ئەو مافەی بۆ بگەڕێننەوە، ئەو مافەیان بە شێخ مەحموددا، ئەمەش بووە هۆی ئەوە کە ناوبراو پڕوپاگەندە دژبە شێخ مەحمود بکات، لە راپۆرتەکەی جەمیل مەجید پاشای بابان هاتبوو کە خۆی بەوەدەزانێ ئەرکی بلاّوکردنەوەی هەستی سەربەخۆیخوازی لەناو کورددا ببینێ، ئەمەش خۆی بە خاوەن دەسەلاّتی ناوچەکانی کەرکوك و کفری و پشدەر دەزانێ، بەلاّم لەڕاستیدا بابانەکانی کەرکوك لەگەڵ ئەوەدا بوون کە خواستی کورد بۆ سەربەخۆی جێبەجێبکرێت.[٤٥]

بەڵگەنامەی ژمارە (٣٧١) (٥٠٦٩) (A 7928) وەزارەتی هیند ژمارە (٥٢٣٧) ڕۆژی ٨ی تەموزی١٩٢٠ نامەیەکی تێداپارێزراوە کە لە مەندووبی مەدەنییەوە نێراوە بۆ وزارەتی هیند، ئەمەش دەقی نامەکەیە: ((یاداشتێکم بە ئیمزای ٦٢ کەس پێگەیشتووە، نزیکە لەوەی کە هەموو سەرۆکهۆزەکانی کورد و ریشسپی و پیاوماقووڵانی کوردستانی باشوور بن، یاداشتەکە ئەمە دەقەکەیەتی: "ئێمە، سەرکردەکانی کورد، دەریدەبڕین کە ویست و ئارەزوومان لە دروستکردنی دەوڵەتێکی سەربەخۆی کوردییە لەوڵاتەکەماندا لەژێر منداتی حکومەتی بەریتانیا کە ئەو دەوڵەتە لەگەڵ وڵاتی نێو دووڕووبارەکە یەکبگرێت، بەمەبەستی موعامەلەکردنێکی (هاویەکی)، (هاوتوانایی)و جێبەجێکردنی کۆنفدرالییەت لەنێوانیاندا بۆ بەرژەوەندییەکی هاوبەش))[٤٦] کە ئەو یاداشتە لە ٣ی تەموزی ١٩٢٠ (ئەوکاتە شێخ مەحمود لە دوورخراوەیی و مەنفا بوو) ئاراستەی مەندوبی سامی لە بەغدا کرا،[٤٧] لەنێو ئەوانەی یاداشتەکەیان بەرزکردبووەوە چەند کەسایەتییەکی ناوچەی کفری هەبووە وەك (برایم خانی دەلۆ و ڕەفعەت سمایل بەگی داودە و سەلیم بەگی دەلۆ) کە داوای دامەزراندنی دەوڵەتێکی سەربەخۆی کوردیان کردووە کە لەژێر منداتی بەریتانیادا بێت.

بۆ دروستبوونی دەوڵەتی کوردی هۆزەکانی کەرکوك و کفری ئارەزوویان نەبوو بچنەژێر رکێفی شێخ مەحمودەوە ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کەرکوك بێتە ناوچەیەکی سەربەخۆ،(٤٨) لەژێر سەرپەرشتی مەندووبی سامی بەریتانیا لە بەغدا کرا، وادەرکەوت کە زۆربەی فەرماندە ناودارەکانی کورد داخوازییانکردووە سەربەخۆیی کۆنفدراڵی لەگەڵ دەوڵەتی عێراقدا ئەنجامبدرێت، ئەو کۆنفدراڵییە لەنێوان کوردستان و عێراقدا بێت، لەدوای راپەڕینی ئایاری ١٩١٩ کاتێك شێخ مەحمود بەدیلیگیرا و رەوانەی هندستان کرا، بەریتانییەکان وایبۆدەچوون بەم دوورخستنەوەیە رزگاربوون لە سەرچاوەی نائارامی رووبەڕوبوونەوە لە باشووری کوردستان، بەلاّم وادەرکەوت بەرهەڵستکارانی کورد بۆ بەریتانیا لە کوردستانی باشووردا تەنها شێخ مەحمود و لایەنگرانی نین، بەڵکو هەندێك لە بژاردەی کورد کاریان بۆ بەدیهاتنی ئامانجەکانی کورد و پاراستنی مافەکانیان لە دەوڵەتێکی سەربەخۆدا دەکرد، بەرهەڵستیکردنی هەرشێوەیەك لە شێوەکانی لکاندنیان بە عێراقەوە فەرزکردنی ئیدارەی بەریتانی و عێراقی ئەمەش خزمەتی مافەکانی کوردی نەدەکرد،(٤٩) بەمەش بزاڤی سەربەخۆییخوازی لەنێو کورددا زیاتر بەرەوپێشەوەچوو.

ب. کفری وەك وێستگەی پەیوەندییەکانی شێخ مەحمود لەدوای جەنگی یەکەمی جیهانییەوە

هێشتا جەنگ کۆتایینەهاتبوو شێخ مەحمود لە سلێمانییەوە دەستەیەکی نوێنەرایەتی ناردەلای دەسەڵاتدارانی ئینگلیز لە کفری داوایلێکردن نەتەوەی کوردیش لە ریزی گەلانی ئازاددا بژمێرن بەرامبەر بەوەش بەڵێن و گفتی دۆستایەتی و هاوکارییپێدان،[٥٠] لەو پێنگاڤەدا شێخ مەحمود بۆ ئەوەی دووچاری جەنگی تازە نەبێتەوە دوو نامەی بۆ کاربەدەستانی ئینگلیز نووسی (١. حاکمی گشتی لە عێراق ٢. فەرماندەی گشتی لە کەرکوك) یەکەم بەهۆی سەیید محسن ئاغاوە لە کفری و دووەم بەهۆی عەبدوڵلا سافی یەعقوبی لە کەرکوك رەوانەکران، نامەی یەکەمی لەگەڵ (عیزەت مەدفەعی و ئەحمەد فائق) رەوانەی لای فەرماندەی بەریتانییەکان لە کفری کرد کە تێیدا ئامادەیی خۆی نیشاندابوو سلێمانی بداتبەدەست هێزەکانی بەریتانیاوە بەبێ کوشتار، بەڵام بەو مەرجانەی کە پێشتر پێشکەشیانیکردبوو، نامەکە لە ١ی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩١٨ گەیشتە (ولسن) لەرێگەی ئەفسەرە سیاسییەکەی بەریتانیاوە لە کفری داوای نوێنەریانی کرد بۆ دانووستان و دیالۆگکردن[٥١]. عەبدولمونعیم ئەلغولامی لە کتێبی "ثورتنا في شمال العراق ١٩١٩ـ١٩٢٠" دەڵێت: لە سەروەختی راگەیاندنی حوکمداریدا

لە ساڵی ١٩١٨ شێخ مەحمود هەوڵێدا بازنەی سنووری قەڵەمڕەوی دەسەڵاتەکەی فراوانبکاتەوە کە ناوچەکانی کفری و کەرکوك لەخۆبگرێت، بەڵام هۆزەکانی ئەو دوو ناوچەیە (بەتایبەت بنەماڵەی تاڵەبانییەکان و بەشێك لە هۆزی هەمەوەند و بەشێك لە شێخەکانی بەرزنجە بەتایبەت (سەیید ئەحمەدی خانەقا)و بابانەکانی ئەو ناوچەیە) ڕەتیانکردەوە لەژێر ڕکێفی سەرۆکایەتی شێخ مەحموددا بن، خواستیان ئەوەبوو ڕاستەوخۆ لەژێر دەسەڵاتی بەریتانیادا بمێننەوە.[٥٢]

کاتێك لە تشرینی یەکەمی ١٩١٨دا نوێنەرانی بەریتانیا چوونە سلێمانی و شێخ مەحمود حوکمڕانی گرتەدەست، لە گەرمیان و دەوروپشتی کفرییەوە ئەم ناودارانە چوونە لای شێخ و پیرۆزباییانلێکرد و پشتگیری خۆیان نیشاندا، وەك (برایم خانی دەلۆ، عەلی ئاغای زەنگەنە، کەریم بەگی جاف، ڕەفعەتی بەگی داودە، سەیید محەممەدی جەباری (١٨٧٨ - ١٩٣٦)،[٥٣] هەر لەو سەردەمەدا کە شێخ فەرمانڕەوایەکی میللی دامەزراند (برایم خان و وەیسی بەگی دەلۆ) بۆ پیرۆزبای چوونە خزمەتی و ماوەیەك لەوێ مانەوە بوون بەباوەڕپێکراوی شێخ، داوایلێکردن پەیوەندییان لەگەڵ جەماوەری ناوچەکەدا پتەوبکەن، ئەگەر فەرمانڕوایەکەی لەناوچوو لەگەرمیان ئاڵای شۆڕش هەڵبکەن.[٥٤]

تەقەلای ئینگلیزەکان لە شارەکانی کەرکوك و کفری ئاشکرابوو کە خەڵکی قایلنەبن لەگەڵ حوکمدارێتی سلێمانیدا بن،[٥٥] مێجەر سۆن

لە ڕاپۆراتی ساڵانەی ساڵی ١٩١٩ دەریبڕیووە، شێخ دەیویست قەڵەمڕەوی دەسەڵاتەکەی لە خانەقینەوە تاکو ناوچەی شەمزینان و لە چیای حەمریینەوە تاکو سنووری ئێران بێ، گەورەترین دەسەڵاتی شێخ لە شوباتی ١٩١٩ بوو کە کفری و کەرکوکی لەخۆگرتووە.(٥٦)

حاکمی گشتی مەدەنی لە بەغدا ئاگادارکرایەوە کەوا دەسەڵات لە ناوچەی سلێمانیدا خەریکە زۆر شوێنیتر دەگرێتەوە هەروەکو کەرکوك و کفری کە ناویان لەگەڵ خوارووی کوردستان باسدەکرێ و ناویان لەژێر ناوی حوکمداریەتی شێخ مەحمودا ناودەبرێ، کاتێك شێخ مەحمود دەیویست سنوور و پێگەی دەسەڵاتەکەی فراوانبکات، بەریتانییەکان هەوڵیاندەدا سنووری دەسەڵاتەکەی بەرتەسك و سنووردابێت و ناوچەی کفری و کەرکوك نەکەوێتە قەڵەمڕەوی دەسەڵاتەکەیەوە بۆ ئەو مەبەستە لە ئاداری ١٩١٩ لیوای کەرکوکیان دروستکرد،(٥٧) بووە سەرەتایەك بۆ کێشە و ململانێ لەسەر ئەو ناوچەیە کە تاکو ئێستا ئەو پرسە بەبێ چارەسەرکردن ماوەتەووە.

مێجەر نوئیل ڕاپۆرتێکی ئاراستەی حاکمی گشتی مەدەنی لە بەغدا کرد کە تێیداهاتبوو هۆزەکانی (جاف و هەمەوەند و پشدەر و داودە و بەشێك لە هۆزەکانی دەلۆ و زەنگەنە و هەورامان) خۆشحاڵی خۆیان بەدامەزراندنی شێخ مەحمود بە حوکمداری کوردستان دەربڕی، بەلاّم ناوچەکانیتر لە دژی ئەوە بوون بلکێنە حکومەتەکەی شێخ

مەحمودەوە وەك هەڵەبجە و رانیە و هەندێك لە ناوچەکانی کەرکوك و کفری.. هەرچەندە ویستیانەبوو بەلکاندنیان بە حکومەتی بەغداوە ئامانجیان دامەزراندنی ئیدارەیەکی سەربەخۆ بوو.(٥٨)

لەم هەوڵەدا میجەر سۆن کە بە رێگەوە بوو بۆ سلێمانی، بەوردی لە بارودۆخی کفری و کەرکوکی کۆڵییەوە، سیاسەتێکی بۆ خۆی دارِشت پیرِەویبکات ژمارەیەك قەزا و ناحیە و هۆزی لە جوغزی دەسەلاٌتی شێخ هێنایەدەرێ، لە ناوەندی مانگی ئاداردا گەیشتە قایمقامێتی کفری، مووچەی مانگانەی بەسەر سەرانی تیرەکانی جاف و بەگزادەکانیاندا دابەشکرد کە پێشتر لە شێخیان وەردەگرت، میجەر سۆن ویستی پەیوەندی بە جافەکانەوە بکات تاوەکو لایەنگری شێخ مەحمود نەکەن کە ئەو وەختە هۆزی جاف بە کۆچوبار لە ناوچەی کفریدا بوون، (٥٩) سۆن لەم رقلێبوونەوەیەدا، هەرگیز بەتەنیانەبوو لە تەواوی ناوچەکانی دەوروبەری سلێمانی، شێخ مەحمود لەناو هۆزەکانی جاف و باجەلاٌن، بەتایبەتی لەناو شێخەکانی تاڵەبانی کەرکوك کە قادری بوون و هەروەها شێخە نەقشبەندییەکانی بیارە و تەوێلە نارِەزای دژی هەبوو، لەبەرئەو نارِازییانە بوو هۆزەکان و خەڵکی شارەکانی کەرکوك و کفری نەکەوتبوونە ناو قەڵەمرەوی حوکمی شێخ مەحمودەوە.(٦٠)

شتێکی ئاشکرابوو کە لە باشووری کوردستاندا هێز و دەسەڵاتی شێخ مەحمود مەترسییەك بۆسەر پاشەرِۆژی دەسەڵاتی بەریتانیا

دروستدەکات، بەتایبەتی پاش ئەوەی کەرکوك و کفریش چوونە ژێرحوکمی ئەوەوە، چونکە شێخ بەوە رازینەبوو کە لە مانگی شوباتی ساڵی ١٩١٩دا کەرکوك و کفری دەربکرێن لەو ناوچەیەی کە بۆ فەرمانڕەواییەکەی دەستنیشانکرابوو،[٦١]

تەنانەت لەوکاتەدا بەریتانیا ناحیەی وارماوای بە کفرییەوە بەستەوە.[٦٢] هێزەکانی شێخ مەحمود لە ساڵی ١٩١٩ دەستیان بەسەر کاروانی پڕ لە چەك و تەقەمەنی و ئازووقەی ئینگلیزەکاندا گرت کە لە کفرییەوە بەرەو سلێمانی دەچوون ئەمەش هاوکاری خەڵکی ناوچەکەیان لەگەڵدابووە،[٦٣] لە لیوای کەرکوك هۆزەکانی (شوان، شێخبزێنی، ساڵەیی، هەمەوەند، قەرەحەسەن، جەباری، داودە، دەلۆ) کەوتنە رێگرتن لە کاروانی سوپای ئینگلیز، بەڵام هۆزی زەنگەنە و بە شێك لە تاڵەبانی جووڵەیاننەکرد، چونکە شێخ حەمیدی تاڵەبانی لەلایەن ئینگلیزەوە بە سەرۆکی کفری دانرابوو،[٦٤] ئینگلیزەکان بەردەوامبوون لە هەوڵ و تەقەلاکانیان تاکو بەتەواوی کوردستانی عێراق بخەنەژێر رکێفی خۆیانەوە، هێزێکی گەورەی ئینگلیز لە حوزەیرانی ساڵی ١٩١٩ پێشڕەویکرد بەرەو ناوچەی دەربەندیبازیان رۆیشتن و بە جووڵەیەکی پێچخواردووی گەورە ئابلۆقەی شۆڕشگێڕانیاندا، شێخ مەحمودی حەفید و هەندێك لە هاوکارانی دەستگیرکران بەدەستبەسەری رەوانەی بەغداد کران و پاشتر شێخ مەحمودی حەفید رەوانەی هندستان کرا تاکو ساڵی

١٩٢٢ بەدیلی مایەوە،[٦٥] ئەمەش بەمەرامی دامرکاندنەوەی ئەو بزاڤ و جووڵانەوە نەتەوایەتییانەی کە گەلی کورد بۆ دەستەبەر و فەراهەمکردنی خواستە مرۆیی و نەتەوایەتییەکانی تێدەکۆشا تاکو تەگەرە لە رەوتی ئەو کاروانە سەربەخۆییخوازە بدەن.

تەوەری دووەم:

باسی یەکەم:

أ. هۆکارەکانی راپەڕین و سەرهەڵدان لە ناوچەی کفریدا

هەرئەوەندە ئینگلیزەکان کەمێ شوێنپێی خۆیان کردەوە کەوتنە بڕوبیانووگرتن بە شێخ مەحمودی حەفید و بزووتنەوە رزگاریخوازە نەتەوایەتییەکەی، شێخ ملی بە فڕوفێڵ و ساختەکارییەکانی ئەوان نەدا و نەبەردانە بەرنگاریانبووە تا لە شەڕەکەی دەربەندیبازیاندا لە مانگی حوزەیرانی ساڵی ١٩١٩ بەدیلگیرا و دوورخرایەوە، ئینگلیز بەمە وایانزانی کوردستانیان بەتەواوی داگیرکردووە، ئیدی بەجارێ شووڵیانلێهەڵکێشا و کەوتنەوێزەی خەڵك، لەهەموو شار و شارۆچکەیەك حاکمە سیاسییەکانی ئینگلیز و دەستوپێوەندەکانیان بەوپەڕی لەخۆباییبوون و لووتبەرزییەوە مامەڵەیان لەگەڵ خەڵکدا دەکرد و هیچ رێز و حورمەتی دابونەریتی خەڵکی کوردستانیان نەدەگرت، بارودۆخ

گەیشتە رادەیەك لەوزەدا نەمێنێ و ئیدی لەوەزیاتر بۆ خەڵکی قــووتنەدرێ، شەپۆلی رق و تووڕەیی لە دڵی خەڵکدا پەنگیخواردبووەوە، [٦٦] هەربۆیە راپەڕینەکەی سلێمانی بە سەرۆکایەتی شێخ مەحمود تەنها راپەڕین نەبوو لە کوردستانی باشوور لەو ماوەیەدا، بەڵکو دوابەدوای ئەو راپەڕینە ژمارەیەك راپەڕینیتر لەکوردستاندا بەرپابوو، هەرچەندە بەرپرسانی بەریتانی بەرپابوونی ئەم راپەڕینانەیان دەگێڕایەوە بۆ هاندانی تورکەکان بۆ کورد و هەوڵی بەدەستهێنانی بەرژەوەندییە تاکە کەسییەکان لەلایەن سەرۆکهۆز و کەسایتییە دەسەڵاتدارەکانی کورد، بەڵام لەڕاستیدا چەندەها هۆکاریتری ناوەکی و دەرەکی رۆڵی سەرەکییان هەبوو لەم رووداوانە، لەسەرووی ئەو هۆکارانەی بێئومێدبوونی کورد لە بەڵێن و دروشمە بریقەدارەکانی بەریتانیا کە بە گەلە چەوساوەکان و کوردی دابوو بۆ بەدیهێنانی ئامانجە نەتەوایەتییەکانیان[٦٧]، بێئومێدبوونی کورد لە جێبەجێکردنی داخوازییەکانیان بورکانی رقی خەڵکی تەقاندەوە و رووبەڕووبوونەوەی چەکداری لێکەوتەوە.

وێڕای ئەو هۆکارانە ئینگلیزەکان پاش داگیرکردنی کفری لە کۆتایی نیسان و سەرەتای ئایاری ١٩١٨ سەربازگەیەکیان لەنێوان (ئەسکی کفری) و (کنگربان)دا دامەزراند، هێزی سەرەکییان لەوێ جێگیرکرد، ج. ئیج. سالمۆن[٦٨] (Salmon G.H.)کرا بە جێگری حاکمی سیاسی، عەرییفێك بەناوی (سارجن مێجر) یاریدەدەری

(سالمۆن) بوو، هەمیشە کوتەکێکی بەدەستەوەبوو لەبەرئەمە بە (ئەبو چۆماغ)[٦٩] لەنێو خەڵکیدا ناوبانگیدەرکردبوو، دووەمیان ئەفسەرێکیتر بوو ساچمەزەنێکی بەشانەوەبوو بەبیانوی سەگکوشتنەوە بە کوچە و کۆڵانەکانی ناوشاردا دەسووڕایەوە خەڵکی ناوچەکە (کوێپك ئۆڵدران)[٧٠] یان پێدەگوت، هەردوو ئەفسەرەکە لە وەختوناوەختدا بە ناوشاردا دەسووڕانەوە، ئەگەر یەکێکیان لەسەر جۆگە ئاوەکە بدیتبایە دەستنوێژ دەشوا، ئەوا دایاندەپلۆسی، بەسەر منداڵ و ئافرەتدا دەیانشاخاند گوایە ئاوی جۆگەکەیان لێخنکردووە، لەناو بازاڕدا دەبوایە خەڵك لەبەرییانهەڵبسێ، دانیشتوانی شار لە کاروکردەوەی پیاوەکانی (سالمۆن) زۆر دڵپەستبوون،[٧١] بەوشێوەیە شاری کفرییان کردبووە مەڵبەندێکی چەوساندنەوە و ئازاردانی خەڵکی و باج و بێگارییەکی زۆریان خستبووە سەرشانی دانیشتوانی ناوچەکە، لە ئەنجامی ئەمەدا خەڵکی سکاڵای[٧٢] خۆیان بردەلای ئیبراهیم خانی دەلۆ بۆ سەرزنشت و ئامۆژگاریکردنی جێگری حاکمی سیاسی بەریتانیا و دەستوپێوەندەکانی، چەند جارێك دەنگی ناڕەزایی خەڵکی بە (سالمۆن)ی بەرپرسی ناوچەکە راگەیەندرا، بەڵام بێهودەبوو، چونکە ئەوان بۆ داگیرکردن و دزینی سەروەت و سامانی کوردستان هاتبوون بۆیە بێبەزەیانە بەوێزەی دانیشتوانی ناوچەکەدا دەهاتن،[٧٣] جگەلەوەش هەندێك جار موراد موبارك ئاغای گێژ[٧٤] زۆرکات بەهاوکاری هێزێکی (لیڤی)یەوە هێرشیدەکردەسەر

گوندێك بۆ ئازاردانی خەڵکی،[٧٥] پاشاگەردانی و سەرکوتکردنی بێچەندوچوونی کورد لەلایەن چەوسێنەران و داگیرکەرانەوە جێگای نەفرەتی زۆرتری کورد بوو پاشان بووە هەوێنی راپەڕین و جووڵانەوەی چەکداری لە سەرانسەری کوردستاندا، جووتیاران باجیان نە بە دەوڵەت و نە بە دەرەبەگەکان دەدا و سەرئەنجام ناکۆکییەکانی گەیشتنە پلەی پێکدادانی چەکدارانە،[٧٦] لەبەرئەوە لەو قۆناغەدا شۆڕش و جووڵانەوەی جووتیاری سەرتاسەری کوردستانی تەنیبووەوە. لە ئەنجامی جەنگی یەکەمی جیهانی و هەڵوەشانەوەی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانیدا، عێراق (ویلایەتی بەسرە و ویلایەتی بەغدا)و باشووری کوردستان (ویلایەتی موسڵ) کەوتەژێر راسپاردەی (ماندات - الإنتداب)ی ئینگلیزەوە، بۆیە ئەودەم وەك بەرپەرچدانەوەیەك بۆ ئەو داگیرکارییە زۆربەی ناوچەکانی کوردستان راپەڕین و جووڵانەوەی چەکدارییان بەخۆوەبینی و ئامانجیان دەرپەڕاندنی هێزی داگیرکەر بوو، لەوکاتەدا باشووری کوردستان چەندین راپەڕین و بەرەنگاربوونەوەی بەخۆوەبینی بەهیوای سەندنەوەی مافەکانی گەلی کورد، ئەوەبوو لەو هەلومەرجەدا ناوچەکانی دوزخورماتوو و کفری و خانەقین بەهاوبەشی چەندین جموجۆڵی چەکدارییان نواند.[٧٧] ئەمانە فاکتەر و هۆکاری هەڵایسان و بەرپابوونی راپەڕین و یاخیبوونەکانی ناوچەی کفری بوون، لەو سەروەختە چارەنووسسازدا هەوڵیاندەدا مافە مرۆی و نەتەوایەتییەکانیان فەراهەم و دەستەبەربکەن.

## ب. سەرهەڵدان و رابوونی ناوچەی کفری و دەوروبەری لە ساڵی ١٩٢٠دا

زاراوەکانی(شۆڕش، راپەڕین، خەباتی چەکداری) هەرچەندە لەڕووی رووخسار و تایبەتمەندی لەیەکترجیابن و لێکدانەوەی جیاوازیان بۆبکرییت، هەموویان لەڕووی ناوەڕۆك و ئامانجی گشتیدا یەکدەگرنەوە کە بریتییەلە وەرگرتنی هەڵوێستێکی پۆزەتیف و کارێگەر بەرامبەر هەر ستەمکاری و داپلۆسینێك چ لەڕووی سیاسی یان ئابووری یان کۆمەلاّیەتی و رۆشنبیری بێت، میللەتی کوردیش کە سەدەها ساڵە بەدەست داپلۆسین و چەوسانەوەی نەتەوایەتی بەهەموو شێوەکانیەوە دەناڵێنێت، راپەڕینیکردووە بەشێوازێکی گرنگ و دیاریی بزاڤە رزگاریخوازەکەی، لەکاتێکدا بزاڤی رزگاریخوازی نیشتمانی زاراوەیەکی فراوانە و لەپاڵ راپەڕین چالاکی رێکخراوەیی پەیوەندی و هەوڵی دبلۆماسی و خەباتی رۆشنبیریش دەگرێتەوە، بۆیە مێژووی کوردستان کە لەڕاستیدا بریتییەلە مێژووی بزاڤی رزگاریخوازی نیشتمانی کورد،(٧٨) بەو سۆنگەوە باشووری کوردستان بووە کوانوو و مەکۆی خەباتی چەکدارانە و چەندین پێکدادان لە باشووری کوردستان و لە ناوچەی کفری و کەرکوك سەریهەڵدا، بەتایبەت لەو شوێنانەی کە زۆرینەیان کوردن رووبەڕووبوونەوەکان لە کۆتایی مانگی ئاب و سەرەتای مانگی

ئەیلولدا بووە،[٧٩] کوردەکان جارێکیدیکە رابوون و ئیبراهیم خانی دەلۆ لە هەرێمی کفری راپەڕینێکی بەرپاکردووە[٨٠] کە بەشێکی زۆری خەڵکی ناوچەکە بەشداری راپەڕینەکەیان کردووە.

لوتکەی چیای باوەشاسوار بووە ناوەند و مەڵبەندی سەرهەڵدان و راپەڕینێك دژبە داگیرکەران، لەگەڵ گزنگی بەرەبەیانی رۆژی (٢٢ی ئابی ١٩٢٠)[٨١] کۆمەڵێك خەڵکی شۆڕشگێڕ بە سەرۆکایەتی ئیبراهیم خانی دەلۆ لەو لوتکەیەوە دەستیانکرد بە تەقەکردن لە مەرکەزی پۆلیسی (قشلە - سەرا) کە کەوتبووە دامێنی چیای باوەشاسوارەوە، هەموو دانیشتوانی شار بەپەرۆشەوە چاوەڕوانی هاتنی شۆڕشگێڕان و رزگارکردنی شارەکەیان دەکرد،[٨٢] هێزی سەرەکی ئەم هێرش و هەڵمەتەی ئیبراهیم خان بەیارمەتی هۆزی دەلۆ و تیرەکانی رۆغزایی و تەرخانی لە خێڵی جاف بوو،[٨٣] لە سێلاوە شۆڕشگێڕەکان هێرشیانبردەسەر شار، لەلای رۆژئاواوە هێزی هێرشبەر توانی بچێتە ناوشارەوە و جەنگێکی خوێناوی لە گۆڕەپانی سەرادا روویدا، هێزەکانی ئینگلیز نارنجۆکیان فرێدەدایەسەر ئەو شۆڕشگێڕانەی هێرشیاندەبردەسەر سەرا، شۆڕشگێڕەکانیش یەك لەدوای یەك تەکانیان دەداو لە دەرگای سەرا نزیکدەبوونەوە، بەلاّم ناوەناوە دەگەڕانەوەدواوە لەبەر هێزی ئاگری شەستتیر و تەقینی نارنجۆك، لاشەی هەردوولا لەسەر رێگەکان و گۆڕەپانی سەرا کەوتبوون، ئینگلیزەکان بەرامبەر قارەمانێتی

شۆڕشگێڕەکان خۆیان نەگرت، شاریان لێبوو بە دۆزەخ، زیاتر لە پەنجا کەس لە سەرباز و پۆلیس کوژران، کاپتن سالمۆن فەرمانی دەرکرد کە سەربازەکان هەڵبێن و خۆیان بگەیەننە ئۆردووی بەریتانی لە رۆژئاوایی شار، بەلاَم ئۆردووش ئابلۆقەدرابوو، کاپتن سالمۆن ویستی لە دەرگای پشتەوەی سەرا بچێتەدەرەوە تاکو هەڵبێت[٨٤] بەرەو سەربازگەکەیان لە کنگربان، بەلاَم شۆڕشگێرەکان سالمۆنیان بینی و ناچاریانکرد خۆی بەدەستەوەبدات، بەیاریدەی هەندێ لە پۆلیسەکان سەرۆکی پۆلیس هەڵهات و خۆی گەیاندە ئۆردووی بەریتانی لە کنگربان(٨٥) هەرچەندە شەڕەکە لەڕووی هێزی سەربازی و چەك و تەقەمەنییەوە نابەرامبەر بوو وەلێ بەهۆی خۆبەختکردنی جەنگاوەرەکانەوە توانیان سەرکەوتن مسۆگەربکەن.

پاش ئەو جەنگە خوێناوییە جەماوەری راپەڕیو توانیان ئینگلیزەکان لە شارەکە دەربکەن رووبەرێکی فراوانی دەوروبەری ئازادبکەن،[٨٦] ئەو هێزانەی دوژمن کە لەشارەکەدا بوون لەگەڵ ئەفسەری سیاسی ناوچەکەدا کاپتن سالمۆن هەموویان بەدیلگیران و ئالاَی بەریتانیا هێنرایەخوارێ[٨٧]و ئیدارەیەکی کاتییان[٨٨] بە سەرۆکایەتی ئیبراهیم خان و ئەندامانی ئەنجوومەنی ئیدارەکە بریتیبوونلە (ئەکبەر خان و وەیسی بەگی دەلۆ و حەمید عەبدولڕەحمان کارێزی و حەمە جان رۆغزایی[٨٩]و حاجی محەممەد تەرخانی و کاکەمەند ئەمین دەروێش) لە

کفری دامەزراند،[٩٠] ئەم هەنگاوانە مەغزا و رەهەندی ئیدارەیەکی خۆجێیەتی هەبوو لەناوچەکەدا گوزارشتی لە خواستی جەماوەری ناوچەکە دەکرد کە کاردانەوە و دەربڕی ئەو پێشنیار و داخوازییانە بوو کە پێشکەش بە بەریتانییەکان کرابوون و ئەوان لە جێبەجێکردنی خۆیان دەدزییەوە.

ج. گفتوگۆ و دانووستانی نێوان هەردوولا

سوپای ئینگلیز دووجار بە هێز و زەبروزەنگ ویستی کفری بگرێتەوە پێینەگیرا ناچاربوو لەگەڵ ئیبراهیم خانی دەلۆ کەوتە گفتوگۆکردن، شۆڕشگێڕان (محەممەد سەعید وەنداوی)[٩١]یان بە نوێنەری خۆیان هەڵبژارد و بەریتانییەکانیش (موراد موبارەك) سەرۆکی (شەبانە) یان بە نوێنەری خۆیان هەڵبژارد و هەردوو نوێنەر هەر لەوکاتەی کە ئینگلیزەکان لە دەرەوەی شار بوون کۆبوونەوە،[٩٢] نوێنەری ئینگلیزەکان ئامادەیی خۆیان نیشاندا بەوەی ئیبراهیم خان حاکمی سیاسی سالمۆن ئازادبکات و ئەوا پەنجا هەزار روپیی پێدەدرێ و دەکرێ بە قایمقامی کفری، بەهیچ شێوەیەك ئیبراهیم خان قایلنەبوو بەو بەڵێنانە و لە هەڵوێستی شۆڕشگێڕانەی پاشگەزنەبووە و راپەڕینەکەی بەردەوامی خۆی وەرگرت، وەڵامی خانی دەلۆ ئەوەبوو پێیڕاگەیاندن کە ئازادکردنی سالمۆن پەیوەستە بە ئازادکردنی شێخ مەحمودی حەفید لە دیلێتی و

گێڕانەوەی بۆ سلێمانی ئەگەر ئەو مەرجانەیان جێبەجێبکرێ نەك هەر قایمقامی ناوێ، بەڵکو خۆی پەنجا هەزار رووپیێ دەدا بـــە ئینگلیزەکان، [٩٣] ئەو داواکارییانە ئەوەی خستەڕوو کە گەلی کورد بە دەستگیرکردنی شێخ مەحمود دەستبەرداری شۆڕش و راپەڕین و یاخیبوون نابن و ئامانجیان لە هێنانەوەی شێخ بە مەبەستی برەودان بوو بە دۆزی کورد، مکوڕبوون لەسەر داواکارییەکانی خۆیان کە پێشکەشی بەریتانییەکان کرابوو گرنگترینیان بریتیبوولە هێنانەوەی دەستبەجێی شێخ مەحمود لە هیندستانەوە بۆ کوردستان و ئازادکردنی و دامەزراندنەوەی دەستەلاتدارێتی کوردستان بە رابەرایەتی شێخ، [٩٤] ئەم وەڵامەی شۆڕشگێڕان ئەوەندەیتر ئینگلیزەکانی قەڵس و تووڕەکرد.. بۆیە دووبارە ناچاربوون بە هێز و بە شەڕ کفری بگرنەوە بۆ ئەم مەبەستە (دگلس)ی جێگری سالمۆن لەگەڵ شێخ وەهاب تاڵەبانی و عەبدولکەریم وادی ئاغا زەنگەنە کۆبوونەوە و بە هێزێکی گەورەوە خۆیان بۆ گرتنەوەی شار ئامادەکرد. [٩٥]

باسی دووەم:

أ. هێرشکارییەکانی ئینگلیز بۆ داگیرکردنەوەی شاری کفری

کاتێك سوپای بەریتانیا هەوڵیاندەدا شارەکە داگیربکەنەوە پێکدادان لەنێوانیاندا روویدا، شۆڕشگێڕەکان توانیان چەندین

دەستکەوت بەدەستبهێنن لە گرتنی چەکی قورس و تەقەمەنی و زیاتر لە (٥٠) سەرباز و بەکرێگیراوی ئینگلیزیان لەوشەڕەدا کوشت.[٩٦]

لە گەرمەی شەڕدا حەمید عەبدولڕەحمان کارێزی کە یەکێك بوو لە فەرماندەکانی ئەو راپەڕینە بوونە قوربانی، دەنگوباس بڵاوبووە گوایە ئیبراهیم خان کوژراوە دەنگوباسەکە گەیشتە رەشید محەمەد سەنجان کە پاراستنی سالمۆنی پێسپێدرابوو، ئەویش دەستیدایە تفەنگ و روویکردە کاپتن سالمۆن دەستبەجێ کوشتی، ئیبراهیم خان ئەم کارەی زۆر پێناخۆشبوو، چونکە بڕوایوابوو نابێت دیل بکوژرێ، وەکو سزایەك رەشیدی دەرکرد، رەشیدیش بۆخۆی تامرد بە رەشە حاکمکوژ ناوبانگیدەرکرد، بەم کردەوەیەش بارودۆخەکە زیاتر رووی لە ئاڵۆزیــکرد،[٩٧] ئیتر ئینگلیزەکان نەخشە و پلانەکانیان بۆ گرتنەوەی شاری کفری کارا و ئەکتیڤکرد.

هەرچەندە شۆڕشگێڕەکان زۆر جەنگاوەرانە بەرەنگاری هێزی داگیرکەر بوونەوە، لەئەنجامیدا هەردوولا گەلیکیان لێکوژرا و برییندداربوو، بەلاّم بۆیاننەکرا رێگایان لێبگرن نەچنە ناوشاری کفرییەوە،[٩٨] سەرباری بەردەوامبوونی ئەو ئامادەباشی و فیداکارییەی شۆڕشگێڕان، بەڵام نەیانتوانی پارێزگاری لە شاری کفری بکەن ئینگلیز جارێکیدیکە شارەکەیان داگیرکردەوە[٩٩] لە ١٠ی ئەیلولی ١٩٢٠ چوونەناو شاری کفرییەوە،[١٠٠] دوای گرتنەوەی شاری کفری ئینگلیزەکان

تاڵان و بڕۆیەکی زۆریان کرد،[١٠١] و بێبەزەیانە کەوتنە داپڵۆسینی خەڵکی ناوچەکە.

پێدەچێت توانا سەربازی و ئابوورییەکان کاریگەرییان هەبووبێت لەسەر شکستخواردن و پاشەکشەکردنی خەڵکی راپەریوی ناوچەکە، چونکە هیچ هاوسەنگییەك لەنێوان هەردوولادا نەبوو لەڕووی توانا لۆجستیکی و سەربازییەوە ئینگلیزەکان باڵادەستبوون.

هەرچەندە ماوەی ئەو راپەڕینە کەمبوو، بەڵام دەنگدانەوەیەکی زۆری هەبوو، کاریگەری لەسەر بۆچوون و رەفتاری دەسەڵاتدارانی ئینگلیز هەبوو بۆئەوەی میکانیزمی سیستەمی بەڕێوەبردنی خۆیان لە ناوچەکە بگۆڕن.

ب. هاوخەباتی نێوان خانەقین و کفری

لە سەرهەڵدانی ساڵی ١٩٢٠ خانەقین و کفری و دوزخورماتوو لە خەباتی سیاسی و چەکداری و بوارە جیاوازەکانیدیکەی تێکۆشاندا هاوسەنگەر و هاوکاری یەکتربوون و بەهاوبەشی جموجۆڵی چەکدارییان نواند، ئەو نیشتیمانپەروەرانەی کە لە گەرمیان سەربە شێخ بوون هاوڕابوون و راپەڕینی گەلی عێراقیان لە ساڵی بیستدا بە هەلێکی گونجاو زانی و ئاڵای شۆڕشیان هەڵکرد،[١٠٢] بەتایبەت ئەو سەرۆکهۆزە کوردانەی کە وەڵامی بانگەوازەکەی شێخ مەحمودیان دایەوە کە پێش شەڕی ١٩ی حوزەیرانی ١٩١٩ (شەڕی دەربەندیبازیان)، کە نێردراوی

شێخ مەحمود پەیامی شێخی گەیاندە برایم خانی دەلۆ لە کفری و خورشید بەگ لە خانەقین لە وەڵامی نامەکەیدا بەپیریی بانگەوازەکەیەوە چوون، بەڵام بەهۆی کارەساتی دەربەندیبازیانەوە، پریشکی شۆڕشەکەی شێخ هەموو ناوچەکانی نەگرتەوە،(١٠٣) وەك لەپێشتر ئاماژەمانپێدا پەیوەندی لەنێوان شێخ و کەسایەتییە دیارەکانی ناوچەکە هەبوو.

لەو سەروبەندەدا ئیبراهیم خانی دەلۆ پەیوەندی بە خورشید بەگی دەلۆوە کرد تا ئەویش خانەقین لە دەستی داگیرکەر دەربێنێ، خورشید بەگ پەیوەندی بە کەسانی ناو هۆزەکەی و تێکۆشەرانی خانەقین و دەوروپشتییەوە کرد، بەمەش لە رۆژی ١٤ی ئابی ١٩٢٠دا راپەڕین بەرپابوو، کاپتن ماترسۆن (جێگری حاکمی سیاسی شاری خانەقین) خۆی و هاوسەرەکەی و دەستودایەرەکەی بەرەو شارۆچکەی قۆرەتوو هەڵاتن،(١٠٤) لەکاتێکدا کە نۆژدارێکی ئینگلیزی بەدیلی کەوتەدەست شۆڕشگێڕان و پەیمانی ئەوەیانپێدا گیانی پارێزراوبێت لەبەرامبەر چارەسەرکردن و بایەخدانی بە نەخۆش و بریندارەکانی شاری خانەقین.(١٠٥)

ج. هاوخەباتی نێوان دوزخورماتوو و کفری

رەفعەت سمایل بەگی داودە سەربە شێخ مەحمود بوو لەگەڵ ئیبراهیم خانی دەلۆدا هاوڕابوون و رێکەوتن لەسەرئەوەی فشاربخەنەسەر

بەریتانیا تاکو شێخ لە دیلیەتی ئازادبکرییت و بگەڕێتەوە کوردستان و سەرباری ئەوەش ناوچەکانی گەرمیان رزگاربکەن و حکومەتێکی خۆجێیەتی لەناوچەکەدا دابمەزرێنن، بڕیاریاندا لەیەککاتدا هەردوولا راپەڕین بەرپابکەن[١٠٦]، مێژوونووسان باس لەوەدەکەن رێکەوتنیکی پێشوەخت هەبوو لەنێوان ئیبراهیم خانی دەلۆ لە کفری و خورشید بەگ دەلۆ لە خانەقین و رەفعەت سمایل بەگی داودە لە دوزخورماتوو هەر سێلا کەوتنە دانووستاندن و بیروڕاگۆڕینەوە سەبارەت بە هەڵگیرساندنی راپەڕینێکی چەکداری لە ناوچەکانی دوزخورماتوو و کفری و خانەقین و ناوچەکانیتری دەوروبەر دواتر راپەڕینیان دژبە داگیرکەران بەرپاکرد.[١٠٧]

جەنگاوەرانی هۆزی داودە بە فەرماندەیی رەفعەت بەگی سمایل بەگی داودە بە هاوکاری و بەشداربوونی تورکمان و عەرەبەکان (رەفعەت بەگ داودە لەگەڵ فارس بەگی سەرۆکی خێڵی بەیات و هۆزی (سائح)ی عەرەبیدا هاوکاری یەکتربوون) بە کورد و تورکمان و عەرەبەوە شاری دوزخورماتوویان لە٢٠ی ئابی ١٩٢٠دا رزگارکرد و ئاڵای بەریتانیایان هێنایەخوارەوە و ئەنجوومەنێکیان بە سەرۆکایەتی رەفعەت بەگ داودە دامەزراند و رەواجیان بە پارەی عوسمانیدا و ئەمن و ئاسایشیان بۆ شارەکە دابینکرد،[١٠٨] بەڵام ئازادی شاری دوزخوماتوو زۆری نەخایاند و لە رۆژی ٢٨ی ئابی ١٩٢٠ هێزەکانی بەریتانیا چوونە ئاوایی رەفعەت بەگ داودە و پاش سەعاتێك شەڕ هێزەکانی رەفعەت بەگ شکان و

دەغلّودان و باخەکانیان سووتاند و لەپاشاندا هێزەکەی ئینگلیز چوونە دوزخورماتوو ئینجا بەرەو سەربازگەی کنگربان هێرشیانبرد.(١٠٩)

سەرباری ئەو راپەڕینانەی کە لە گەرمیان سەریهەڵدا لە ئابی ساڵی **١٩٢٢** لە رانییە کێشەیان سەریهەڵدایەوە و هەروەها لە ناوچەی ئامێدیش گردبوونەوەی جەماوەری روویدا، بەریتانییەکان پشتئەستووربوون بە هێزی (لیڤی)، بەڵام شکستیانخوارد و رانییەشیان چۆڵکرد بۆ تورکەکان کە ئۆزدەمیر (عەلی شەفیق) کە ئەفسەرێکی تورك بوو بە پلەی (عقید) سەر بە کەمالییەکان بوو و سەرپەرشتی هێزی تورکەکانی دەکرد، لەلایەکیترەوە گەڕانەوەی مەحمود خانی دزلی کە داخوازی دەسەڵاتێکی کوردی دەکرد لەژێر سەرپەرشتی شێخ محمودی حەفید.(١١٠)

تەوەری سێیەم:
ناوچەی کفری لەنێوان ساڵانی ١٩٢١- ١٩٤١
باسی یەکەم: شاری کفری یەکەم وێستگەی
خەباتی شێخ مەحمود بوو لە ساڵی ١٩٢٢

ئەدموندز لە کتێبی (کورد تورك عەرب)دا دەڵێت: **"**ئێوارەی رۆژی **٢٠**ی ئەیلولی **١٩٢٢** لە بەغدادەوە بە سواری شەمەندەفەر

دەچوومە کەرکوك شێخ مەحمود و نوئیل لەو شەمەندەفەرەدا بوون، بۆ ڕۆژی دوایی گەیشتینە وێستگەی کنگربان سەدان سوارەی عەشایەر کە بۆ پێشوازیکردن هاتبوونە وێستگەی شەمەندەفەرەکە لە کنگربان، ئەوانە بە دروشمدان و ڕاوەشاندنی ئاڵاوە شاڵاویان بۆ وێستگەی شەمەندەفەر هێنا و ئەو جەماوەرە لە دەوری شێخ مەحمود کۆبوونەوە و شێخیان بە شادمانییەوە لە شەمەندەفەرەکە هێنایەخوارەوە". [١١١]

شێخ کاتێ لەدووره ولاتی گەڕایەوە ولە**٢١**ی ئەیلولی**١٩٢٢**دا گەیشتە شاری کفری، حەشاماتێکی گەورە و قەرەباڵغ لەپێشوازیدا بوون، منداڵ و گەورە و ژن و پیاو، کورد و عەرەب و تورکمان لەهەموو هۆز و تایفە و خێڵێك بە سواری ئەسپ و ماین و وڵاخ و بە چەکی دەستیانەوە زۆربەشی بەپێ ئەو دەشتەی نێوان کفری و وێستگەی شەمەندەفەریان لە کنگربان گرتبووەبەر، هێنانەخوارەوەی شێخ لە شەمەندفەرەکە دیمەنێکی زۆر هەستبزوێنەر و سەرنجڕاکێشبوو تەنانەت نەیانهێشت پێی بەر ئەرز بکەوێ هەر بەباوەش لە فارگۆنی شەمەندەرەکە دایانگرت و یەکسەر خستیانەسەر نۆما ماینێکی ڕەنگئاڵ [١١٢] کە بەتایبەت بۆ ئەو ئامادەیانکردبوو، دانیشتوانی کفری بەهەموو توێژەکانیەوە و هەموو هۆز و تیرە و تایەفە و بنەماڵەکانی شار و دەوروبەر و ناوچەکانی کوردستان لەپێشوازیدابوون، لە پێشەنگیانەوە شاندێکی سلێمانی بەدیدەکرا وەك مستەفا پاشا

یامولکی و حەمەی ئەوڕەحمان ئاغا و چەندانیتر بەتایبەت بەم بۆنەیەوە هاتبوونە شاری کفری، هەروەها لە بنەماڵەی سەییدەکانی کفری گەورە پیاوی ئەو سەردەمەیان (سەیید محسن ئاغا)و بابان زادە جەمیل بەگ و لە هۆزی زەنگەنە (عەلی ئاغای زەنگەنە) و لە بەگزادەکانی جاف کەسانێکی ناوداریان وەکو (کەریم بەگ و حەمە بەگ (١٩٠٠-١٩٣٤))و لە هۆزی دەلۆ (عەزیزی برایم خان (١٩١٠ -١٩٦٧) و شەرەفی برایم خان (١٩١٢ - ١٩٩٩))و پالآنی و گێژ و.. هتد لە ڕێوڕەسمی هاتنەوەی شێخدا ئامادەبوون،[١١٣] ڕۆژی ٢١ی ئەیلولی ١٩٢١ بە ڕۆژێکی پرشنگدار دەژمێرییت، لە مێژووی شاری کفریدا لەم ڕۆژەدا دانیشتوانی شار بە گەورە و بچووکەوە بە سوارە و بە پیادەوە بەرەو ئێستگەی شەمەندەفەر بۆ (کنگربان) کەوتنەڕێ، ئێستگەکە کەوتبووە ڕۆژئاوای کفری بە حەوت کیلۆمەترەوە، سوارەی هۆزەکانی دەوروپشتی شار بە کورد و عەرەبەوە ئابلۆقەی ئێستگەکەیان دابوو، بەیداخی ڕەنگاوڕەنگ دەشەکایەوە تەپڵ و دەفلێدان و بانگ و ئاوازی پیادە و سواران گوێی دوژمنی کەڕکردبوو، هەرکە شەمەندەفەر وەستا و دیمەنی شێخ دەرکەوت ئەوا دەنگ و ئاواز تەپڵ و دەف و تەقەی تفەنگ تێکەڵ یەکتریبوون، ئەو جەماوەرە بەچەند سەعاتێك ئەوسا توانیان بگەنە کفری و لە دەرگای شاریشدا ئافرەت بە هەڵهەڵە و زاڕۆڵەوە، منداڵانیش بە چەپڵەلێدان پێشوازی شێخیان دەکرد، شێخ لە ماڵی

(سەیید **محسن** ئاغای بەرزنجی)دا دابەزی و سی رۆژ هەر خەڵك بوو بشەپۆلیاندەدا و بەخێرهاتنی شێخیان دەکرد، شێخ **محمود** هەرکە لە شەمەندەفەر دابەزی چاوی گێڕا (ئیبراهیم خان)ی نەبینی دەنگینەکرد تاگەیشتە قۆناغ لەوێ کە سۆراغیکرد و زانی (ئیبراهیم خان) کۆچیدواییکردووە، فرمێسکی رژاند و وتی: خەڵکینە کە دیلبووم ئینگلیزەکان پێیانوتم لەم شارە (حاجی ئیبراهیم خان) هەستاوە و داوای گەڕانەوەتدەکات، منیش بۆمدەرکەوت ئەوە (ئیبراهیم خان)ی خۆمانە، داخەکەم ئەم شەش سالە نەمبینیوە و ئیتر نایبینمەوە، داوایکرد هەردوو کوڕەکەی (عەزیز و شەرەف)ی لەملاولای خۆیەوە دانا و سەرو سەعاتی خەڵاتکردن و ئامۆژگاریکردن کە رێڕەوی باوکیان بـــــگرنەبەر. (١١٤)

ئەو پێشوازییە گەرمە کە لەلایەن خەڵکی باشووری کوردستان بەگشتی و ناوچەی کفری بەتایبەتی لە شێخ مەحمود کرا دەلالەت لە وەرچەخانێکی نوێ لەهەمبەر دۆزی کورددا دەکات. مامۆستا رەفیق حیلمی (١٨٩٨ - ١٩٦٠) لەیاداشتەکەیدا دەڵێت: "نزیکەی بیست هەزار لە سوارانی کورد کۆبوونەوە"(١١٥) لەو گەڕاوەنەوەدا میجەر نۆئیلی راوێژکاری بەریتانیا یاوەری شێخ بوو، ماوەی (٣) رۆژ لەکفریدا ماونەتەوە لەو ماوەیەدا میوانی سەیید **محسن** ئاغای کفری بوون لەگەڵ زۆر لە کەسایەتی ناوداری ناوچەکە لەو چەند رۆژەدا کۆبوونەوە و

گفتوگۆیان سەبارەت بە داهاتووی کوردستان و چۆنیەتی مامەڵەکردن لەگەڵ رووداوە چاوەڕوانکراوەکاندا تـــاوتوێکراوە.[١١٦]

ئەو چەند رۆژە سەرانی هۆزی کوردی کەرکوك هەموویان روویانکردە کفری بۆ بەخێرهاتنەوەی شێخ مەحمود،(١١٧) وەنەبێت هاتنەوەی شێخ مەحمود بەتەنها مایەی گەشاندنەوەی ئومێدی کورد بێت، بەڵکو سەرانی هۆزی بەیات لەناوچەکەدا هەموو چوون بەپیری شێخەوە و دواتر لەگەڵی چوونە سلێمانی و لە ئاهەنگی جەژنی حوکمدارییدا هاوبەشبوون.[١١٨]

ئەو شاندانەی کە لەهەموو ناوچەکانی کوردستانەوە، بە بۆنەی هاتنەوەی شێخەوە گەیشتبوونە کفری لەو رۆژانەدا دوو کۆنگرەی گەورەیان گرێدا، لەم کۆنگرانەدا کۆمەڵێك بڕیاری گرنگیاندا وەکو:

دانانی شێخ مەحمود بە مەلیکی کوردستان و بەرزکردنەوەی برووسکەی سوپاسنامە بۆ حکومەتی بەریتانیا بە بۆنەی دانانی شێخ مەحمود لەلایەن کەسایەتییەکانی کوردەوە بە مەلیکی کوردستان و دامەزراندنی حکومەتی کوردییەوە، مستەفا پاشا یامولکی لەناوجەماوەرەکەدا هەستا و وتارێکی بایەخداری پێشکەشکرد و مژدەی دامەزراندنی حکومەتی کوردستانی راگەیاند،[١١٩] پێدەچێت لەم کۆبوونەوەیەدا میتۆدی کارنامەی شێخ مەحمود و کەسایەتییەکانی کوردستان بۆ ئاییندەی ناوچەکە، دەستنیشانکردنی فەرمانڕەوایەك بێت

بە سەرۆکایەتی شێخ مەحمود دواتر بەشێوەی پراکتیکی لەسەر ئەرزی واقیع لە شاری سلێمانی جێبەجێکرا.

شێخ هەر لە کفرییەوە بۆ سلێمانی بەڕێوەبوو، ژمارەیەکی زۆر سەرۆکخێڵ و گەورە پیاوانی کورد یاداشتێکیان وەك بەڵگەنامە ئیمزاکرد، بۆ پشتگیری داواکردنی دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردی بە سەرۆکایەتی شێخ مەحمود.(١٢٠)

لەڕێگای گەڕانەوەیدا بۆ سلێمانی شێخ هەستی بەوەکردبوو هەموو جموجۆڵێکی خۆی و هاوکارانی لەژێر چاودێرییدایە(١٢١) بۆیە لەناو داودە و تاڵەبانی و گل و قادر کەرەم و زەنگەنە و دەشتی سەنگاو و دەربەندی باسەڕە و دێلێژە و سوڵە بە سوار و لەشکرەوە گەیشتنە (داریکەلی)،(١٢٢) گەڕانەوەی شێخ بە سواری ئەسپ و بە یاوەری سەیید **محەممەد** سەرۆکی جەباری و رەفعەت بەگ و عەزیز عەباس ئاغا و عەلی ئاغا سەرانی داودە و عەلی حەسەن ئاغا و حەمە ئاغای کەریم ئاغا و غەفور جاسم ئاغا لە سەرانی زەنگەنە و سلێمان بەگ و فارس بەگ و **محەممەد** حەسون لە سەرانی بەیات.. هتد نزیکەی هەزار سوار دەبوون لەگەڵ شێخ چوونە دارێکەلی و بەشدارییان لە ئاهەنگی دامەزراندنی حکومەتی کوردستاندا کرد.(١٢٣)

لە ١٥ی تشرینی یەکەمی **١٩٢٢** فەرمانی دامەزردانی حکومەتی کوردستانی دەرکرد و دوو سەرۆکهۆزی گەرمیان (عەلی

حەسەن ئاغای زەنگەنە و رەفعەت سمایل بەگی دوادە) بە گەورەی یاوەرانی شێخ دامەزران،[١٢٤] لەماوەی هەفتەی یەکەمی تشرینی دووەمی هەمانساڵ کەسایەتییەکانی شارەکانی کەرکوك و کفری و خەڵکی رەواندوز و رانییە چوونە سلێمانی و سەردانی شێخ مەحمودیان کرد و هاوسۆزی خۆیان نیشاندا.[١٢٥]

شاری کفری بەهۆی ئەوەی کەوتبووە چەقە رێگای سلێمانی و بەغداوە ئەو رۆژنامانەی لەو سەردەمەدا دەردەچوون دەگەیشتنە شاری کفری، وەك ئەحمەد خواجە لە بیرەوەییەکەیدا (چیمدی) باسدەکات "لەسەردەمی حکومەتی شێخ مەحموددا رۆژنامەی ئومێدی ئیستقلال (امیدی استقلال) (٥٠٠) دانە لەو رۆژنامەیە لە پۆستەخانەی کفرییەوە دەنێردرا بۆ ئینگلیزەکان و پیاوە ناسراوەکان لە بەغدا " ئەمەش کارێگەری لەسەر جووڵانەوەی رۆشنبیری ناوچەکە هەبوو.[١٢٦]

دانیشتوانی ناوچەی کفری هاوسۆزیان لەگەڵ حکومەتی شێخ مەحموددا هەبوو، جگەلەوەش پاڵپشتی گەشەکردنی زانست و رۆشنبیرییان کردووە وەك لە رۆژنامەیەکی ئەو سەردەمەدا هاتووە "یاوەری حەزرەتی شەهریاری عەلی ئاغا سەرۆکی زەنگەنە (١٠٠) روپیەی بەخشیووە بۆ هێنانی چاپخانەیەك[١٢٧]" ئەمەش ئەو راستییە ئاشکرادەکات بەشێك لە خەڵکی ناوچەی کفری بەهەموو شێوەیەك پشتگیری بەرەوپێشچوونی حکومەتی ئەو سەردەمەی کورد بوونە.

## باسی دووەم: ڕۆڵی خەڵکی ناوچەی کفری لە شەڕی ئاوباریکدا ١٩٣١

شێخ مەحمود تائەوکاتە چاوەڕوانی پێشهاتەکان بوو، سەرلەنوێ تاویدایە چەك و بەرهەمی باشی لێوەدەستهێنا و تەنانەت هەوڵی ڕزگارکردنی کەرکوکیشی دا،[١٢٨] ئەمجارە جووڵانەوەکەی مۆرك و شێوازێکیدیکەی بەخۆوەگرت، لەئاکامی ئەو نامە و داوایانەی لەلایەن ژمارەیەك لە سەرۆکهۆزەکانی سنووری کەرکوك و گەرمیانەوە ئاراستەی شێخ مەحمودی حەفید کرابوون،[١٢٩] بیروبۆچوونی شێخ هاتەسەر ئەوەی چالاکییەکانی بۆ گەرمیان و دەوروبەری کەرکوك بگوازێتەوە، بە هاوکاری دۆست و لایەنگرانی لە هۆزەکانی: "جاف، هەمەوەند، زەنگەنە، جەباری، داودە، تاڵەبانی، دەلۆ.. هتد" پەلاماری هێزەکانی حکومەت لە نزیك شاری کەرکوك بدەن و ناوچەکە بندەستبکەن.[١٣٠]

ڕزگارکردنی شاری کەرکوك و دەوروبەری بووە ئامانجی سەرەکی شێخ و هاوکارانی لەو قۆناغە مێژووییەدا بۆ ئەو مەبەستە شێخ گەیشتە ناوچەی (گل) بۆ پلاندانان و کارکردن بۆ ئەو ئامانجە، لە ماڵی کەسایەتی ناسراوی ناوچەکە شێخ مەجید تاڵەبانی خاوەنی گوندی (ئاوباریك)[١٣١].

رۆڵی ناوچەی کفری لەم بزاڤ و جووڵانەوەیەدا ئەوەبوو هۆزی جاف بە سەرۆکایەتی کەریم بەگی فەتاح بەگی جاف و براکانی لایەنگیری شێخ مەحمود بوون و شاری کفری کەوتەمەترسییەوە، شێخ مەحمود لەوەدڵنیابوو کە هێزی هۆزەکانی جاف و دەلۆ دەتوانن شاری کفری رزگاربکەن، لەبەرئەوە هێزەکانی خۆی بە فەرماندەیی شێخ جەلالی حەفید و هێزی جەباری و هەمەوەند و داودە بۆ رزگارکردنی شاری کەرکوك تەرخانکردبوو.(١٣٢)

لە یەکێك لە گرنگترین لایەنەکانی ئەم راپەڕینە شەڕی (ئاوباریك)بوو، لە (٥)ی نیسانی **١٩٣١** لە مەڵبەندی کفری توانیان رووبەڕووی هێزێکی گەورەی حکومەتی عێراقی ببنەوە لەگەڵ ئەوەی فڕۆکەکانی بەریتانیاش بەسەریانەوە بوون(١٣٣) بەرەنگارییەکی کەمهاوتا و کەموێنەیان کرد.

لە رۆژی ٤ی نیسانی **١٩٣١**، کاتێك شێخ مەحمود و ژمارەیەك لە کەسایەتییە ناودارەکانی کەرکوك و گەرمیان لە گوندی ئاوباریك کۆبوونەوە، هەواڵ دەگاتە دەزگای هەواڵگری هێزی ئاسمانی بەریتانی لە عێراق کەوا شێخ مەحمود و دۆستانی لەو ناوچەیەدان، دەزگای ناوبراویش لەلایەن خۆیەوە خێرا حکومەتی عێراقی لەو پێشهاتە ئاگاداردەکاتەوە،(١٣٤) رۆژی پاشتر هێزێکی گەورە پێکهاتبوو لە سەدان سەرباز و پۆلیس و بەکرێگیراو بە فەرماندەیی ئامیر لیوا (رمضان باشا)

بەپاڵپشتی تۆپ و مەتریلۆز و چەکی قورس هێرشیانکردەسەر هێزەکانی شێخ مەحمود لە گوندی ئاوباریك.(١٣٥)

هۆزە بەشداربووەکانی کفری و دەوروبەری لە بزووتنەوەکەی ئاوباریکدا چەندین کەسایەتی و سەرۆکهۆز بە خۆیان و جەنگاوەرکانیانەوە ئامادەبوون وەك"عوسمان بەگ (١٨٩١-١٩٦٨) سەرۆکی شەرەفبەیانی، کەریم فەتاح بەگ سەرۆکهۆزی جاف، بەشێك لە شێخانی تاڵەبانی و ئاغایانی زەنگەنە" بەشداری شەڕی ئاوباریکیان کرد،(١٣٦) هەروەها هۆزی گەلاڵی بە سەرکردایەتی حەمەی کەریم قوباد و حەمەی کوڕی سۆفی خواموراد یەعقوب و عەوەی مراخان و ژمارەیەك سوار لە ئاوباریك ئامادەبوون، هۆزەکانیدیکەی ناوچەکە بەشداری تەواویان لە شەڕ و ڕووبەڕووبوونەوەکاندا کرد، ئەو ڕۆژە شەڕ دەستیپێکرد تائێوارە شەڕێکی زۆر گەورە بوو فڕۆکەکانی ئینگلیزەکان بەهەموو چەکێك کەوتنەوێزەی خەڵکی ناوچەکە،(١٣٧) لەو شەڕەدا فڕۆکەیەك دەپێکرێت و لەنێوان گوندەکانی (تەپەسـپی)و(عەلیان)دا(١٣٨) دەکەوێتەخوارەوە،(١٣٩) هەروەها لەو شەڕەدا فڕۆکە جەنگییەکان بۆردمانی سەرقەڵایان کرد هەرچەندە لە مەیدانی شەڕەکەوە دووربوو، بەڵام لەبەرئەوەی کۆمەکی هێزەکانی شێخ مەحمود لەوێوەدەکرا بۆیە بۆمبابارانیانکرد تاکو ڕێگای هاریکاری شەڕەکە ببڕیت.(١٤٠)

سەرچاوەکان باس لە چەلەنگی و ئازایەتی چەندین کەسی سنووری کفری و گەرمیان دەکەن لەو شەڕەدا وەکو (داود بەگی جاف و عەبدولکەریم وادی ئاغای زەنگەنە و حاجی چاوشین و شێخ رەشید تاڵەبانی) تەنانەت شێخ مەحمود ستایشی داود بەگی بەشێر کـــــردووە،(١٤١) کاتێك شەڕەکە بەشکستی هێزەکانی کورد کۆتاییهات ئەوانەی بەشداری شەڕی ئاوباریکیان کردبوو وەك کەریم بەگ و براکانی و کەسانیتر، لە دۆڵ و هەردەکانی ناوچەکەدا تاماوەیەك بە قاچاخی مانەوە و خۆیان بەدەستەوەنەدا، بەڵام کاتێك شێخ مەحمودی حەفید کەوتەدەستی حکومەتی عێراقی و بۆ باشووری عێراق راپێچکرا، ئەوانیش لەسەر گفتی لێبوردنی گشتی خۆیان بەدەستەوەدا و بەرلێبوردن کەوتن و بۆ شاری کفری گەڕانەوە.(١٤٢)

ئەم شەڕە هەرچەندە بەشکستی بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد کۆتاییهات، بەڵام هاوکات هەڵگری پەیامێك بوو بۆ یار و نەیاری کورد کە میللەتی کورد دەستبەرداری داخوازیەکانی نابێت و لەهەر هەلومەرجێکدا بۆی بلوێت رووبەڕووی داگیرکەران دەبێتەوە.

## باسی سێیەم: رەنگدانەوەی راپەڕینی مایسی ١٩٤١ لەناوچەکدا

لەمانگی مایسی ساڵی ١٩٤١ کاتێك رەشید عالی گەیلانی بووە سەرۆکوەزیرانی عێراق، مانۆڕە سیاسی و دبلۆماسییەکان لەگەڵ

بەریتانیادا گۆڕا بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی سەربازی، ئەمەش تەنها ماوەی چوار هەفتەی خایاند (لە ۲ی مایس تاکو ۲۹ی مایس)، بۆ رزگاربوون لە هەیمەنەتی ئینگلیز لەلایەن عەرەبەکان و بەشێك لە ئاغا و کەسایەتییەکانی کوردەوە پشتگیری لەو هەنگاوەی گەیلانی کرا برووسکەی هاوسۆزی بۆ رەوانە کرا.(١٤٣)

تەنانەت (داود بەگی جاف و محەممەد حاجی نەعمان) هەردووکیان ئەندامی نوێنەران بوون لە پەرلەمانی عێراقدا لە کۆبوونەوەی رۆژی ١٠ ی نیسانی ١٩٤١ دەنگیان بۆ گۆڕینی جێنشینی تەختی پاشایەتی (عەبدولالە)دا و بڕیاریان لەسەر دانانی (شریف شرف)دا (١٤٤) بۆئەوەی ببێتە جێنشینی تەختی پاشایەتی.(١٤٥)

لە شاری خانەقین (کوێخا محەممەد)ی سەرۆکی تیرەیەکی هۆزی سوورەمەیری،(١٤٦) پاش ئەوەی لەسەردانێکدا بۆ شاری بەغداد لە (١ی مایسی ١٩٤١) بۆ خانەقین گەڕاوەتەوە و هەواڵی پێکدادانی لایەنگرانی بزووتنەوەکە و لایەنگرانی رژێمی پاشایەتی و ئینگلیزەکانی بلاوکردووەتەوە، لەلایەن بەرپرسانی شارەوە دەستگیرکراوە، ئەندامانی تیرەکەی و هۆزی سوورەمەیری بۆ رزگارکردنی سەرۆکەکەیان بڕیاری بەشداریکردنی بزووتنەوەکەیان داوە بۆئەو مەبەستەش توانیوویانە پشتیوانی هۆزەکانی (دەلۆ و گێژ و کاکەیی و باجەلان و شەرەفبەیانی) بۆ سەرخستنی بزووتنەوەکە و ئازادکردنی شارەکەیان لە دارودەستەی

ڕژێمی پاشایەتی بەدەستبهێنن،[١٤٧] جگەلەوەش هۆزەکانی (زەنگەنە و جەباری و شوان و داودە) لە ناوچەی کەرکوك و لە سنووری ناوچەکانی خۆیان بەشداری بزووتنەوەکەیان کرد و سەرخستنی ئامانجەکانیان بەسەرکەوتنی بزووتنەوەکەوە گرێدا.[١٤٨]

ڕۆژی **٣**ی ئایاری ١٩٤١ دانیشتوانی کەرکوك خۆپیشاندانێکی گەورەیان ئەنجامدا، بەناو شارەکەدا گەڕان و چوونە بەردەم سەرا و وتاربێژان گەلێك وتاری پشتگیریان خوێندەوە.[١٤٩]

(سەیید سلێمان) کابرایەکی چایچی بوو لە کفری و (حسێن بەلاو) ڕۆڵیان هەبووە لــــە پشتگیری ئەڵمانەکان و دژبە ئینگلیز بوون،[١٥٠] هەر لەو ساڵەدا قوتابیانی قوتابخانەکانی کفری چەندین خۆپیشاندانیان دژبە ئینگلیز ئەنجامداوە، لایەنگیری خۆیان بۆ ئەڵمانەکان نیشانداوە، شۆڕشی مایس بە شۆڕشی (مگوار)یان لەقەڵەمداوە چەندین دروشم و هوتافیان دژبە ئینگلیزەکان وتووە.[١٥١]

لەدوای شەڕی ئاوباریك لە **١٣**ی ئایاری ١٩٣١ شێخ مەحمود خۆی بە دەستی حکومەتی عێراقەوە دا، تاکو ساڵی ١٩٤١ ماوەی دە ساڵی ڕەبەق بەدەستبەسەری لە شارەکانی (سەماوە، ناسرییە، عانە، بەغدا) مایەوە،[١٥٢] لە هەرای ڕەشید عالی گەیلانی، توانی بەدزە لەڕێی کفرییەوە بەیارمەتی هۆزی دەلۆ و هۆزی ڕۆغزایی جاف، خۆی بگەیەنێتە (داریکەلی) لە ناوچەی سلێمانی،[١٥٣] عەلی کەمال

عەبدولڕەحمان لەبیرەوەرییەکانیدا باس لەوەدەکات کە شێخ مەحمود هەواڵی بۆ شێخ لەتیفی کوڕی ناردووە لەکاتی دیاریکراودا چەند سوارەیەك بنێرێتە وێستگەی شەمەندەفەری کنگربان بۆ ئەوەی شێخ بگەیننە سلێمانی،[١٥٤] بەڵام لەڕووی راستییەوە لە رۆژانی شۆڕشی مایسی ١٩٤١ شیخ مەحمود کۆتی دەستبەسەری شکاند هەواڵی بۆ دەروێش حسێن[١٥٥] لە خانەقین نارد بۆئەوەی لە دەستبەسەری لە بەغداوە بۆ کوردستان دەربازیبکات، وەکو لە یاداشتەکەی دەروێش حسێندا هاتووە پێش ئەوەی لە بەغداوە بکەونەڕێ چەند ئەسپ و ماینێکیان ئامادەکردبوو لەگەڵ( دەروێش عەزیزی مەحمود و حەمە ساڵح سلێمان (حەمە ساڵح دەلۆ و وەلی ناوێك) لە ماڵی عەزیزی برایم خانی دەلۆ چاوەڕوانی هاتنەوەی شێخ مەحمود بوون، لە رۆژی ٢٠ ی ئایاری ١٩٤١ بە ئۆتۆمبیلێك شێخ مەحمود و دەروێش حسێن لە بەغداوە کەوتنەڕێ و گەیشتنە کفری،[١٥٦] لەناو کفریدا لەپێش مزگەوتی خانەقا شێخ پرسیاری رێگای گوندی برایم خان دەکات لە کەسێك کە ناوی (سۆفی مەحمود)ە، ئەویش شێخ دەناسێت پەلاماریدەدات دەستی ماچبکات، بەڵام شێخ دەڵێت: (کورە وەختی نییە ئێمە پەلەمانە) ئەویش رێگایان پێنیشاندەدات، کاتێك پۆلیسێك ئەم هەواڵە دەزانێ حکومەت ئاگاداردەکاتەوە لە هاتنی شێخ مەحمود، ئەوکاتە (سەعید قەزاز لەنێوان ساڵانی (١٩٤٠ - ١٩٤١)) قایمقامی

کفری بوو، برووسکە بۆ سەرقەڵا و کەرکوك و بەغدا دەکات[١٥٧] سەبارەت بە گەڕانەوەی شێخ بۆ کوردستان ئاگاداریاندەکاتەوە. لە سەرقەڵاوە چەند پۆلیسێکی سوارە بە فەرماندەیی (مەدحەت بەگ)ی قومسێر دەکەونە سۆراخپرسینی شێخ، بەڵام کاتێك شێخ دەگاتە گوندی برایم خان لەدوای پشوویەکی کورت بەسواری وڵاخ ئەم چوار کەسە بەرەو سلێمانی بەڕێدەکەون (شێخ مەحمود، عەزیز برایم خان دەلۆ (١٩١٠-١٩٦٧)، دەروێش حسێن، میرزا عەزیز مەحمود رۆغزایی) بەرەو هەردەی زەنگەنە ملی رێگا دەگرنەبەر،[١٥٨] لە گوندی فتاح هۆمەری لای سەرقەڵاوە دەروێش سدیقی عەزیزی مەحمود ئەلی وەیس لەگەڵیان رۆیشت و شێخیان بەرەو سلێمانی بردەووە،[١٥٩] لە گوندی پەلەوشك (گوندێکە سەربە ناحیەی سەرقەڵا) ئەو مەفرەزە پۆلیسەی کە دوای شێخ و هاوڕێکانی کەتبوون شەڕ روویدا دوو ئەسپی پۆلیسەکان کوژرا ناچاری هەڵهاتنکران.[١٦٠] دوای پانزە رۆژ عەزیز برایم خان گەڕایەوە سەعید قەزاز کە ئەوکات قایمقامی قەزای کفری بووە، ناردی بەشوێنیا و چەند رۆژێك لەسەر ئەو هەڵوێستە بەندی کرد.[١٦١]

هێنانەوەی شێخ بەمەرامی هەڵگیرساندنەوەی شۆڕشێکی نوێ بوو، چونکە لە خوێندنەوەی هاوکێشە سیاسییەکاندا ئەو رۆژگارە عێراق بەرەو گێژاوی چارەنووسێکی نادیار دەچوو، کوردیش دەیویست ئەمجارە بەشەپشکی لە ئازادی و مافە نەتەوایەتییەکانی لە جاران زۆرتربێت.



پەراوێز و سەرچاوەکان:

١) (شعێبە) شارۆچکەیەکی بچووکە "١٠کم" ی باشووری خۆرئاوای شاری بەسرە کەوتووە کە لە (١٤ ی نیسانی ساڵی ١٩١٥) دووچاری شەڕێکی قورسی دوازدە کاتژمێری بوو کە لەبەری بەیانییەوە تا درەنگانێکی عەسر درێژەیکێشا. کەیوان ئازاد ئەنوەر، کورد لە چەند تۆمارێکی مێژوویيدا، چاپخانەی کارۆ، سلێمانی، ٢٠٠٥، ل١١٠.

٢) د. سەعدی عوسمان هەروتی، بزاڤی رزگاریخوازی کوردی، چاپخانەی وزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٦، ل٨٤، ٨٥، هەروەها بڕوانە: **محەممەد** رەسوڵ هاوار، شێخ مەحمودی قارەمان و دەوڵەتەکەی خوارووی کوردستان، ب ١، چاپخانەی بلاك رۆز، لەندەن، ١٩٩٠، ل٣٤٠.

٣) کەیوان ئازاد ئەنوەر، س. پ، ل١١٣.

٤) عومەر عەلی شەریف، رۆڵی گەلی کورد لە جەنگی شوعێبەدا، برایەتی (رۆژنامە)، ژ(٣٣٥٥)، ١٢/ ٢٠٠١/٤، ل١٠.

٥) د. ابراهيم خليل احمد و د. جعفر عباس حميدي، تاريخ العراق المعاصر، مطبعة التعليم العالي في الموصل، الموصل، ١٩٨٩، ص١٣.

٦) د. سەعدی عوسمان هەروتی، س. پ، ل٨٤، ٨٥.هەروەها بڕوانە: **محەممەد** رەسوڵ هاوار، س. پ، ب١، ل٣٤٠.

٧) عومەر عەلی شەریف، س. پ، ل ١٠.

٨) کەیوان ئازاد ئەنوەر، س. پ، ل١١٤.

٩) د. کەمال مەزهەر ئەحمەد، کورد و شەڕی شوعەیبە، رۆشنبیری نوێ (گۆڤار)، ژ (١٢٥)، ١٩٩٠، ل ٣٦، هەروەها بڕوانە: الملا جميل رۆژبەیانی، عهد الأستعمار

البريَطاني والعهود التالية، ت: انور مندلاوى، سردم العربي (مجلة)، تصدر عن دار سردم للطباعة والنشـر، ع(٢)، السنة الأولى، خريف ٣ ٢٠٠، ص١١٦.

١٠) سەبارەت بە ژمارەی ئەو کوردانەی کە بەشداری شەڕی شعێبەیان کردبوو رای جیاواز هەیە، هەندێك سەرچاوە باس لەوە دەکەن کە شێخ مەحمودی حەفید بە هەزار سوارەکەیەوە لە شاری کفرییەوە رۆیشتووە، بۆچوونێکیدیکە هەیە (٢) هەزار غەزاکەری کورد و تورکمان، هەندێك لە سەرچاوە ئینگلیزەکان بە سێ هەزاریان خەملاندووە. مستەفا نەریمان، پشکۆ یەکەم نووسەرە کە بیرەوەری خۆی دەربارەی شۆڕشی برایم خان تۆمارکردووە، الحكم الزاتی (ئۆتۆنۆمی) (گۆڤار)، ژ(٥٩)، ١٩٨٨، ل٥٣، هەروەها بڕوانە: شكرى محمود نديم، حرب العراق ١٩١٤ - ١٩١٨، مگبعه العانى، گ ٨، بغداد، ١٩٧٤، ص٣٠، هەروەها بڕوانە: د. کەمال مەزهەر ئەحمەد، کورد و شەڕی شوعەیبە، س. پ، ل ٤٠، هەروەها بڕوانە: عومەر عەلی شەریف، س. پ، ل١٠، هەروەها بڕوانە: مەحمود مەلا عززەت، حکومەتی کوردستان لەناو مەتەڵی سیاسەتی بەریتانیادا، چاپخانەی شڤان، سلێمانی، ٢٠٠٦، ل٥٣.

١١) محەممەد عەبدوڵڵا کاکە سوور، رۆڵی سیاسی و کەلتوریی ئەفسەرانی کورد لە بزاڤی کوردایەتی کوردستانی باشووردا (١٩٢١ - ١٩٤٥)، بڵاوکردنەوەی (سەنتەری برایەتی) زنجیرەی (٦)، هەولێر، ٢٠٠٠، ل٣٠، هەروەها بڕوانە: عبدالرحمن ادريس صالح البياتي، الشيخ محمود الحفيد (البرزنجى) والنفوذ البريَطاني في كردستان العراق حتى عام ١٩٢٥، مطبعة شڤان، سليمانية، ٢٠٠٧، ص٨٠.

١٢) برایم خان کوڕی ساڵح خان کوڕی ئەمین کوڕی عەبدوڵڵاکوڕی ئەحمەد بەگە، ساڵی ١٨٧٤ لە گوندی (هەیەرەکەل - حەیدرەکەل) لەدایکبووە لە تیرەی خوبیارەوەندی هۆزی دەلۆیە، برایم خان حەوت برای هەبووە بەم ناوانە (کەمەر، محەممەد، کاکەخان، حسێن، ئەکبەر، کەریم، حەمە ساڵح)، برایم خان هەر لە

منداڵییەوە لەلای مەلای گوند فێری نووسین و خوێندن بووە عەرەبی و فارسی دەزانی شیعری شاعیرانی وەك (مەولەوی، حەسەن کەنۆش، میرزا شەفیع، شێخ رەزا، خەلیل منەوەر)ی ئەزبەرکردبوو، بەدەستی خۆی کشتوکاڵی دەکرد، رۆحی شۆڕشگێڕی لە باوك و براگەورەکەی (کەمەر خان) وەرگرتبوو، لە ساڵی ١٩٢١ لە گوندی تەلشەرەف کۆچیدواییکرد. مستەفا نەریمان، شۆڕشی ئیبراهیم خانی دەلۆ ١٩٢٠، دار الحریە للگباعە، بغداد، ١٩٨٥، ل١٢٥-١٢٦.

١٣) مەحمود پاشای جاف لەبەر هەستی ئایینی لەسەر داخوازی عوسمانییەکان هەزار سواری جاف بە سەرۆکایەتی حەمە عەلی بەگی برای و کەریم بەگی برازای نارد بۆ شەڕی شعێبە، تۆفیق وەهبی بەگ لە شەڕی شعێبەدا یەکێك لە ئەفسەرە ناودارەکانی سوپای تورك بووە ئامۆژگاری سەرۆکهۆزە کوردەکانی کردووە، بەتایبەتی شێخ مەحمود و حەمە عەلی بەگی جاف کە بەخۆڕایی کورد لەپێناوی تورکدا بەکوشتن نـــــەدەن. د. حەسەن جاف، چەمکێك لە ژیانی مەحمود پاشای جاف (١٨٤٦-١٩٢١ز)، نەوشەفەق (گۆڤار)، مانگانەیەکی رۆشنبیرییە دەزگای شەفەقی رۆشنبیری لە کەرکوك دەری دەکا، ژ(٤)، تەموزی ٢٠٠٦، ل٢٣.

١٤) عومەر عەلی شەریف، س. پ، ل ١٠، هەروەها بڕوانە: مستەفا نەریمان، شۆڕشی ئیبراهیم خانی دەلۆ ١٩٢٠، س. پ، ل ١٦٩، هەروەها بڕوانە: مکرم الطالباني، ابراهیم خان ثائر من کردستان، مطبعة اسعد، بغداد، ١٩٧١، ص٥١.

١٥) مستەفا نەریمان و ئەدیب و نووسەران، س. پ، ل٨٨، هەروەها بڕوانە: سمکۆ بەهرۆز (ئەژی)، بیلۆگرافیای رۆشنبیران و ناودارانی کەرکوك، کەرکوك (گۆڤار)، ژ(٣٤)، ساڵی نۆیەم، پایزی ٢٠٠٧، ل١٠٦.

١٦) عومەر عەلی شەریف، س. پ، ل ١٠، هەروەها بڕوانە: حەسەن بارام، چەند لاپەڕەیەك لە مێژووی خورماتوو، چاپخانەی رەهەند، سلێمانی، ٢٠٠٧، ل١٠٩.

١٧) شکری محمود ندیم، حرب العراق ١٩١٤ - ١٩١٨، مطبعة العاني، ط ٨،

بغداد، ١٩٧٤، ص٣٠.

١٨) مەحمود مەلاعززەت، س. پ، ل٥٣.

١٩) د. ئیبراهیم خلیل احمد و د. جعفر عباس حەمیدی، م. س، ص١٣، هەروەها بڕوانە: عومەر عەلی شەریف، س. پ، ل ١٠.

٢٠) کەیوان ئازاد ئەنوەر، س. پ، ل١١٥.

٢١) عبدالرحمن ادریس صالح البیاتی، م. س، ص٨٦-٨٧.

٢٢) ژمارەیەك نوسەر و هونەرمەند، یادی دووسەد ساڵەی شاری سلێمانی، چ ٢، دەزگای راگەیاندنی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان ، ئۆفسێتی شڤان، سلێمانی، ٢٠٠٣، ل ٥٨.

٢٣) المس بیل، فصول من تاریخ العراق القریب، ت: جعفر خیاط، مطبعة دار الکتب، بیروت ـ لبنان، ١٩٧١، ص١٨٥، هەروەها بڕوانە: د. سەعدی عوسمان هەروتی، س. پ، ل٨٦.

٢٤) کامەران ئەحمەد محەمەد ئەمین (کامەران منتك)، کوردستان لەنێوان ململانێی نێودەوڵەتی و ناوچەییدا (١٨٩٠-١٩٣٢)، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٠، ل ١١٠.

٢٥) ئەحمەد خواجە، چیم دی، ب ١، چاپخانەی شەفیق، بغداد، ١٩٦٨، ل١٨.

٢٦) المس بیل، م. س، ص١٤١.

٢٧) مەحمود مەلا عززەت، س. پ، ل ٧٥، هەروەها بڕوانە: المس بیل، م. س، ص١٨٥.

٢٨) تاکو ئەوکاتە شاری کفری لەژێر دەسەڵاتی عوسمانییەکاندا بوو، پێدەچێت بەشێك لە کەسایەتییەکانی کفری لە شاری خانەقین ئەو دیدار و چاوپێکەوتنانەیان سازدابێت.(توێژەر).

٢٩) وەرگیراوە لە: د. ئەحمەد عوسمان ئەبوبکر، کوردستان لە سەردەمی ئاشتیدا،

و: محەممەد نوری تۆفیق، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم ، سلێمانی، ۲۰۰۰، ل ١٤٥.

٣٠) مستەفا نەریمان، شۆڕشی ئیبراهیم خانی دەلۆ ١٩٢٠، س. پ، ل ١١٤.

٣١) شکری محمود ندیم، م. س، ص١٨٧.

٣٢) المس بیل، مذکرات المس بیل، ت: جعفر الخیاط، مطبعة برهان، (د. م)، ٢٠٠٦، ص ١٨.

٣٣) وەدیع جووەیدە، سەرهەڵدان و شکستی سەربەخۆیی باشووری کوردی لە کوردستانی عێراقدا، پاش جەنگی جیهانی یەکەم، و: محەممەد حەمەساڵح تۆفیق، چاپخانەی بنکەی ژین، سلێمانی، ٢٠٠٦، ل٣٨٤.

٣٤)د.کمال مەزهەر ئەحمەد، کوردستان لە ساڵەکانی شەڕی یەکەمی جیهاندا، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد، بەغداد، ١٩٧٥، ل ل ٦٧، ٦٨، ٧٣.

٣٥) د. کمال مظهر احمد، کردستان في سنوات الحرب العالمیة الأولی، ت: محمد الملا عبدالکریم، مطبعة المجمع العلمي الکردي، بغداد، ١٩٧٧، ص ١٨٥- ١٨٦، هەروەها بڕوانە: وەدیع جووەیدە، س. پ، ل٣٨٤، هەروەها بڕوانە: ئەحمەد حەمید گەرمکی، شاری خورماتوو، کورتەیەکی جوگرافی، مێژوویی، ئیداریی نەتەوەیی، چاپخانەی روون، سلێمانی، ٢٠٠٥، ل٤٣.

٣٦) مێجەر نوئێل (E. W. Noel) ناوی تەواوی (ئەدوارد چارلز ولیام نوئێل) ە، یەکێك بوو لە ئەفسەرە سیاسییەکانی ئینگلیز، ماوەیەك بەرلە جەنگی یەکەمی جیهانی لە ئێران کاریکردووە و زمانی فارسی و کوردی زانیوە، لە دەورانی یەکەم حکومەتی شێخ مەحمود حەفید لە ١ی کانوونی دووەمی ١٩١٩ لە سلێمانییەوە روویکردووەتە رەواندوز بۆئەوەی ئەو ناوچەیە بخاتەژێر حکومداری شێخ و دوای چەند هەفتەیەکی کەم گەڕایەوە، وەختێکیش ئینگلیز لە هەوڵەکانی دڕدۆنگ بوو، بڕیاریدا نەخشەی سیاسەتی خۆی لە کوردستان بگۆڕێ، بە بریاری

(ولسنWilson ) جێگری حاکمی گشتی (میجەر سۆن) خرایە جێگای نوئێل لە بەهاری ۱۹۲۳ جارێکیدیکە نوئێل رەوانەی هیندستان کرایەوە، پاش بڕانەوەی جەنگی دووەمی جیهانی گەڕایەوە بۆ بەریتانیا و خانەنشینکرا. یاداشتەکانی مەیجەر نوئێل لە کوردستان، و: حسێن ئەحمەد جاف و حسێن عوسمان نێرگزەجاڕی، مگبعە أوفسیت حسام، بغداد، ۱۹۸٤، ل۷، هەروەها بڕوانە: عەبدولرقیب یوسف، مێجەر نوئێل سەرنجدانێکی بارودۆخی کورد، و: سدیق ساڵح، چاپخانەی ئوفسێتی سەرکەوتن، سلیمانی، ۲۰۰۱، ل ۱۵.

۳۷) سدیق ساڵح، حکومەتی کوردستان لە سلێمانی (۱۹۱۸-۱۹۲٤)، سەرۆکایەتی شارەوانی سلێمانی، سلێمانی، ۲۰۰۳، ل۲۸، هەروەها بڕوانە: کامل ساڵەی، موجز فی تاریخ کرکوك، من منشورات قسم الثقافة والأعلام في المركز الثاني لتنظيمات الإتحاد الوطني الكردستاني، كركوك، ۲۰۰٥، ص ۲۳.

۳۸) سدیق ساڵح، حکومەتی کوردستان، س. پ، ل ل ۱۸، ٤۰، هەروەها بڕوانە: عبدالرحمن ادریس صالح البیاتی، م. س، ص ۱۲٥-۱۲٦.

۳۹) محەممەد رەسوڵ هاوار، شێخ مەحمودی قارەمان و دەوڵەتەکەی خوارووی کورستان، ب ۲، چاپخانەی بلاك روز، لەندەن، ۱۹۹۱، ل۱٦۲، هەروەها بڕوانە: راپۆرتی کارگێڕی دەڤەری کەرکوك، و: سەربەست کەرکوکی، بنکەی ژین، سلێمانی، ۲۰۰٦، ل۳۳.

٤۰) د. سەعدی عوسمان حسێن، راپەڕینەکانی کوردستانی باشوور ۱۹۱٤ - ۱۹٤٥، زانکۆ (گۆڤار)، ژ(۲٥)، حوزەیرانی ۲۰۰٥، ل ل٦٤۳، ٦٤٤.

٤۱) میرزا محەممەد ئەمین مەنگوری، حەقائیقی بەسەرهاتی شێخ مەحمود لە پەنای ئیستقلالی کورددا، چاپخانەی وەزارەتی رۆشنبیری، سلێمانی، ۲۰۰۳، ل۱۰.

٤۲) عەبدالرزاق الحسني، تاريخ العراق السياسي الحديث، ج۳، دار الشؤن الثقافة العامة، بغداد، ۱۹۸۹، ص ۳۰۲، هەروەها بڕوانە: فوئاد حەمە خورشید، کەرکوك

لەبەڵگەنامەکاندا، و: نەریمان عەبدوڵڵا خۆشناو، چاپخانەی منارە، هەولێر، ٢٠٠٧، ل ٨٢.

٤٣) کاتێك بەریتانیا عێراقی ئێستای داگیرکرد، هێزێکی نێوخۆیی دامەزراند بەمەبەستی شوێنگرتنەوەی هێزەکانی خۆیان و کەمکردنەوەی خەرجییە سەربازییەکان و سەرکوتکردنی نەیارانی خۆیان و لێدانی یاخیبووان و بزووتنەوە و راپەڕینەکانی نێو عێراق، ئەم هێزە لە نەتەوە جیاکانی عێراق و تەیارییەکان کە لە تورکیاوە هێندرابوون بەنێوی (شەبانە، لیڤی) . پشکۆ حەمە تاهیر ئاغجەلەری، شاری کەرکوك (١٩١٧-١٩٢٦)، دەزگای چاپ و پەخشی حەمدی، سلێمانی، ٢٠٠٧، ل ٢٩٣.

٤٤) وەرگیراوە لە: **محەممەد** رەسوڵ هاوار، س. پ، ب٢، ل١٦٢.

٤٥) د. کمال مظهر احمد، کرکوك وتوابعها حكم التاريخ والچمير، م. س، ص١٦٢ـ١٦٣، هەروەها بڕوانە: پشکۆ حەمە تاهیر ئاغجەلەری، س. پ، ل ل ١٩٦، ١٩٧.

٤٦) وەرگیراوە لە: د. ئەحمەد عوسمان ئەبوبکر، س. پ، ل٣٢٢ .

٤٧) د. سروة اسعد صابر، كردستان الجنوبية ١٩٢٦ - ١٩٣٩، دەزگای چاپ و پەخشی حەمدی، سلیمانیە، ٢٠٠٦، ص٢٤.

٤٨) المس بيل، مذكرات المس بيل، م. س، ص٦٦، هةروةها برِوانة: محمود الدرة، القضية الكردية، دار الطليقة، ط٢، بيروت، ١٩٦٦، ص١٣٤، هەروەها بڕوانە: رمزی قەزاز، بزووتنەوەی سیاسی و رۆشنبیری کورد لەکۆتایی چەرخی نۆزدەهەم تا ناوەڕاستی چەرخی بیست، چاپخانەی ژین، سلێمانی، ١٩٧١، ل١٠٣.

٤٩) د. سروە اسعد صابر، م. س، ص٢٤.

٥٠) نەوشیروان مستەفا ئەمین، کورد و عەجەم، چاپخانەی روون، چ ٣، سلێمانی، ٢٠٠٧، ل٤١٦ .

٥١) ئەحمەد خواجە، س. پ، ب١، ل١٨، هەروەها بڕوانە: عەبدولرحمن ادریس سالّح البیاتی، م. س، ص ص١٠٤، ١٠٥، هەروەها بڕوانە: الملا جمیل رۆژبەیانی، م. س، ص١١٨، هەروەها بڕوانە: سروه اسعد صابر، م. س، ص١٧، هەروەها بڕوانە: رەفیق حیلمی، یاداشت، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، چ ٣، سلێمانی، ٢٠٠٣، ل٤٥، هەروەها بڕوانە: عمر محمەد محمەد کریم، القضیة الكردیة في الصراع البریَطاني العراقي ١٩١٨ - ١٩٣٢، مطبعة كارؤ، سلیمانیة، ٢٠٠٨، ص ١١٤ - ١١٥.

٥٢) عبدالمنعم الغلامی، پورتنا فی شمال العراق ١٩١٩ـ١٩٢٠، مطبعة شفیق، ج ١، بغداد، ١٩٦٦، ص٩٣، هەروەها بڕوانە: پشكۆ حەمە تاهیر ئاغجەلەری، س. پ، ل ل ١٩٦، ١٩٧.

٥٣) مستەفا نەریمان، پەیوەندییەكانی نێوان سلێمانی و كفری، رۆشنبیری نوێ (گۆڤار)، دەزگاری رۆشنبیری و بلاّوكردنەوەی كوردی دەری دەكات، ژ(١٠٦) ، دار الحریە، بغداد، ساڵی ١٩٨٥، ل١٢٥.

٥٤) مستەفا نەریمان، شۆڕشی ئیبراهیم خانی دەلۆ ١٩٢٠، س. پ، ل١٦٩.

٥٥) یاداشتەكانی شێخ (لەتیف)ی حەفید لەسەر شۆڕشەكانی شێخ مەحمودی حەفید، ساغكردنەوەی: كەمال نووری مەعرووف، مەكتەبی ناوەندی رۆشنبیری و راگەیاندنی پارتی دیموكراتی كوردستان، ١٩٩٥، ل٥٠، هەروەها بڕوانە: محەممەد رەسول هاوار، س. پ، ب١، ل٤٧١.

٥٦) سدیق سالّح، حكومەتی كوردستان، ١٩١٨ـ١٩٢٤، بنكەی ژین، چاپخانەی شڤان، چ٢، سلێمانی، ٢٠٠٦، ل ل١٤، ٢٠، هەروەها بڕوانە: فیروز حسن حمە عزیز، الأهمیة الجیوستراتیجیة لكردستان الجنوبیة و تأثیرها علی السیاسة البریَطانیة (١٩١٤ - ١٩٢٤)، منشورات مركز كردستان للدراسات الأستراتیجیة، سلیمانیة، ٢٠٠٨، ص ٢٧٤.

٥٧) عبد الرحمن ادريس صالح البياتی، م. س، ص١٢١، هەروەها بڕوانە: محەممەد رەسوڵ هاوار، س. پ، ب ١، ل٤٤٧.

٥٨) خليل مصطفى عثمان الأتروشي، م. س، ص٦٣.

٥٩) سديق ساڵح، س. پ، ل٤٠، هەروەها بڕوانە: محەممەد رەسوڵ هاوار، س. پ، ل٤٤٨، هەروەها بڕوانە: رەمزی قەزاز، س. پ، ل١١٥. عبدالرزاق الحسنی، تاريخ العراق السياسی الحديپ، م. س، ص٣٠٣، هەروەها بڕوانە: جرجيس فتح الله، يقظة الكرد تاريخ سياسي ١٩٠٠-١٩٢٥، ئاراس، أربيل، ٢٠٠٢، ص ٢٢٤، هەروەها بڕوانە: عمر محەممەد محەممەد کەريم، م. س، ص ١٢٧.

٦٠) المس بيل، فصول من تاريخ العراق القريب، م. س، ل ٩١، هەروەها بڕوانە: ديڤيد ماکداول، مێژووی هاوچەرخی کورد، و: ئەبوبەکر خۆشناو، ب١، چاپخانەی روون، سلێمانی، ٢٠٠٢، ل ل ٢٥٧، ٢٦٣، هەروەها بڕوانە: د. عثمان علي، الحركة الكردية المعاصرة ١٨٣٣ - ١٩٤٦، مطبعة مكتب تفسير للطبع و النشر، أربيل، ٢٠٠٣، ص ٢٨٨.

٦١) د. وەليد حەمدی، کورد و کوردستان، و: موحەمەد نوری تۆفيق، چاپخانەی ئۆفسێتی تيشك، سلێمانی، ١٩٩٩، ل ل ٥٧، ٥٩.

٦٢) سديق ساڵح، س. پ، ل٢٧.

٦٣) د. وەليد حەمدی، س. پ، ل ل ٥٧، ٥٩، هەروەها بڕوانە: عەبدولرحمن ادريس صالح البياتی، م. س، ص١٢٨، هەروەها بڕوانە: جرجيس فتح الله، م. س، ص٢٢٥.

٦٤) مەلا جەميل رۆژبەيانی ، کەرکوك ـ مێژووی کۆنی ـ دانيشتوانی ـ دەسەڵاتەکانی، ئا: شێرزاد محەممەد ئەمين رۆژبەيانی، چاپخانەی ئارابخا، کەرکوك، ٢٠٠٦، ل٨٢.

٦٥) عبدالرزاق الحسنی، العراق فی دوری الإحتلال والإنتداب، ج١، مطبعة العرفان

بصيدا، سورية، ١٩٣٥، ص٣٠١.

٦٦) محەمەد حەمە ساڵح تۆفيق، كتێبی ((شۆڕشی ئيبراهيم خانی دەلۆ)) و چەند سەرنجێك، هاوكاری (رۆژنامە)، دەزگای رۆشنبيری و بڵاوكردنەوەی كوردی، ژ (٨٩٦)، بەغدا، ٦/٢٥/ ١٩٨٧، ل٧.

٦٧) د سەعدی عوسمان حسێن، س. پ، ل٤٦٨.

٦٨) پێشتر ياريدەدەری حاكمی سياسی بوو لە كەركوك بەڵام لەبەرئەوەی بەزەبروزەنگ بوو رەوانەی كفری كرا. راپۆرتی كارگێڕی دەڤەری كەركوك (ماوەی ١ی كانوونی دووەم تا ٣١ی كانوونی يەكەمی ١٩١٩)، س. پ، ل٣٣.

٦٩) (ئەبو چۆماغ) فەرمانبەرێكی بەريتانی بوو بەرەچەڵەك جووبوو بە خۆی و قەمچييەكەيەوە بهاتايەتە ناو قەيسەری كفری هەركێ بەرزەپێ بۆی نەوەستايە ئەيدايەبەر قامچی و تووشی هەزار دەرد و چەرمەسەری دەكرا، لەبەرئەوە خەڵكەكە ئەو ناوەيانلێنابوو بە واتای (كوتەك بەدەست) دێت. مستەفا نەريمان، ئەديب و نووسەرانی كفری و دەوروپشتی، نەوشەفەق (گۆڤار)، مانگانەيەكی رۆشنبيرييە دەزگای شەفەقی رۆشنبيری لە كەركوك دەری دەكا، كەركوك، ژ(١٨)، ئەيلولی ٢٠٠٤، ل٢٨.

٧٠) كوێپك ويلڵدران وشەيەكی توركمانييە بە واتای (سەگكوژ) دێت، كاری ئەو ئەفسەرە سەگ كوشتن بووە.

٧١) سەباح ئارام، شۆڕشی ئيبراهيم خانی دەلۆ و خوێندنەوەيەكی نوێ، هاواری كەركوك (گۆڤار)، گۆڤارێكی سياسی و رۆشنبيری گشتييە، ناوەندی رۆشنبيريی كەركوك دەری دەكات، ژ (٢)، كانونی يەكەم ١٩٩٨، ل ٨٤-٨٥، هەروەها بڕوانە: كاپتن لاين، كورد و عەرەب و بەريتانييەكان، بيرەوەرييەكانی كاپتن لاين لەمەڕ رووداوەكانی باشووری كوردستان (١٩١٩- ١٩٢٢) و: ياسين سەردەشتی ، چاپخانەی سيما، سلێمانی، ٢٠٠٧، ل٦٦، هەروەها بڕوانە: كاظم المظفر، ثورة

العراق التحررية عام ۱۹۲۰، ج۱، مطبعةالأداب، النجف الأشرف، ۱۹۷۲، ص ٥۱.

۷۲) هەربۆیە راپەڕینی ئیبراهیم خان لەوەدەرچووە کە هی تاکە هۆزێك بووبێت، هەرچەندە هۆزی دەلۆ رۆڵی کاریگەریان تێدابینیوە، چونکە زۆر تیرە و هۆزی ناوچەکە شوێن ئیبراهیم خان کەوتوون و بە برا گەورە و رابەری خۆیانیان زانیوە.. ئیبراهیم خانیش وەك رابەرێکی لێهاتوو جێپێ و دەوری خۆی لەناو هەژاراندا دۆزیوەتەوە و هەربۆیەش نەك تەنیا تیرە و هۆزەکانی کوردی ئەم ناوچەیە، بەڵکو هۆزەکانی عەرەب و تورکمانی باشوور و رۆژئاوای کفریش چاویانبڕیبووە رابەرایەتی ئەم پیاوە مەزنە، بێجگەلەوەی کە تەواوی خەڵکی زەحمەتکێشی ناو شاری کفریش لەگەڵ راپەڕینەکەدا بوون و کەم تا زۆر دەوری خۆیان تێدابینی. **محەممەد حەمە** سالّح تۆفیق، س. پ، ل۷.

۷۳) حسێن ئیسماعیل خان دەلۆ، ۲۲ی ئاب یەك رۆژ و دوو دیرۆکی جیاواز لە ئەرشیفی شاری کفری و لە شۆڕشی ئیبراهیم خانی دەلۆ و شۆڕشی مەزنی ئەیلولدا، برایەتی (رۆژنامە)، ژ(۳٤٦۷)، ۲۲/۸/۲۰۰۱، ل ٦.

۷٤) موراد موبارەك رەحەمەتوڵڵا لە هۆزی گێژ بوو پەیوەندی لەگەڵ ئینگلیزەکاندا هەبوو کرابووە سەرۆکی شەبانە لە ناوچەی کفری.

۷٥) الملا جميل روَذبةياني، عهد الاستعمار البريَطاني والعهود التالية، ت: أنور مندەلاوی، م. س، ص۱۱۹.

۷٦) د. عەزیز شەمزینی، جووڵانەوەی رزگاریی نیشتمانی کوردستان، و: فەرید ئەسەسەرد، بڵاوکراوەکانی سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی کوردستان، چ۳، سلێمانی، ۱۹۹۸، ل۹۸-۹۹.

۷۷) حەسەن بارام، لە یادی ۸٥ ساڵەی راپەڕینەکەی خورماتوودا، بانە رۆژ (گۆڤار)، گۆڤارێکی رۆشنبیری گشتییە، کۆمەڵەی روناکبیری کەرکوك

دەریدەکات، کەرکوك، ژ(٢١)، ساڵی شەشەم، هاوینی ٢٠٠٤، ل١٠ .

٧٨) د. سەعدی عوسمان هەروتی، بزاڤی رزگاریخوازی کوردی، س. پ، ل٧٧.

٧٩) R.Ghassan Atiyyah, Iraq:1908 -1921 A socio – political Study , Beirut , Lebanon ,(1973),p.344.

٨٠) رەفیق حیلمی، یاداشت، چاپ و پەخشی سەردەم، چ ٣، سلێمانی، ٢٠٠٣، ل١٨٤.

٨١) کوتولوف رایوایە لە ٢٤ ئابی ١٩٢٠ شاری کفری ئازادکرابێت، بەڵام راستییەکەی کە زۆربەی سەرچاوەکان کۆکن لەسەری ی٢٢ ئابی ١٩٢٠. ل. ن. کوتولوف، پوره العشرين الوگنييه التحررييه فى العراق، ت: د. عەبدولواحد کرم، مگبعه أوفسيت الديواني، بغداد، ١٩٨٥، ص ١٩٩.

٨٢) سەلاحەدین عەبدولحەمید، شاری کفری لە شۆڕشی بیست و شەڕی ئاوباریکدا، حەمرین (گۆڤار)، ژ (٢)، هاوینی ١٩٩٩، ل٢٠٨.

٨٣) مكرم الطالباني، ئیبراهیم خان ثائر من كردستان، م. س، ص ٧٢ – ٧٣، هەروەها بڕوانە: بەبۆنەی شۆڕشی -٣٠- حوزەیرانی عێراقەوە ئیبراهیم خان، عێراق (رۆژنامە)، ژ(٤)، ٢١ / ٦ / ١٩٧٧، ل٢، هەروەها بڕوانە: د. کەمال مەزهەر ئەحمەد، شوێنی میللەتی کورد لە شۆڕشی بیستا، برایەتی (گۆڤار)، ژ(٤)، ساڵی یەکەم خولی دووەم، ئەیلولی ١٩٧٠، ل٢٣، هەروەها بڕوانە: حەمە سەعید کەلاری، چەند لایەنێکی تۆمارنەکراو لە ژیانی پڕشانازی ((هەیەر عەزیز قەیتول)) ی، هاواری کەرکوك (گۆڤار)، ژ(٥)، تشرینی یەکەم ٢٠٠١، ل٩٥.

٨٤) رایەکیدیکە هەیە بۆ دامرکاندنەوەی شۆڕشەکە، سالمۆن خۆی و شاندێك لە پیاوماقوڵانی شار بڕیاریاندا بچنەسەر چیای باوەشاسوار، هەرچەندە سەعید وەنداوی هەولێدا ئەوکارە ئەنجامنەدات چونکە خەڵکە شۆڕشگێڕەکە لە دۆخێکی پەست و هەیەجاندان، بەڵام ئەو سووربوو لەسەرچوون بەبیانووی ئەوەی کە

فەرماندەی شۆڕشگێڕەکان (ئیبراهیم خان) هاورێەتی و ئامۆژگارییەکانی لێوەردەگرێت و لە هەڵوێستی شۆڕشگێڕی پەشیماندەبێتەوە و واز لە دوژمنکارییان دەهێنێت، کاتێك سالمۆن گەیشتە دامێنی چیاکە شۆڕشگێڕان رایانگرت و داواکەیان جێبەجێنەکرا و سالمۆن وەك دەستبەسەرێك لەلایان مایەوە، هێرشیانکردە سەر (سەرا) کە هێزی (شەبانە)ی تێیدابوو هەموو چەکدارەکانیان دەستگیر و چەککرد . عبدالرزاق الحسنی، الپوره العراقیه الکبری، م. س، ص١٨٥ـ١٨٦، هەروەها بڕوانە: عمر علی شریف، صفحات من التاریخ النچالی لٚبناو الکورد و الترکمان، بارش (مجله)،ع (١٠)، تشرین الٚول ٢٠٠١، ص ٣٣، هەروەها بڕوانە: د. محەممەد ئەحمەد سەعید (کەساس جەباری)، کەرکوك و بزاڤی شیعری کوردی، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٨، ل٤٨.

٨٥) موکەڕەم تالەبانی، لاپەڕەیەك لە خەباتی نەتەوەی کورد لە..، س. پ، ل٢١، ٢٠، هەروەها بڕوانە: کاظم المظفر، م. س، ص ١٩٥.

٨٦) عبدالفتاح علي يحيى، الشعب الکردی و ثورة العشرين، التأخي (جريدة)، ع( ١٣٧٣)، في ٢/٧/١٩٧٣، ص ٧.

٨٧) د. کەمال مەزهەر ئەحمەد، شوێنی میللەتی کورد لە شۆڕشی بیستا، برایەتی (گۆڤار)، ژ(٤)ساڵی یەکەم خولی دووەم، ئەیلولی ١٩٧٠، ل٢٣.

٨٨) ئەنجوومەنێکی یاخود حکومەتێکی ناوخۆیی بۆ بەڕێوەبردنی شار پێکهێنرا بە سەرکردایەتی ئیبراهیم خان و ئەندامێتی کەسە ناسراوەکانی شارەکە و سەرکردەی هۆزەکان لە ١٩٢٠ دەسەلاتی حکومەت زیاتر لە سێ مانگی خایاند. سەمیرە محەممەد عەلی، کفری شارە دێرینەکەی کوردستان، گەرمیان (گۆڤار)، دەزگای رۆشنبیری و بلاوکردنەوەی کوردی، بەغدا، ژ(٢٢)، ساڵی ٢٠٠٨، ل٨، هەروەها بڕوانە: سدیق سالح، حکومەتی کوردستان، ١٩١٨ـ١٩٢٤، بنکەی ژین، س. پ، ل٤٦، هەروەها بڕوانە: سەعید شاکەلی، لە یەکەمین کۆنگرەی کفریدا جاڕی

یەکەمین حکومەتی کوردی درا، بانە رۆژ (گۆڤار)، گۆڤارێکی رۆشنبیری گشتییە، کۆمەڵەی روناکبیری کەرکوک دەریدەکات، کەرکوک، ژ(١)، کانوونی یەکەم ٢٠٠٣، ل٦، هەروەها بڕوانە: عبدالفتاح علي يحيى، م. س، ص٧.هەروەها بڕوانە: مستەفا نەریمان، پەیوەندییەکانی نێوان سلێمانی و کفری، س. پ، ل١٢٥.

٨٩) بە هەڵە ناوی (حەمەجانی رۆغزایی) هێنراوە لەکاتێکدا (تەها حەمەجان) بەشداری شۆڕشەکەی کردووە، حەمەجانی کوڕی (تەها)ش ئەوکاتە منداڵبووە جا ئەو (حەمەجان)ە، ئەگەر کوڕی (تەها)بێ یان باوکی ئەوا لە هەردوو حاڵەتدا نووسەر بەهەڵەداچووە. حەمە سەعید کەلاری، س. پ، ل٩٦.

٩٠) مكرم الطالباني، ابراهيم خان ثائر من كردستان، م. س، ص ٧٧، هەروەها بڕوانە: موکەڕەم تاڵەبانی، لاپەڕەیەك لە خەباتی نەتەوەی کورد لە..، س. پ، ل٢٢، ٢٣، هەروەها بڕوانە: بەبۆنەی شۆڕشی -٣٠- حوزەیرانی عێراقەوە ئیبراهیم خان، س. پ، ل٢.

٩١) لە ساڵی ١٨٨٧ لە کفری لەدایکبووە، پەیوەندییەکی پتەوی لەگەڵ برایم خاندا هەبووە، پشتگیری راپەڕینەکەی کردووە، لە ساڵی ١٩٢١ بووەتە سەرۆکی شارەوانی کفری و پۆستی ئەندامی پەرلەمانی عێراقی و پلەی قایمقامی وەرگرتووە، لە ساڵی ١٩٥٤ کۆچیدواییکردووە. عمر علي شريف، أستذكارات عن مدينة كفري، نەوشەفەق (مجلە)، ع (٢٦) ئاداری ٢٠٠٥، ص ١١٥.

٩٢) مستەفا نەریمان، پەیوەندییەکانی نێوان سلێمانی و کفری، س. پ، ل١٢٥، هەروەها بڕوانە: سەلاحەدین عەبدولحەمید، س. پ، ل٢١٠،٢٠٩، هەروەها بڕوانە: د سەعدی عوسمان حسێن، س. پ، ل ل ٦٤٩، ٦٥٠.

٩٣) Reporton Iraq Administration, Iraq , April (1922 – March 1923) London,1924 , p.33.

٩٤) کاپتن لاین، س. پ، ل٦٦، هەروها بڕوانە: رەفعەت محەممەد، یەکەمین

کۆنگرەی نەتەوەی کورد، کەرکوکی ئەمڕۆ (رۆژنامە) هەفتەنامەیەکی سیاسی رووناکبیری گشتییە، کۆمەڵەی رووناکبیری و کۆمەڵایەتی کەرکوك دەریدەکات، ژ(٨٧)، ٢ی تشرینی یەکەم، ٢٠٠٥،

٩٥) سدیق ساڵح، حکومەتی کوردستان، ١٩١٨ـ١٩٢٤، س. پ، ل٦٦.

٩٦) عەبدولفتاح علی یحیی، م. س، ص٧.

٩٧) عومەر عەلی شەریف، لەیادنامەی کەرکوك و گەرمیانەوە، چاپخانەی ئارابخا، کەرکوك، ٢٠٠٦، ل ١٩، هەروەها بڕوانە: ئازادی مام وەلی، هۆزی گەلاڵی، چاپخانەی شڤان، سلێمانی، ٢٠٠٨، ل٢٠.

(٩٨) د. کەمال مەزهەر ئەحمەد، شوێنی میللەتی کورد لە شۆڕشی بیستا، س. ب، ل٢٣.

٩٩) د.کمال مظهر احمد، دور الشعب الكردی في ثورة العشرين العراقية، مطبعة الحوادث، بغداد، ١٩٧٨، ص١٢٩.

١٠٠) مستەفا نەریمان، بیرەوەرییەکانی ژیانم، دار الحريية للطباعة ، بغداد، ١٩٩٤، ل١٦.

١٠١) عەبدولفتاح علی یحیی، م. س، ص٧.

١٠٢) مستەفا نەریمان، پەیوەندییەکانی نێوان سلێمانی و کفری، س. پ، ل١٢٥، هەروەها بڕوانە: محەممەد شاکەلی، گەرمیان رابردووی نزیك و ئایینده، چاپخانەی کارۆ، سلێمانی، ٢٠٠٣، ل٤٠، هەروەها بڕوانە: حەسەن بارام، چەند لاپەڕەیەك لە مێژووی خورماتوو، س. پ، ل١١١.

(١٠٣) فاضل کریم، خانقین خلال ربع قرن (١٩٠٠-١٩٢٥)، التأخي (جريدة)، العدد (١٣٥٧)، ص ٧.

(١٠٤) نەجم خالید ئەڵوەنی، س. پ، ل ٢٥، ٢٦، هەروەها بڕوانە: عومەر عەلی شریيف، لە یادنامەی کەرکوك و گەرمیانەوە، س. پ، ل١٣، هەروەها بڕوانە: د.

علی الوردی، م. س، ص٥٩، هەروەها بڕوانە: ئەکرەم یاوەر حەسەن، بەشێك لە مێژووی خانەقین لە سەردەمی شۆڕشی بیستدا، وریزا (گۆڤار)، ژ (٤)، ساڵی یەکەم، بەهاری ٢٠٠٧، ل ٢٣.

١٠٥) د. كمال مظهر أحمد، الكرد و ثورة العشريين، مطبعة المجمع العلمي الكردي، بغداد، ١٩٧٨، ص ٢٤، هەروەها بڕوانە: ئەکرەم یاوەر حەسەن، س. پ، ل٢٣.

١٠٦) مستەفا نەریمان، شۆڕشی ئیبراهیم خانی دەلۆ ١٩٢٠، س. پ ، ل١٣٠.

١٠٧) د.کەمال مەزهەر ئەحمەد، چەند لاپەڕەیەك لە مێژووی گەلی کورد، س. پ، ل ل ١٦٦ـ١٦٧، هەروەها بڕوانە: حەسەن بارام، لە یادی ٨٥ ساڵەی راپەڕینەکەی خورماتوودا، س، پ، ل١٠ ، هەروەها بڕوانە: عمر علي شريف، صفحات من التاريخ النضالي لابناء طرميان (١٩١٥-١٩٤٥)، طولآن العربى (مجلة)، تصدر عن مؤسسة (گولآن) للثقافة و الأعلام،ع (٣٩)، السنة الرابعة، أب- ١٩٩٩، ص ٧٤.

١٠٨) شاكر صابر ضابط، موجز تاريخ التركمان في العراق، ج ١، مطبعة المعارف، بغداد، ١٩٦٠، ص ١٣٨، هەروەها بڕوانە: مستەفا نەریمان، شۆڕشی ئیبراهیم خانی دەلۆ ١٩٢٠، س. پ، ل١٣١، هەروەها بڕوانە: مستەفا نەریمان، پەیوەندییەکانی نێوان سلێمانی و کفری، س. پ، ل ل ١٢٥، ١٢٦، هەروەها بڕوانە: عومەر عەلی شرییف، لەیادنامەی کەرکوك و گەرمیانەوە، س. پ، ل ١٧.

١٠٩) د. كمال مظهر أحمد، الكرد و ثورة العشريين، م. س، ص ٣٢.

١١٠) عەبدولرحمن ادريس صالح البياتی، م. س، ص١٩٦-١٩٧.

١١١) سیسیل جۆن ئیدمۆندس، سیسیل جۆن ئیدمۆندس، ل٣٤١، هەروەها بڕوانە: د. حامد محمود عيسى، القضية الكردية في العراق من الأحتلال البريَطاني الى الغزو الأمريَكی، مكتبة مدبولی، قاهرة، ٢٠٠٥، ص ١٣٥، هەروەها بڕوانە: عمر محەمەد محەمەد کەریم، م. س. ص ٢١٨.

١١٢) (نۆما)کە چوارپەل و نەخشی نێو چەوانی سپیبوو، گرتبوویان لە سورمەی زیو و جوان سەرتاپای بەوشێوەیە رازاندبوویانەوە، ئەم نۆمایەش بەگزادەکانی هۆزی داوده لەوانە (حەسەنی ئیسماعیل بەگ و رەفعەتی ئیسماعیل بەگ) ئامادەیانکردبوو. عەبدولکەریم حەمید عەبدولکەریم، کفری میوانداریەتی شێخ مەحمودی نەمر دەکات، رەنگین (گۆڤار) ژ (١٩)، مایسی ١٩٨٩، ل٣٤- ٣٥.

١١٣) عەبدولکەریم حەمید عەبدولکەریم، س. پ، ل٣٤- ٣٥، هەروەها بڕوانە: لەتیف بەرزنجی، لە یادی نەمراندا شێخ مەحمود حەفید، کاروان (گۆڤار)، ژ(٢٦)، ساڵی سێیەم، تشرینی دووم ١٩٨٤، ل٧، هەروەها بڕوانە: سەعید شاکەلی، س. پ، ل٧، هەروەها بڕوانە: محەممەد رەسوڵ هاوار، س. پ، ل٢٩٦، هەروەها بڕوانە: سدیق ساڵح، حکومەتی کوردستان لە سلێمانی (١٩١٨-١٩٢٤)، س. پ، ل٥٦، ٥٧.

١١٤) ژمارەیەك نوسەر و هونەرمەند، س. پ،ل ٦٤-٦٥.

١١٥) رەفیق حیلمی، یاداشت، کوردستان عێراق و شۆڕشەکانی شێخ مەحمود، ب ٣، دار الحریە للگباعە، بغداد، ١٩٩٢، ل٢٠.

١١٦) یاداشتەکانی شێخ (لەتیف)ی حەفید لەسەر شۆڕشەکانی شێخ مەحمودی حەفید، س. پ، ل٨٦، هەروەها بڕوانە: محەممەد شاکەلی، س. پ، ل٤٥، هەروەها بڕوانە: مستەفا نەریمان، ئەدیب و نووسەرانی کفری و دەوروپشتی، نەوشەفەق (گۆڤار)، ژ(٢)، ئایاری ٢٠٠٣، ل٢٢، ٢٣، هەروەها بڕوانە: عەبدولرحمن ادریس صالح البیاتی، م. س، ص٢١٩.

١١٧) رۆژی ٢١ی ئەیلولی١٩٢٢ رۆژێکی پرشنگدارە لە مێژووی شاری کفریدا لەو رۆژەدا دانیشتوانی شار بە گەورە و بچووکەوە بە سوارە و پیادەوە رژابوونە ئێستگەی شەمەندەفەری (کنگربان) کە بە حەوت کیلۆمەترێك لە خۆرئاوای کفرییەوەیە، شێخ مەحمود سێ رۆژ و سێ شەو لە ماڵ (سەیید محسەن ئاغا)دا لە

پێشوازی خەڵکیدا بوو، شێخ تەماشایکرد برایم خانی نەبینی کە بیستی ئەمری خوایکرووە فرمێسکەکەی بە فەقیانەکەی سڕییەوە و گێڕایەوە: (کە ئینگلیزەکان لەدیلێتیدا پێیانوتووە برایم خان هەستاوەتەسەرپێ و داوای گەڕانەوەت دەکات)، شێخ هەردوو کوڕەکەی برایم خان (عەزیز و شەرەف)ی بانگکرد و هەریەکە دیاری (کاتژمێر)ێکی پێبەخشین. مستەفا نەریمان، پەیوەندییەکانی نێوان سلێمانی و کفری، س. پ، ل١٢٧.

١١٨) مەلا جەمیل رۆژبەیانی، س. پ، ل ل ٨٧، ٨٨.

١١٩) یاداشتەکانی شێخ (لەتیف)ی حەفید، س. پ، ل٨٥، هەروەها بڕوانە: سەعید شاکەلی، س. پ، ل٦ - ٧.

١٢٠) سدیق ساڵح، س. پ، ل١٦.

١٢١) بەرلەهاتنەوەی شێخ لەلایەن حاکمی سیاسی پێشووی سلێمانی (میجر گۆڵد سمیس)ەوە ئەم تەلەگرافە بۆ شێخ عەبدولکەریم نووسراوە) بۆ جەنابی شێخ عەبدولکەریم لە کفری) " ((رۆژی چوارشەمە ١٣ ئەیلول ئەمڕۆ شێخ مەحمود و شێخ محەممەد غەرییب ئەگەنە بەغداد، لە یەکەم دەرفەتدا بۆ کفری جووڵەدەکەن، بەڵام بۆ هەندێك ئیش لەپێش بزووتنندا پێویستە مندوبی سامی راوێژی لەگەڵدا بکات، هەتا هەواڵتان بۆ دەنێرم لە کفری چاوەڕوانبن، هەرکاتیك شێخ مەحمود بۆ کفری کەوتەڕێ هەواڵتان بۆ دەنێرم)). ئەحمەد خواجە، چیم دی، س. پ، ل ٩٩-١٠٠، هەروەها بڕوانە: سدیق ساڵح، س. پ، ل ٩٦.

١٢٢) لەتیف بەرزنجی، س. پ، ل٧، هەروەها بڕوانە: محەممەد شاکەلی، س. پ، ل٤٥، هەروەها بڕوانە: ئەحمەد خواجە، س. پ، ل١٠٠.

١٢٣) سدیق ساڵح، س. پ، ل ١٠٠.

١٢٤) مستەفا نەریمان، شۆڕشی ئیبراهیم خانی دەلۆ ١٩٢٠، س. پ، ل ١٩١.

١٢٥) د. عثمان علي، دراسات في الحركة الكوردية المعاصرة(١٨٣٣-١٩٤٦)، م.

س، ص ٣٩٩.

١٢٦) ئەحمەد خواجە، چیم دی، ب ٢، چاپخانەی کامەران، سلێمانی، ١٩٦٩، ل٥٢.

١٢٧) رۆژی کوردستان (رۆژنامە)، ژ (١٤)، ساڵی یەکەم، سلێمانی، ٨ رجب١٣٤١ك، ٢٤ شوبات ١٣٣٨ رۆمی، ل٣.

١٢٨) د. عەبدولرحمن قاسملوو، کوردستان و کورد، و: عەبدوڵلاّ حەسەن زادە، چاپخانەی رۆژهەڵات، هەولێر، ٢٠٠٧، ل٨٢.

١٢٩) مستەفا نەریمان لە بیروەرییەکانی ژیانیدا باس لەوە دەکات: شێخ کە لە سنوورەوە بۆ گەرمیان دەهات پێشتر نامەی بۆ پیاوە ناودارەکانی گەرمیان نووسیبوو. مستەفا نەریمان، بیرەوەرییەکانی ژیانم، س. پ، ل٤٠.

١٣٠) جەلال دارا جاف، جەنگی ئاوباریك لە بیرەوەری مێژوودا، نەوشەفەق (گۆڤار)، مانگانەیەکی رۆشنبیرییە دەزگای شەفەقی رۆشنبیری لە کەرکوك دەریدەکا، کەرکوك، ژ(٤)، تەموزی ٢٠٠٦، ل ١٨.

١٣١) عمر علي شرييف، أستذكارات عن تاريخ الكرد الحديث، مطبعة وزارة التربية، أربيل، ٢٠٠٥،ص ٩٧.

١٣٢) د.موکەڕەم تاڵەبانی، شەڕی ئاوباریك بۆچی شکستیهێنا؟، رەنگین (گۆڤار)، ژ (٦٨)، ١٩٩٤، ل١٠-١١.

١٣٣) اللورد لويد دولبران، العراق من الإنتداب الى الأستقلال، ت: الدار العربية للموسوعات، بيروت، لبنان، ٢٠٠٢، ص ١٨٦، هەروەها بڕوانە: د. سەعدی عوسمان هەروتی، بزاڤی رزگاریخوازی کوردی، س. پ، ل١٠٦، هەروەها بڕوانە: حامد محمود عيسى، م. س، ص٢٣٧.

١٣٤) جەلال دارا جاف، س. پ، ل ١٨- ١٩.

١٣٥) عمر علي شرييف، أستذكارات عن تاريخ الكرد الحديث، م. س، ص ٩٨.

١٣٦) د. نەجاتی عەبدوڵڵا، شێخ محمودی حەفیدزادە لە بەڵگەنامەی فرانسیدا ١٩١٩- ١٩٣٤، سلێمانی، ٢٠٠٦، ل ٨٢-٨٣، هەروەها بڕوانە: د.موکەڕەم تاڵەبانی، س. پ، ل١٠-١١، هەروەها بڕوانە: جاسم محەمەد، کەلار لەلادێوە بۆ شار، لە بلاۆکراوەکانی مەکتەبی بیر و هۆشیاری (ی.ن.ك)، سلێمانی، ٢٠٠٥، ل٢٥.

١٣٧) ئازادی مام وەلی، س. پ، ل٢٧.

١٣٨) دوو گوندی ناوچەی گەرمیانن، سەر بە قەزای کفرین.

١٣٩) حەمە سەعید کەلاری، س. پ، ل٩٦.

١٤٠) چاوپێکەوتن لەگەڵ (محەمەد حەمە ساڵح تۆفیق)، لەدایکبووی ١٩٥٤ کفری، دانیشتوی سلێمانی، لە رۆژی ٢٢ / ١/ ٢٠٠٩.

١٤١) سەلاحەدین عەبدولحەمید، س. پ، ل ٢١٠، هەروەها بڕوانە: عمر علی شریف، أستژکارات عن تاریخ الکرد الحدیپ، م. س، ص٩٩.

١٤٢) د.موکەڕەم تاڵەبانی، شەڕی ئاوباریك بۆچی شکستیهێنا؟، س. پ، ل١٠-١١، هەروەها بڕوانە: عومەر عەلی شرییف، لە یادنامەی کەرکوك و گەرمیانەوە، س. پ، ل ٧٤.

١٤٣) د. غانم محمد الحفو و د. عتبدولفتاح البوتاني، الکورد و الأحداث الوطنیة في العراق خلال العهد الملکي ١٩٢١ - ١٩٥٨، مطبعة وزارة التربیة، أربیل، ٢٠٠٥، ص ٦٨.

١٤٤) لە ساڵی ١٨٨١ لە (گائف) لەدایکبووە، خالۆی جێنشینی لەکارلابراو (عەبدولالھ) بووە لە ساڵی ١٩٢٥ کاتێك بنەماڵەی (ئال سعود) لە حیجاز هاتنەدەسەلاّت رەوانەی عێراق کرا، لە ساڵی ١٩٢٧ کاتێك شا فەیسەڵ گەشتی ئەوروپای کرد وەکو نوێنەری ئەو لەسەر تەختی پاشایەتی عێراق بوو. نبیل عکید محمود المظفري، دور نواب کرکوك في مجلس النواب العراقی خلال العهد الملکي

۱۹۲۵-۱۹۵۸، ج ۳، کەرکوك (گۆڤار)، ژ(۳۹)، ساڵی دەیەم، زستانی ۲۰۰۹، ص ۱۵٦.

۱٤٥) م. ن، ص۱٥٥.

۱٤٦) سورەمەیری هۆزێکی کوردە لەخانەقین و لەدێهاتەکانی دەوروپشتی جێگیربوونە، پەیوەندییەکی باشیان لەگەڵ هۆزەکانی باجەلان و دەلۆ و تاڵەبانیدا هەیە. بڕوانە: ئی. جەی. ئارهینری فیلد، هۆزەکانی کورد، و:حسێن جاف،دار الحریة للطباعة، بغداد، ۱۹٦۸، ص۳۰، ۳۱.

۱٤۷) کەیوان ئازاد ئەنوەر، رۆڵی کورد لە بزووتنەوەی رەشید عالی گەیلانیدا، هەزارمێر (گۆڤار)، ژ(۱۳)، ساڵی چوارەم، ئەیلولی ۲۰۰۰، ل۱٤۲.

۱٤۸) هـ. س، ل۱٤۳.

۱٤۹) د. کەمال مەزهەر، لاپەڕەیەکی ون لە مێژووی خەباتی شێخ مەحمود (دەربارەی هەڵوێستی کورد بەرامبەر راپەڕینی مایسی ۱۹٤۱)، رۆشنبیری نوێ (گۆڤار)، دەزگای رۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی، ژ (۱۲۱)، ئاداری ۱۹۸۹، ل ۱۷۰.

۱٥۰) چاوپێکەوتن لەگەڵ محەممەد سەعید حەبیب، لەدایکبووی ۱۹۳۱ کفری، لە رۆژی ۷/۲/۲۰۰۹.

۱٥۱) چاوپێکەوتن لەگەڵ مامۆستا سەلاحەدین مەجید عەلی، لەدایکبووی ۱۹۳٤ کفری، لە رۆژی ۳/ ۱۱ / ۲۰۰۸.

۱٥۲) د. کەمال مەزهەر، لاپەڕەیەکی ون لە مێژووی خەباتی شێخ مەحمود (دەربارەی هەڵوێستی کورد بەرامبەر راپەڕینی مایسی ۱۹٤۱)، س. پ، ل۱۷٦.

۱٥۳) د. موکەڕەم تاڵەبانی، س. پ، ل۱۰-۱۱، هەروەها بڕوانە: هلبین محەممەد امین مزوری، حزب هیوا - الأمل- (۱۹۳۹-۱۹٤٦)، مطبعة حاجی هاشم، أربیل، ص ۱٤٥.

١٥٤) علی کمال عەبدولرحمن، مذکرات علی کمال عەبدولرحمن، تقدیم و تحقیق: جمال بابان، شرکه الخنساو، بغداد، ٢٠٠١، ص ٩٠.

١٥٥)دەروێش حسێن کوڕی عەبدوڵڵا کوڕی شوکری کوڕی عەزیزی کوڕی میرزایە، لە ساڵی ١٨٩٥ لە شاری سنە لەدایکبووە هەر لەمنداڵیەوە لە حوجرەی مزگەوت خوێندویەتی بۆیە (فەقێ)یشی پێگوتراوە، ماوەیەك بۆ خوێندن هاتووەتە شاری سلێمانی، لە هەرەتی لاوێتیدا چووەتە شاری خانەقین و دەستی لە خوێندن هەڵگرتووە و کاروکاسبی کردووە، لە ١٥-١١-١٩٧٨ لە شاری خانەقین کۆچیدواییکردووە. ئیبراهیم باجەڵان، رزگارکردنی شێخ مەحمودی نەمر لە یادداشتەکانی دەروێش حسێندا، رۆشنبیری نوێ (گۆڤار)، دەزگای رۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی، ژ (١٢١)، ئاداری ١٩٨٩، ل ١٩٤.

١٥٦) ئیبراهیم باجەڵان، س. پ، ل ١٩٤، هەروەها بڕوانە: محەممەد رەسوڵ هاوار، س. پ، ب٢، ل ل ٦٩٣، ٦٩٥.

١٥٧) مستەفا نەریمان، بیرەوەرییەکانی ژیانم، س. پ، ل٥٧-٥٨.

١٥٨) هـ. س. پ، ل٥٧-٥٨.

١٥٩) محەممەد حەمە ساڵح تۆفیق، س. پ، ل١١.

١٦٠) ئیبراهیم باجەڵان، س. پ، ل ١٩٤، هەروەها بڕوانە: محەممەد رەسوڵ هاوار، س. پ، ب٢، ل ل ٦٩٣، ٦٩٥.

١٦١) مستەفا نەریمان، بیرەوەرییەکانی ژیانم، س. پ، ل٥٧-٥٨.




# پەیوەندی بنەماڵەی سەییدەکانی کفری به شێخ مەحمودی حەفید

## شەماڵ خورشید عەزیز

له زۆربەی ناوچە و لەناو زۆربەی گەلانی ڕۆژهەلاتی ناوڕاست چینی (شێخ و سەیید) بوونی هەیە و زۆربەی ئەوانە لەناو کۆمەڵگای موسڵمانانیدا ڕەچەڵەکیان دەگەڕێننەوە بۆ چوارەم جێشنشین که (ئیمامی عەلی)یە، هۆزی بەرزنجە یەکێکە لەم چینە، باپیرە گەورەیان (بابا علی هەمەدانی)یە برازای شاعیری گەورەی کورد (بابا تاهیری هەمەدانی)یە و هەردوو کوڕی ناوبراو (موسا)و (عیسا) لە بەرزنجە نیشتەجێدەبن، لە (بابا عیسا) شێخ و سەییدەکانی (بەرزنجە و کاکەیی)

دەکەوێتەوە، سەییدەکانی کفری لە نەوەی (سەیید عەلی وەندرینی)[1] یە، ئەمەش یەکەم خاڵی پەیوەندی نێوان هەردوو بنەماڵەی (سەییدەکانی کفری)و بنەماڵەی (شێخ مەحمودی حەفید)ە.

مێژووی هاتن و نیشتەجێبوونی ئەم بنەماڵەیە لە ناوچەی کفری دیارنییە و کۆنترین بەڵگەی تایبەتی پارێزراو لای ئەم بنەماڵەیە باسی بەخشینی والی بەغدا (سلیمان پاشا)ساڵی ١١٧٥ك (١٧٦١ز) (کە دەکاتە (٢٥٠) ساڵ پێش ئێستا رووبەرێکی گەورە لە زەوی کشتوکاڵی لە خوارووی شاری کفری بە (سەیید قاسم) دەبەخشێت کە باپیرە گەورەی ئەم بنەماڵەیە. بەڵگەیێکیتر باسی بەخشینی کەرتی تلیشان بە هەریەك لە (سەیید عومەر ئاغا)و (سەیید ئیراهیم، سەیید مستەفا، سەیید سلیمان) کوڕانی (سەیید حسین کوڕی سەیید قاسم) لە ساڵی (١٢٥٥ك) لەلایەن والی بەغدا (عەلی رەزا پاشا)وە دەکات. لەدوای دەرچوونی سیستەمی بەتاپۆکردنی زەوییە کشتوکاڵییەکان تەنها (سەیید ئەحمد ئاغا) کوڕی سەیید عومەر ئاغای گەورە رووبەرێکی زۆری لە زەوییە کشتوکاڵییەکانی قەزای کفری دەکڕێ، زەوییەکانی چەمی بەکرەشەل و قوشەچاپان و بەلەگە لە ناحیەی کفری و (٥) کەرت لە ناحیەی (دوزخورماتوو)و دوو کەرتیش لە ناحیەی داقوق، هەروەها هەردوو کوڕەکەی (سەیید حسێن ئاغا و محەسەن ئاغا) بەشێك لە زەوییەکانی (توکن و پیرەمەوەنی و قەواڵی) بەدەستدەهێنن، لەکاتێکدا (سەیید

**محەممەد** کوڕی سەیید عومەر ئاغا)ی برای پشکی تەنها لە موڵکی باوکیەوە هەبوو، بەڵام لەدوای هاتنی ئینگلیز و دامەزراندنی حکومەتی عێراق و کارکردن بە سیستەمی پێدانی زەوی میری بە لەزمە (عومەر ئاغا) کوڕی سەیید **محەممەد** کەرتی (٢١/ عەین شکور) کە گوندەکانی (عەین شکور عەبدولڕەحمان، عەین شکور لاوە، دەباچە)[٢] لەخۆدەگرێت و کەرتی (١٩/سناجرە)و هەندێ پارچەزەوی لە گلآبات و تەپەچەرموو بەدەستدەهێنێ.. ئەم کەرتانەش دەکەوێتە خوارووی کەرتی تلیشان کە زێدی ئەم بنەماڵەیە و چەند پارچەزەوێەك لە هەردوو کەرتی (١٠/ کولەجۆ) و (١٣/ لەلبن) لە دەشتی زەنگاباد.

جگەلەم موڵکانە لە سەردەمی دەسەڵاتی سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم (١٨٧٦- ١٩٠٩)ز کە لە دوای لادان وکوشتنی مامی (سوڵتان عەبدولعەزیز ١٨٦١- ١٨٧٦)و لادانی براکەی (موراد‌ی پێنجەم ١٨٧٦) لەلایەن لایەنگرانی (مەشروتییە - مانەوەی سوڵتان، بەڵام بەبێ دەسەڵاتی رەها بەمانایێکیتر دەسەڵات بەپێی دەستور) (عەبدولحەمید) بەم مەرجە دەسەڵاتی وەرگرتەوە، بەڵام زۆری نەخایەند لە ساڵی ١٨٧٨ز هەڵگەرایەوە و روویکردە رۆژهەڵات و دژی رۆژئاوا وەستا و لەم سەردەمەدا بزووتنەوەی کۆمکاری ئیسلامی پێشکەوت و سوڵتان زانایانی ئایینی و شێخ و سەییدەکانی لەخۆی نزیکردەوە، هەندێك لەمانە خاوەن پێگە و دەسەڵاتی زۆربوون.[٣]

بێگومان شێخ و سەیدەکانی باشووری کوردستانیشی لەخۆدەگرت بەتایبەت نەوەی (کاکە ئەحمەدی شێخ)، لە بۆنەکاندا موچە و بەرات و نازناویشی پێیاندەبەخشی و هەندێ لەوان بانگهێشتی ئەستەنبوڵ دەکران شێخ سەعیدی حەفید یەکێك لەو زاتانەبووە،[٤] سەییدەکانی کفریش نازناوی (نەقیب)یان پێپەخشرا، ئەم توێژە بەهۆی ئەو گرنگیدان و بەدەستهێنانی زەوی بە سیستەمی تاپۆ لەو سەردەمەدا، ئاساییە ببنە لایەنگری سوڵتان (عەبدولحەمید) ئەمەش دەبێتە خاڵی دووەمی پەیوەندی نێوان هەردوو بنەماڵە.

کۆمـــــەڵەی (ئیتیحاد و تەرقی) کە نەیاری سوڵتان بوو لە رۆژی (١٩٠٨/٧/٢٣ ز -٢٤/ جەمادی دووەم ساڵی (١٣٢٦ك) مەشروتەیان راگەیاند و دەسەڵاتیان لە سوڵتان وەرگرتەوە و زۆری نەخایەند لە رۆژی ٧/ ربیعی دووەمی ساڵی ١٣٢٧ك - ١٩٠٩ز بە فەرمی لادرا و (محەممەدی پێنجەمی - رەشاد)ی برای بەشێوەیەکی شکڵی وەکو جێنیشینی تازە دانرا.[٥]

ئەم گۆرانکارییە مۆرکی بەسەر ژیانی سیاسی لە هەموو ئیالەتەکانی دەوڵەتی عوسمانیدا دانا، هەردووشاری (سلێمانی)و (کفری) یش لەم رەوشە بەدەر نەبوون دوو رای دژ بە یەك دەرکەوت بەرەیەك پشتگیری لە سوڵتان عەبدولحەمید و بەرەکەیتری پشتگیری لە ئیتحادییەکانیان دەکرد، ئەمانیش توێژی بازرگان و فەرمانبەرانی

لەخۆگرت، لە سلێمانی بەدەستی ئیتحادییەکان شێخ سەعید و کوڕەکانی دەستگیرکران و دوورخراونەوە بۆ موسڵ و لەوێ شێخ سەعید و کوڕەکەی (شێخ ئەحمد) کوژران هۆکارەکەیشی (بەها ئەفەندی کوڕی عەبدوڵلا ئەفەندی کوڕی حاجی ئیبراهیم ئەفەندی) بووە کە خەڵکی کفری بوو لەو ڕۆژەدا لە موسڵ باشکاتبی (ڕێژی - ئینحیسار) بوو، لایەنگرانی شێخ سەعید باوکی ناوبراویان لەو شارە (کفری) کوشت(٦) و ئەوەی ئەم کارەی ئەنجامدا (حەسەن ئەفەندی کوڕی مستەفا ئەفەندی کوڕی شەعبان - مامی محەمەد و نایح ئیبراهیم ئەفەندی)(٧) بوو ئەمەش بە سەرپەرشتی سەیدەکانی کفری ئەنجامدرا، چونکە ناوبراوان وەکو باسمانکرد پەیوەندییەکی بتەوەیان هەبووە لەگەڵ بنەماڵەی شێخ سەعید، ئیتحادییەکان نەك تەنها لە سلێمانی ئەوکارەیان ئەنجامدا بەڵکو ساڵی ١٩١٧ز لە شاری کفریش (سەیید حسین ئاغا)(٨) یان دەرمانخواردکردەوە، چونکە ناوبراو دژی سەرکردەی عوسمانی (عەلی ئیحسان پاشا) وەستایەوە. لە ساڵی ١٩١٤ز جەنگی جیهانی یەکەم دەستیپێکردەوە دەوڵەتی عوسمانی چووەپاڵ ئەڵەمان و هەردەهات ناوچەکانی لەدەستدەدا و هێزی بریتانی توانی لە ١٩١٨/٤/٢٨ شاری کفری و لە ٧/٥ شاری کەرکوك بگرێت، شێخ مەحمود بەهۆی (عەبدوڵلا سافی)یەوە نامەیەك ئاراستەی ئینگلیزەکان دەکات، بەڵام زۆری نەخایەند ئەو هێزە کشایەوە و هێزی عوسمانی گەڕایەوە و پرسی

نامەکەش ئاشکرابوو و شێخ دەسگیرکرایەوە و بەخنکاندن مەحکومکرا، بەڵاٚم بەهۆی رەوشی سیاسی و سەربازی و رێگرتن لە پێشهاتە خراپەکان ئازادیانکرد و پۆستی سەرلەشکری مەدەنیان پێیسپارد[9] لەدوای ئەوەی جارێکیتر هێزی بریتانی کەرکوك داگیرکرد و ئەمجارەیان شێخ نامەی بە (عیزەت تۆپچی)و (فایق تاپۆ) بۆ (کفری)[10] نارد و بەهۆی (محسەن ئاغا)وە گەێنرا بە ئینگلیزەکان.[11]

لە ١٩١٨/١٠/٣٠هودنەی (مودروس) واژووکرا و شەڕ کۆتاییپێهات بریتانیا بیری لە بەرقەرارکردنی ئاساییش ولابردنی کارتێکردنی ئاسەواری برسێتی کە دوو ساڵ بوو باڵیکێشابووەسەر ئەم ناوچەیە، بۆ جێبەجێکردنی ئەم ئامانجە میجەر (نوئیل)ی نارده ناوچەی کەرکوك و سلێمانی (نێوان هەردوو رووباری سیروان و زێی بچووك)[12]، ( (میجەر نوئیل)یش لەرێی چیاکانی نێوان (کفری)و (چەمچەماڵ)[13] رۆژی ١٩١٨/١١/١٨ز[14] گەیشتە سلێمانی و لە رۆژی دوایی لە بەردەرگای سەرادا کۆبونەوەیەکی گەورەی رێکخست لەوتارەکەیدا بلاٚویکردەوە کە (شێخ مەحمود) لەلایەن حاکمی گشتی عیراقەوە بە (حوکمداری کوردستان) دانرا و قۆناغی یەکەمی حوکمرانی شێخی نەمر زۆری نەخایەند لە بەردەقارامان بەدیلگرتنی و دوورخرانەوە بۆ هیند کۆتاییپێهات.

ڕووداوەکان بەخێرایی تێدەپەری بەتایبەت دوای هاتنی هێزی تورك بۆ ناوچەی ڕەواندوز بە سەرۆکایەتی (ئۆزدەمیر)و دانانی (ڕەمزی) بە قایمقامی ئەو شارە و ئینگلیزەکانیش دەسەڵاتیان لەم ناوچەیە و ناوچەی پشدەر لەدەستدا و خەڵکیش لێانهەڵگەڕابوون ئەوانەی خۆیان بە تورك دەزانی یان تورکیایان خۆشدەویست لە ترسی سیخوڕەکانی ئینگلیز لە شارەکانی (سلێمانی، هەولێر، کەرکوك، کفری، موسڵ، بەغدا) هەڵدەهاتن و ڕوویاندەکردە ڕەواندوز و بوونە هۆی گەیاندنی پروپاگەندەی تورك بۆ شارەکان و دەنگوباسی ئەو شوێنانە بۆ ئوزدەمیریان دەبرد و هێز و دەسەڵاتی ناوبراویش لە ناو هۆزە کوردییەکان هەتادەهات فراواندەبووەوە.

لە ١٩٢٢/٩/١ هێزەکانی ئینگلیز لە ڕانیە کشایەوە و لە ڕۆژی ١٩٢٢/٩/٣ شاری سلێمانیانیشی جێهێشت و تەسلیمی بە (ئەنجومەنی میللی) کردەوە کە (شێخ قادر حەفید)ی بە سەرۆك هەڵبژاردەوە.(١٥)

پێشتر تورکەکان هەوڵیاندەدا بەدیلێك بۆ شێخ مەحمود دیاریبکەن و هەرچەندە هەریەك لە (سەیید تەها)و (حەمدی بەگی بابان)یان دەستنیشانکردووە بۆ ئەو پۆستە، بەڵام سەرکەوتوونەبوون.. بۆیە ناچاربوون جارێکیتر بگەڕێنەوە بۆ لای (شێخ مەحمود)، لە ڕۆژی ١٩٢٢/٩/١٢ ناوبراو گەیشتە بەغدا، دانوستاندن لەنێوان شێخ و بەغدا سازدرا و گەیشتنە ڕێکەوتن و بەوپێیە دەبێ شێخ بەرگری لە سلێمانی

بکات تانەکەوێتە دەستی تورك و هەوڵبدات بەدەرکردنیان لە ناوچەکانیتری پارێزگای سلێمانی و دەبێت دەستێوەردانی بەشی کەرکوك و هەولێر نەکات و (نۆیل) وەك راوێژکار پەسەندبکات بەرامبەر هاوکاریکردنی(١٦) لە رۆژی ١٩٢٢/٩/٢١ ز شێخ مەحمود بەیاوەریی میجەر نۆیل گەیشتە وێستگەی شەمەندەفەری کنگربان و لەلایەن دانیشتووان و هۆزەکانی ناوچەکە پێشوازێکی گەرمی لێکرا(١٧) و سێ رۆژ لە ماڵی (محسن ئاغا) لە شاری کفری مایەوە و تێدا دوو کۆبوونەوەی (کۆنگرە) لەگەڵ سەرۆك هۆزەکان ئەنجامدا و لە کۆبونەوەی یەکەم ئەم بڕیارانەی لای خوارەوە ورگیرا:

١. دانانی شێخ مەحمود وەك (مەلیك)(*)ی کوردستان

٢. بەرزکردنەوەی سوپاسنامە بۆ حکومەتی بریتانی بە بۆنەی دانانی شێخ مەحمود (مەلیك)(*)یکوردستان

٣. بەرزکردنەوەی سوپاسنامە بە بۆنەی دامەزراندنی حکومەتی کوردی. لە کۆبوونەوەی دووەم شێخ ئاگاداری ئامادەبووانی کرد کە راوێژکاری ئینگلیزی داوایلێکردووە لەڕێگای کەرکوکەوە برۆن بۆ سلێمانی بۆ ئەم هۆیانەی لای خوارەوە:

١. بەهێزکردنی پەیوەندی شێخ بە سوپای بریتانی و ئاسورییەکان و تفاهمیان لەگەڵ بکات.

٢. رێگرتن لە پەیوەندیکرنی شێخ بە خەڵك،[١٨] بەڵام شێخ لەدوای ئاڵوگۆری راکان لەگەڵ سەرۆك هۆزەکان بڕیاریدا لە گەرمیانەوە بچێتە سلێمانی.

لەکۆتاییدا دەمەوێ ئاماژە بە دوو خاڵ بکەم کە (ئەدمۆندز- ئەفسەری بریتانی) باسیلێوەدەکات:

یەکەمیان: پێشوازی گەرمی دانشتوانی ناوچەی کفری هۆکاری سەرەکی بڕیاردانی دامەزرادنی حکومەتی کوردییە، چونکە شاندی سلێمانی لەکاتی گفتوکۆکردندا لەگەڵ ئەدمۆندزدا وەك ئەندامانی حکومەتێکی کوردی کاتیی هەڵسوکەوتیاندەکرد.[١٩]

## خشتەی موڵکەکانی بنەماڵەی سەییدەکانی کفری پێش شۆرشی ١٤ / تەمموزی ١٩٥٨

| ز | ناوی کەرت | ژ. پارچە | ڕووبەری گشتی/ دۆنم | | بەشی سەییدەکان | | خاوەندارێتی | جۆری زەوی |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | | | پشتاو | بەراو | پشتاو | بەراو | | |
| ١ | ١٦/ کفری | ٣٣ | ٤٤٧ | ١٢١<br>. | ٣٦٧ | ٨٩٢ | وەرەسەی (حسین، محسن، عومەر ئاغا) | تاپۆ |
| ٢ | ١٥/ تلیشان | ٧ | ٢٥٩٢١ | ٨٠ | ٢٥٨٠٥ | ٨٠ | عومەر ئاغا ئەلکەبیر عەدا (٨) | تاپۆ |
| ٣ | ١٩/ سەناجرە | ٢ | ٤٧٥٨ | - | ٤٧٥٨ | - | عومەر ئاغا | لەزمە |
| ٤ | ٢٤/تەپە چەرموو | ٧ | ٢٧٩ | - | ١٣٩ | - | عومەر ئاغا | لەزمە |
| ٥ | ٢١/عەین شکور | ١ | ٩٦٨٢ | - | ٨٠٦٩ | - | عومەر ئاغا | لەزمە |
| ٦ | ٢٢/ گلاڵبات | ٢ | ٢٧٠ | - | ١٣٥ | - | عومەر ئاغا دووکوت لەگەڵ دانیشتوان | لەزمە |
| ٧ | ٧/ ساری گویل | ١ | ٢٥٦١٣ | - | ٢٤٨٤ | - | وەرەسەی مەجید باشا | تاپۆ |
| ٨ | ٢٥/ سەرقەڵا | ٢ | ٥٦ | - | ١٣ | - | بابان بۆ سەییدەکان | تاپۆ |
| ٩ | ٤٦/ سەیید جەژنی | ٢ | - | ٦٤ | - | ٣ | بابان بۆ سەییدەکان | تاپۆ |
| ١٠ | ٢٦/ عومەربل | ٥٣ | ٤٨٠٦ | ٩٥ | ٤٧٥٥ | ٩٤ | حسێن ئاغا و محسن ئاغا | تاپۆ |
| ١١ | ٣٠/ چوار شاخ | ١١ | ٢٥٤١ | ١٥ | ٢٥١٥ | ١٤ | حسێن ئاغا و محسن ئاغا | تاپۆ |
| ١٢ | ٨٢/ بەلەگە | ٢٩ | ٧٦٠٨ | - | ٧٥٣٢ | - | حسێن ئاغا و محسن ئاغا | تاپۆ |

| | | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ١٣ | ٨١/ بەکرە شەل | ١٨ | ٤٥٨٨ | ٩ | ٤٤٨٣ | ٩ | حسێن ئاغا و محسن ئاغا | تاپۆ |
| ١٤ | ٧٧/ گۆبان | ٤٠ | ١٣٨٧ | - | ١٣٧٢ | - | حسێن ئاغا و محسن ئاغا | تاپۆ |
| ١٥ | ٣١/ توکن | ٥ | ٢٠٩٤ | - | ٢٠٩٤ | - | محسن ئاغا | تاپۆ |
| ١٦ | ٨٣/پیرە مەوەنی | ٧ | ٦٧ | - | ٣٣ | - | حسێن ئاغا | تاپۆ |
| ١٧ | ٨٤/ قەواڵی | ٩٩ | ٢٤٣٨ | - | ١١٩٣ | - | حسێن ئاغا | تاپۆ |
| ١٨ | ١٠/ کوڵەجۆ | ١٧ | - | ٦٤٥ | - | ٥٢٧ | (عومەر ئاغا + حسێن ئاغا + محسن ئاغا) | لەزمە |
| ١٩ | ٤٢/ بساتین کوڵەجۆ | ٧ | - | ٥٤ | - | ٢٩ | حسین ئاغا | تاپۆ |
| ٢٠ | ١/ کۆکس | ١١ | ٢٢٨٢ | ٦٥٥ . | ٥٦ | ١٦٣ | عومەر ئاغا ئەلکەبیر | تاپۆ |
| ٢١ | ٢/ حاجیلەر | ٢ | - | ١١٣ ٥١ | - | ٢٢٧٥ | بابان ئالی سادە | تاپۆ |
| ٢٢ | ٧/ تەپە کزن | ٣ | - | ١٥٥ ٦ | - | ١٤٥ | بابان ئالی سادە | لەزمە |
| ٢٣ | ١٣/ لەلبن | ١٢ | - | ٩٠٩ | - | ٢٧١ | عومەر ئاغا + حەکیم ئەفەندی | لەزمە |
| ٢٤ | ٤١/ وارانی ژورو | ٢ | ١٨ | - | ٩ | - | حسێن ئاغا دووکوت لەگەڵ دانیشتوان | تاپۆ |

| | | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ٢٥ | ٢٧/ پیر ئەحمەد | ٢ | ١٦٥٨٢ | - | ١٠١٤٣ | - | حسێن ئاغا و محسن ئاغا | تاپۆ |
| ٢٦ | ٣٣/ حلێوە | ١ | ٦٤٦٦ | - | ١٣٩٢ | - | حسێن ئاغا و محسن ئاغا | تاپۆ |
| ٢٧ | ٩/ کۆکس | ٣ | ٤٣٢ | - | ٤٧ | - | بابان بۆ سەییدەکان | تاپۆ |
| ٢٨ | ١٧/ زەنگەڵوی خواروو | ١٦ | ٥٣٧٤ | ٦ | ٣٢٣٠ | ٢ | بابان بۆ سەییدەکان | تاپۆ |
| ٢٩ | ٣٩/زەنگەڵو عەبود | ١٣ | ٢١٩٣٣ | ٢٩ | ١٣٤٤٣ | ١٢ | بابان بۆ سەیدەکان | تاپۆ |
| ٣٠ | ٥/ دوز | ٩ | - | ٨٠ | - | ٥ | بابان بۆ سەیدەکان | تاپۆ |
| ٣١ | ٨٠/ داقوق | ٢٨ | ١٠٢١ | ٩ | ٣٧٨ | ٣ | حسین ئاغا + محسن ئاغا | تاپۆ |
| ٣٢ | ٨١/ ئەحمەد سەمیر | ٢ | ٦٦٣ | - | ٢٦٢ | - | حسێن ئاغا ومحەسەن ئاغا | تاپۆ |
| کۆی گشتی | | | | | | | | |

سەرچاوە:

١) قرار (٦) فی ٢٧/٧/١٩٧١ الصادر من لجنه الاراچی والاستیلاو الخامسه فی کرکوك
٢) قرار (١) فی ١٠/١/١٩٨٨ الصادر من لجنه الاراچی والاستیلاو المؤقته فی دیالی.

پەراوێزەکان

١) مستەفا نەریمان. شۆڕشی ئیبراهیم خانی دەلۆ. لا٣٧. و شجەرەی بنەماڵەی

٢) ئەم کەرتە لەدوای هەرسهێنانی هەراکەی ئیبراهیم خانی دەلۆ زەوی گوندەکانی ناوبراو بە مزایەدە مستەفا نەریمان. شۆڕشی ئیبراهیم خانی دەلۆ. لا١٢٥

٣) احمد عبدالرحیم مصطفی – في اصول التأریخ العثماني – الطبعة الثانیة – ١٩٩٣- دار الشروق- ص ٢٤٨

٤) رفیق حلمی – یاداشت – بەشی یەکەم لا٣٥

٥) (عباس عزاوی – تاریخ العراق بین احتلالین ج٨ – ص١٨٧ -٢٠٤)

٦) (رفیق حلمی، یاداشت، بەشی یەکەم، بەرگی یەکەم، چاپخانەی رۆشنبیری و لاوان، ص٤٨) * (ئەوەی کوژراوە (بەها ئەفەندی) خۆیەتی کاتێ ناوبراو لە ماڵی خۆیدا لە کفری خۆی شاردبووەوە (مستەفا نەریمان، شۆڕشی ئیبراهیم خانی دەلۆ، چاپی دووەم/٢٠٠٧، چاپخانە رۆژ – کەرکوك، ص٣٨)

٧) ئەم زانیاریە لەلایەن بەرێز (میقداد محەمەد ئیبراهیم) کە ناسیح مامی بۆی گێڕاوەتەوە

٨) فؤاد حمة خورشید – العشائر الکردیة- ص ١٣٩

٩) (ئەحمەد خواجە- چیم دی لا ١٩)

١٠) (رفيق حلمی، یاداشت، بەرگی یەکەم ص٥٧).

١١) لە هەندێ سەرچاوەکان ئەم بابەتە تێکەڵوپێکەڵکراوە بۆ نموونە (ئەحمەد خواجە) باسی دوو نامە دەکات، بەڵام بەروارەکانی بەڕوونی دەستنیشاناکات لەکاتێکدا (رەفیق حیلمی)یش هەر باسی دوو نامە دەکات، بەڵام جیاوازی لەوە دووەم بەڕوونی باسی ئەوە دەکات یەکەم لە یەکەم گرتنی کەرکوك و دووەم نامە لە دووەم گرتنی

١٢) (جرجيس فتح الله. يقظة الكرد. اربيل ٢٠٠٢. دار ئاراس للطباعة والنشر، ص١٩٨

١٣) (رفيق حلمی، یاداشت، بەرگی یەکەم ص٥٧-٥٩)

١٤) (ئەحمەد خواجە. چیم دی* (رەفیق حیلمی: بەرواری کۆبوونەوەکە لە رۆژی یەکەمی مانگی تشرینی دووەم رێکخرا (رەفیق حیلمی، یاداشت، بەرگی یەکەم ص٦٠)** (عەبدولڕەقیب یوسف رۆژی هاتنی نویل بۆ سلێمانی لە ١٦/١١/١٩١٨و کۆبوونەوەکە لە ١٧/١١ بووە (عبدالرقيب يوسف.حدود كردستان الجنوبية تأريخياً وجغرافياً .الطبعة الاولى ٢٠٠٥- السليمانية- مطبعة شفان ص١٣٦)

١٥) (سی.جی.ادموندز.کردُ وتركُ وعرب.ترجمه جرجيس فتح الله.ص٢٣٤)

١٦) (جرجيس فتح الله.يقظة الكرد.اربيل ٢٠٠٢.دار ئاراس للطباعة والنشرص٢٥٥) ((سی.جی.ادموندز.کردُ وتركُ وعرب.ترجمة جرجيس فتح الله.ص٢٣٤)

١٧) (سی.جی.ادموندز.کردُ وتركُ وعرب.ترجمة جرجيس فتح الله.ص٢٥٤)

* راستر (حوکمداری)

١٨) یاداشتەکانی شیخ (لوتیف)ی حەفید .چاپی یەکەم. ١٩٩٥ لا ٨٥-٨٦)

١٩) (سی.جی.ادموندز. جرجيس فتح الله.ص٢٦٨و٢٧٢)کردُ وتركُ وعرب.ترجمة

## کاریگەری شۆڕشی شێخ مەحمودی نەمر لەسەر ئەدەب و شیعری کوردی لەگەرمیاندا

### ساڵەح هەلاج



هەموو شۆڕش و بەرخودانەکان کار و کاردانەوەی خۆیان هەیە، بەتایبەتی بۆ ئێمەی کورد وەکو نەتەوەیەکی ستەملێکراوی ناوچەی رۆژهەلاّتی ناوەڕاست و داگیر و دابەشکراو بەسەر چوار رژێمی تۆتیالیتار و شۆفێنیدا کە هیچ رەوشتێکی مرۆڤایەتی و ئایینییان لامەبەستنەبووە و نییە، لە کوشتن و ماڵوێرانکردن و پاکتاوی رەگەزیدا سڵیاننەکردووەتەوە و ناکەنەوە، بەپێچەوانەوە کاردانەوەی سەختیش لای دڵسۆزانی کورد بەرجەستەبووە، بەتایبەتی لای توێژی رۆشنبیران و منەوەرەکانی کوردەواری، بێگومان شۆڕش و شۆڕشگێڕی لە بیر و هزری رووناکبیراندا سەرچاوەدەگرێ و رابەرایەتیدەکرێ.

شێخ مەحمودی مەلیکی کوردستان لە رابەرایەتیکردنی شۆڕشدا بۆ ئێمەی کورد دوو چەمکی تایبەتی خۆی هەیە:

یەکەم: شێخی نەمر وەکو کەسایەتییەکی ئایینی و نەوەی بنەماڵەیەکی ناودار و بەرێز و خۆشەویست، جگەلە ئایینی ئیسلام هەموو ئایین و ئایینزاکانی کوردستان ئەو خۆشەویستییەیان بۆ شێخی نەمر و بنەماڵەکەیان هەبووە، بەڵگەیش (جوبرەئیلی ئەرمەنی کە لە شەڕی ئاوباریکدا پزیشکی سوپاکەی شێخ بووە، هەر لەوجەنگەیشدا گیانی بە کورد و کوردستان بەخشیوە، بەلاّم بەداخەوە تاکو ئێستایش گۆڕەکەی لەناو دۆڵێکدا بێناوونیشان ماوەتەوە، تەنها خەڵکی گوندی ئاوباریك نەبێ کەسیتر ئەو گۆڕە ناناسنەوە.

دووەم: وەکو شۆڕشگێڕ و داکۆکیکاری مافە زەوتکراوەکانی گەل و نیشتمان کە تووشی چەندین دەربەدەری و گرتن و برینداری و سەرەڕای بوونی خیانەت لای هەندێ کەسانی خۆفرۆش و بەکرێگیراو، ئەویش خەم و پەژارەیەکی زۆر سەختی لە هەست و دەروونی شێخ مەحموددا کردبوو، ئەو دڵسۆزی و سەخاوەتییەی شێخی نەمر بوونەتە هەوێنێکی عەشق و خۆشەویستی گەلەکەمان.

دەبینین شاعیرانی ئەو سەردەمە و پاشتریش هەریەکە و بەشێوەیەك شیعریان پیاهەڵـگوتووە، شاعیرانی ناوچەی گەرمیانیش بێبەشنەبوون لەو خۆشەویستییە بۆ شێخی نەمر.

ئەوەدەزانین شێخی نەمریش ناوچەی گەرمیانی وەکو بەشێك لە پێگەی سیاسی و سوپایی شۆڕشەکەی بووە، لەگەڕانەوەیدا لە بەغداوە بۆ کوردستان، شاری کفری هەڵبژاردووە بۆ کۆبوونەوەی لەگەڵ کەسایەتی ناوچەکە بۆ پرسوڕا و وەرگرتنی بیروبۆچوونیان،هەروەها پشتبەستنپێیان، لە رەنگدانەوەی ئەوکارانەیشیدا بەستنی کۆنگرەی کفری و شەڕی گوندی (پەلەوشك)و ناردنی نامە بۆ سەرۆکهۆز و پیاوە دەستڕۆیشتووەکانی ناوچەکە، هەر بە رێنوێنی ئەویش بوو لە یەك هەفتەدا ساڵی ١٩٢٠ لە شاری خانەقی (خورشید بەگی دەلۆ)و لە شاری کفری (برایم خانی دەلۆ) و لە شاری خورماتوو (رەفعەت بەگی داودە)، لە لەیلانیش (شیخ حەسەن) راپەڕینی چەکداری دژی سوپای داگیرکاری بەریتانی بەرپابکەن، سەرەڕای جەنگی بەناوبانگی گوندی (ئاوباریك) ساڵی ١٩٣١ لە بناری گل. هەڵبەتە دەڤەری گەرمیانش ناوچەکی زیاتر ستەملێکراوبووە، چی لەڕووی چەوساندنەوە وەکو نەتەوە و چی لە دواکەوتنی کۆمەڵگاکە و دوورەدەستییەوە لە خوێندن و بڵاوکراوە و پێگەی خوێنەوارییەوە، بۆیەزۆری ئەو شیعر و نووسینانە ئەرشیفنەکراون یان لە رووداوەکانی جەنگ و کاولکارییەکاندا لەبەردەم هێرشی دڕندانەی سوپای داگیرکەری عێراقیدا، هەر لە سووتانی دێهات و کوشتن و تالاڵنکردن و ئاوارەبووندا تیاچوون، ئەوەی لەبەردەستماندا مابێ هەندێك لەویادگارییانەیە کە بەهەر کولەمەرگییەکەوە بێت پارێزراوە.

ئێمە لێرەدا چەند شاعیرێك بە نموونە دەهێنینەوە کە لە سەردەمی شۆڕشەکانی شێخی نەمردا شیعری سیاسییان گوتووە، لێرەدا تەنها شاعیرانی ناوچەی گەرمیانمان مەبەستە.

- یەکێ لەو شاعیرانەی کە دۆست و خۆشەویست و دڵسۆز و پێشمەرگەی شێخی نەمر بووە، شاعیری ناوداری گەرمیان (مەلا حەسەنی نەوحی)یە، ساڵی ١٩٠٠ لەدایکبووە، بە مەلایەتی چەندین گوند و شاری کوردستان گەڕاوە و سەرئەنجام لە گوندی (مەلا ئۆمەر)ی ناوچەی زەنگەنە گیرساوەتەوە و ساڵی ١٩٦٦ لە شاری خورماتوو کۆچیدواییکردووە، بەشداری راپەڕینەکەی بەردەرکی سەرای شاری سلێمانی لە ساڵی ١٩٣٠دا کردووە و لە شەڕی ئاوباریکیشدا بەشداریکردووە.

مەلا حەسەنی نەوحی گەرچی زۆریش لە بەرهەمەکانی تیاچووە، ئێستا دیوانە شیعرییەکەی چاپ و بڵاوکراوەتەوە،* هەڵبەتە بەهۆی کاریگەری شۆڕشەکەی شێخ مەحمودەوە بووە هەستی نیشتمانی و نەتەوایەتی لای شاعیر چەکەرەیکردووە و لە چەند نموونەیەکی شیعریدا بانگ و هاواری یەکگرتن و یەکێتی هزر و بیری پێشکەوتن و خەبات دەکاتە سونبولی شیعرەکانی و دەڵێت:

غیرەتی گۆران و کوردە یەکیەتی داوائەکا

هەرکەسێ ئەهلی شـەرەف بێ، بەم قسە بڕوائەکا

هەر لە ساڵی سامەوە تا رۆستەمی مازندەران

جەوهەری کـوردە بە کـوردی وارِسە و داوائەکا

حەزرەتی ئەییوبی ئەکرادە کە هێشتا مائیلە

ئەو بەبێ قەستی سەری دوژمن بە کوردی وائەکا

ئینتیشاری دینی ئەحمەد هەر لەنێو کوردا هەیە

هەر حەدیسی ئـەو، بە غیرەت شاهەی فەتوائەکا

حەللی مەعقوودی دڵی کوردی لە بابی ئیتیفاق

ئیجتیماعیی عـــەزیزم هەرکەسـێ بڕوائەکا

غیرەتی کوردی بەجۆشە، شاهیدە (نەوحی) ئەڵێ

چـۆن لە مەیـدانی شەڕا رۆستەم لەکوردا وائەکا

❋❋

دەبینین (مەلا حەسەنی نەوحی) شاعیر، سەرەتا داوای یەکێتی کوردان دەکات و بە مێژوو ئەوە دەسەلمێنی کە هاوپەیمانی و یەکگرتن هێز و تواناکان بەجۆشتر و بەتواناترە، ئەمیش بۆ ئەو سەردەمە جەنجاڵەی کوردەواری کە چ لەڕووی ناوخۆییەوە رووبەڕووی شۆڕشی

شێخی نەمر بووەتەوە، یا بەرژەوەندی زلهێزەکان لەناوچەکەدا، شاعیر گەلێ شیعری نیشتمانی و نەتەوایەتی زۆر جوانی لە خەرمانی ئەدەبی کوردیدا بۆ بەجێهێشتووین، بەبۆنەی کۆچیدوایی شێخ مەحمودی حەفیدزادەوە شیوەنێکی بۆ کردووە و دەڵێت:

شکا پشت و بڕا جەرگی هەموو کورد *
بە ئـــەو دەنگەی لەنـاکاوا دەستوبرد
جیهانی تێگەیاند و خستییە لەرزە
سبەی سێشەممە رۆژی چـواری مەولوود
کزەی جەرگ و قژژەی دڵ ماوەنادا
بڵێم دایاخی کـــوردم رۆیی ئەی کورد
شڵەژا ئاسمانی کوردی بەدبەخت
شەماڵ شاباشی گیانی (شاهی مەحمود)
تەمی غەم گێژەڵۆکەی رۆژی ناشاد
لە کەس با هەڵنەکا ئەمـرۆ وەکو کورد
ئیتر کوردە بناڵێنن بگرین
لەگەڵ ژینی خـــۆیا ژینی ئێمەشی برد
بە مەرگی غەم بەجێمابوو بە مێژوو
هەزار و سێسەد و حەفتاو و شەش مرد

ئیتر (نەوحی) بە خوێنی چاو بنووسە

بژێوی کوا سەرۆکی کا لە بۆ کورد؟

بپرژێنە خوا ئاوی سەبووری

بە سەر کوردا لە گەورە تا ورد

برینی شێخی بارزانی بەسۆیە

ئەمیشی هاتەلا، هانایە ئەی کورد

پزیشکی هەڵخەڵەتاوی (وەسی) بوو

ئەوی کوشت و ئەمی گرت و ئەوی برد

❊❊

هەڵبەتە ئەوە شاعیرێکی وەکو (نەوحی)یە کە هەستی کردووە لەوڕۆژگارەدا شێخی نەمر کاریزمای کوردە و بە کۆچیدوایی ئەویش پشتوپەنای کوردی شکاندووە، چونکە تا ئەو سەردەمە کەسایەتییەکی بەتوانای سیاسی و فەرماندەیەکی سەربازی وا لەکوردا بوونی نەبووە، دەبینین دەڵێت: (بڵێم (دایاخی)❊ کوردم رۆیی ئەی کورد)، واتە: پشتیوان و دڵسۆزی کوردایەتی ماڵئاواییکرد.

- شۆڕەسواریتری گۆڕەپانی کوردایەتی (مینە جاف) ساڵی ١٩١١ لەناو قەلاّی شێروانەدا لە کەلار لەدایکبووە، ساڵی ١٩٦٥ لە بەغدا کۆچیدواییکردووە.

مینه جاف دۆستی نزیکی مەلیکی کوردستان و پێشمەرگەی جەنگی (ئاوباریك) بووه، یەکێکیتره له شاعیره نیشتمانپەروەرەکانی بزووتنەوەکەی شێخی نەمر و هەستی نیشتمانی و نەتەوەایەتی لەناو شیعرەکانیدا رەنگیداوەتەوه، وەکو لەم شیعرەی (داد له دەستی فەلەك) دا هاتووه و دەڵێت:

ئەی فەلەك بۆ کورد کوڕی تۆی کوشت، برای تۆی سەربڕی
قـــاپی کەعبەی شـــــکاند، یا پەردەی بەیتی دڕی
بۆ لەهەر لایێ بە ئاوی چاوی خوێناوی جگەر
خونچەیەکی ئـــــــارەزووم بڕوێ، بەناکــــــام ئەیبڕی
هەر شەوی کورد بێ، ئەبێ تاریکستان بێ و بێفەڕی
سەربەسەر عالەم لەسات، بـــەهرەی خۆشی و ئازادیه
بەهرەی کورد ژێردەستی و کە حوکمی و تالع شەڕی
بۆچی کوفره توخوا ئــەی چـــەرخی دوونی دوونپەرست
دەفعەیەکیش تۆ بەپێی دڵخوازی ئێمه هەڵپەڕی
حـــــەقی خۆته هـــــەرچییەکمان پێئەکەی، پێمانبکه
چونکه مەعلومه کە سووك و بێسەبات و جلڤڕی

**

وەك دەبینین (مینە جاف)[*] لە داخی دڵی خۆیدا روو لە فەلەك دەكات و بە زمانێكی تیژ سەرزەنشتیدەكات و تەنانەت ئاماژەی بۆ هەندێ خاڵی پیرۆزیش كردووە، وەكو گوتراوە (چەرخی چەپگەرد) ئەم شیعرە درێژە و ناكرێ هەمووی بخوێنینەوە.

هەروەها لەشیعرێكیتریدا كە هەر بۆ شێخی نەمری گوتووە كە بە قەڵا سەختەكەی مێژووی ناوهێناوە، ئەوەتا ئاماژە بە جەنگەكانی شێخ لە شوێنە جیاجیاكانی عێراق و كوردستان دەكات، وەكو دەڵێت:

قەڵای سەربەرزی كورد و كوردستان
شێری ســــەرشاخی وڵاتی بـــابان
پەناوپشتیوان كوردی موعەییەن
داواچی تۆڵەی خـــوێنی كوژیاوان
بەرز و سەربەرزی گشت رەگەزی ماد
رازێنەرەوەی مێژووی كـــورد زوبان
سوپاسالاری لەشكری بەسرا
تێكشكێنەری روس لە بانە و بۆكان
رەنگكەری دەشتی بەر (دەربەن)و خوێن
سەركردەی تیپی لەشـــكری بازیان

حەقسێنی رۆژی بەردەرکی سەرا

که شەشی ئـــــەیلوول قەتلٚ و عــام کران

پڵنگ چنگبەخوێن، رۆژی ئاوباریك

شۆڕەســــوارەکەی چیا و هـــــەردەی خان

قڕکەری ئۆردووی خوێنمژی دوژمن

له (زەڵێو و کەناروێ و چوارتا و چنگنیان)

وەخوێنی دوژمن رێی سوور سووراوکەر

نـــــوغرۆکەری تیپ، کــــــەڕنێل کامەران

مەلیکی کورد بە ساحی و ئالاٚ

شــــیخ مەحمود نــووسی مێژوو لەدەوران

❊❊

هەڵبەتە مینه جاف بۆ مەرگی شێخی نەمر، چەندین شیوەنە شیعری هەیە، ئێمە یەکێ لەو شیوەننامانە دەخوێنینەوە:

یا شێخ راپەڕە، شـــەڕی دەربەنە❊

وا سوپای دوژمن چوو بۆ جاسەنە

وەڵڵاٚ بەبێ تۆ، هـــەرچی سەرداره

ئەمرۆ دەربــــەدەر، وێڵە و ئازاره

ســــــــەرێهەڵبڕە لەسای سەرای سەنگ
بڕوانە قەومەکەت، چەن ماتە و بێدەنگ
ســـــەیرکە دوژمن چـــــەن شاأادکامە
چەن بێترس و خەوف، چەن ساحێو سامە
(پیــــران) ئازیەتبار، (دارکەلی) پڕخەم
کورد و کـــــوردستان، لەژێر هەوری تەم

❋❋

ئەمیش دیسان ئاماژەیەکە بۆئەوەی هەر تەنها شێخی نەمر بووە لەو ڕۆژگارەدا توانیویەتی بەپشتوپەنای گەلەکەی بەرپەرچی سوپای داگیرکەران بداتەوە، چونکە شێخی لەلای زۆرێك لە تاکی کورد وەکو مرۆڤێکی ئەفسانەیی خوا، ناردوویەتی بۆ رزگاربوون لە جەور و ستەمی ستەمکاران و گەیشتن بە مافی رەوای خەڵکی کورد، ئەوەتا لەپاش مەرگیشی هەر داوایلێدەکەن وەکو فریادڕەسێك بێتەهانایانەوە، بەلاّم ئەفسووس ئێستا (پیران و داریکەلی)ش ئەزیەتبارن بە بۆنەی کۆچی دوایی شێخی نەمرەوە.

- یەکێکیتر لە شاعیرانی ناوچەی گەرمیان (شێخ ئەحمەدی شاکەلی)یە، ساڵی ١٩٠٢ لە گوندی شاکەل لەدایکبووە و ساڵی ١٩٨٢ کۆچیدواییکردووە.[*]

گەرچی شاعیرێکی ئەهلی تەسەوف بووە، بەڵاّم بەهۆی شۆڕشەکانی شێخی نەمرەوە باهۆزی نیشتمانی نەتەوایەتی پانتایی خاکی کوردستانی گرتبووەوە، ئەو سۆزە لەناو شیعرەکانی شێخی شاکەلیشدا رەنگیداوەتەوە و قەڵەمڕێژی بە هەستێکی پاك و بە زمانێکی رەوان، چەند شیعری جوانی پڕ واتادار بەشداریکردووە لە خەباتی سیاسی گەلەگەیدا، بە جاڕدانێك هاواردەکات و دەڵێت: گەر نیشتمانێکی ئازاد و سەرفرازم نەبێت، ئیتر چی شادی و خۆشییەك بە خۆمەوە دەبینم، دەبا لەڕێگەی خوێندن و زانستەوە هەوڵی بەگەیشتن بەو ئامانجەمان بدەین، گەر زاست و زانیاریمان نەبێت، ئەسپی کەحێل و بڕنەو لەکوێ دەتوانن پاسەوانی ئێمە بکەن. وەکو لەم شیعرەیدا دەڵێت:

گیان فیدای دەست و قەڵم بێ، ئەسپ و زینم بۆ چییە
خەت ئەگەر هیممەت بکا، بڕنەو کڕینم بۆ چییە
نامەوێ ئەسپی کەحێل و بڕنەوی کورتی جوان
پاســـەوانیم گەر نەکەن، حیلە و تەقینم بۆ چییە
کوێر و کەڕبم گەر لە راسی راستی خۆم لابدەم
جیا، لە قـــانوونی خـودا ئایین و دینم بۆ چییە
نامەوێ دەستێ کە یاری بێدەسکی پێنەدەم
بـــــازووی ئـــــاوا بێ هێز و تینم بـــــۆ چـییە

هاوزمانم لێو بەبار و تاڵە حاڵی ماڵەکەی

پڕ گەرووی گریـــانە ئەو، من پێکەنینم بۆچییە

ئارەزووی بەرزی وەتەن بۆیە بە فەرزم خوێندووە

شاد و بێغەم تیابژیم، هـــاوڕێی غەمینم بۆچییە

نیشتمانێکم نەبێ ئاسایشێکی تیابکەم

سەرسەری بم نامەوێ ئەو حـــاڵە، ژینم بۆچییە

شانشینە نیشتمانم، حەیفە پاساری نەبێ

بـــاغ کە پـــەرژینی نەبوو، میوەچنینم بۆچییە

شاری بانە و سابلاغم کەیفی هاوینانمە

گەر مەزەی پـــایز نەبەخشێ، خانەقینم بۆچییە

گوێت لە دەنگی مایدەشتە بانگ لە زاخۆ چۆن ئەکا

گەنم و جۆی خـۆم دائەچێنم، چینی چینم بۆچییە

پڕ بەپێ کالاّی خۆمە، نامەوێ جزمەی کەسێ

شاڵەکەم بۆتـــانییە، فاســـــۆنی شینم بۆچییە

چەندە لام خۆشە کە لاوەکانی شاکەل بانگئەکا

من بەبێ لاوێکی خۆم، ئەم شکڵە ژینەم بۆچییە

❊❊

ئەو باهۆزە سیاسییە بووە کە شاکەلی شاعیر جگەلەوەی هانادەبات بۆ زانست و بە مەعریفەکردنی نەوەکانمان، باسی ئابووری وڵاتیشی لەهەر ناوچەیەك وەکو سامانێکی نیشتمانی و خۆبژێوی بە بەڵگەهێناوەتەوە، سەرەڕای دیاریکردنی نەخشەی خاکی کوردستان، لە مایشدەشتەوە بۆ ناوچەکانیتری کوردستان.

- هەروەها شاعیرێکیتری دەڤەرەکە کە (شێخ بابا عەلی کوڕی عەبدوڵلا)یە،* ناسراوە بە (بێدار)، ساڵی ١٨٩٤ لە ئاوایی گەورەی بناری بنکورەی ناوچەی خانەقی لەدایکبووە و ساڵی ١٩٤٩ کۆچیدواییکردووە. بەشێکی زۆر لە شیعرەکانی نیشتمانی و نەتەوایەتیی لەخۆگرتووە و هاوبەشی خەباتی سیاسی و کوردایەتی لەخۆگرتووە و گوێی بە دەنگ و هاوار و ناڵەی نیشتمانەکەی زرنگاوەتەوە کە داد و فیغانی لە دەست جەور و ستەمی داگیرکەرانە و خۆفرۆشی کاڵفامی هەندێك لە کەسانی نەتەوەکەی، بە زمانی حاڵ، دەردە دڵی خۆی دەڵێت:

ناڵەیەکی زۆر بە سۆز دێ وا لە جەرگم کارئەکا

تێگەیشتم پڕ بەدەم، خاکی وەتەن هاوارئەکا

داد و فریادی لە ئیشی سوحبەتی بێگانەیە

دەردەدارە، بۆیـــە نـــاڵەی عـــالەمێ بـــێزار ئەکا

بانگ ئەکا ئەی ئەهلی غیرەت باری عوسرەت لابدەن

دەوری غەفلەت و زیللەت تەواو، فیکری میللەت کار ئەکا

ئەی وەتەن رۆح و دڵ و گیانت لەسەر دانێم کەمە

چونکە مـــایەی فـەخری ئێمەی، کێ لە حەق ئینکارئەکا

خاکی رەنگینت ئەگەر بێ رەنگە، گاهێ حەقیەتی

وا ئەبینێ ئەهـــــــلی خۆتە و خزمــــــەتی ئەغیارئەکا

لاوی خۆم بار و دیاری خۆت لە دەس قەت دەرمەدە

رۆژی رەش پێکەوە بـــــــژین، کێ دەردی کێ تیمارئەکا

گەر رەقیب سەدجار بتلاوێنێ بەدەم، باوەڕمەکە

پاسی نانی خۆی هـــــەمیشە وەك ســـەگی هەوشار ئەکا

چەند دڵ پڕ ئێشە (بێدار)، دەستی ناچێ ناعیلاج

رۆژی ســــــەد نەفرەت لە یـــــاری ناحـــەزی غەددار ئەکا

**

بێداریش لە هاواری گەلەکەیدا بەئاگاهاتووە و داوا لە لاوانی گەلەکەی دەکات بەئاگابێنەوە و خزمەتی بێگانە نەکەن، ئیتر زەمانی بێدەنگی بەسەرچوو، نیشتمان زێدی شانازیمانە و بە قسەی پڕوپووچی بێگانە هەڵمەخەڵەتێن، دەبێ ئێمە یەکگرتووبین و لە رۆژانی تەنگانەدا بە یەك بیر باوەڕ یەکبگرین.

- شاعیرێکیتری پێشمەرگە و دۆستی شێخی نەمر (مەلا ئەحمەدی سپیسەر)ە،* ساڵی ١٨٨٤ زاینی لە گوندی سپیسەری ناو هۆزی زەنگەنە لەدایکبووە، ساڵی ١٩٥٨ کۆچیدواییکردووە.

مەلا ئەحمەد لە شەڕی (ئاوباریك)دا بەشداریکردووە و چونکە ئەو رۆژگارە مەلای گوندی ئاوباریك بووە و بەچاوی خۆی هەموو رووداوەکانی ئازایەتی و نەبەردی پیشمەرگەکانی بینیوە، لە داستانێکی (٢٠٠) بەیتیدا بۆمانی تۆمارکردووە، وەکو مێژوویەکی راستی ئەو جەنگەمان بۆدەگێڕێتەوە، هەڵبەتە داستانەکە بە زمانێکی سادە، یەك بەیەکی پەلامار و کوشتن و کوشتارییەکانمان بۆباسدەکات، دەبێت ئەوەیش بوترێ مێژوو زۆر بەکەمی باسی ئەو جەنگەی کردووە، رەنگە ئەویش مەبەستی تایبەتی هەبووبێ، ئێمە لێرەدا ناتوانین هەموو شیعرەکە بخوێنینەوە، بەڵام چەند بەیتێك لەو داستانە بەنموونە دەهێنینەوە سەرەتا دەڵێت:

رۆژێ بــە قـــودرەت، بینای بەهـــــتریـــــن
ئاوازە و شـورەت، کەوتە رووی زەمـــیـــن
شێــخ مەحمود، کێشای ئۆردیــگای عەزیـم
پەی دەعوای عێراق، ئیسلامان عەمیــــــم
ئـۆردیــگای کیـێشا، داوای حـــەق مەکەرد
کەرد وەئیختـــیشاش، (تالیب) نـامـــــەرد

مـــــەنـــزڵ وەمـــەنزڵ، قـۆناغ وەقـــۆناغ
لـــە شـار پێنــــجوێن، تا وەقــــەرەداغ
ئیســــلامـان تــەمام، تابیـع ئەو بیــــن
نە خۆشی و شادی، بێ خورد و خەو بیـن
بێ خەوفـەن نە جەنگ، هەزارەن هــــەزار
گشـت پڕ زۆر و زات، دێر و خـونـخـووار
تـــا یـاوان وەمـــوڵك، تـاڵەبان پـەڕ فەن
پـــارەپەرسـتان، گشــــت خـــادم وەزەن
بشین وەسەروەخت، شێخ مەحمود پاکدیـن
سوپای شیـرینی، چـوون شێری غـۆریــــن

یا لە بەشێکیتریدا دەڵێت:

قەریەی ئاوباریــــــك، تا کانی قادر
ساکین بی لەشـکر، هەرچی بی حازر
ئەهالی قەریە، مسکێن و شێـــخان
خزمەتگوزار بین، وەڕۆح و وەگـــیان
وەخـتێ نـا غافـــــــڵ، پەیدابی هـاوار
ئەو تیپ و ســــــوپا، یەکــــجار سوار
گشت کەردەن یەڵغار، ئەو سوپا و تەیار
تا جـاگەی هـــــــاوار، نەگـرتەن قەرار

درێژەیپێدەدات و دەڵێت:

جە زەمیــن ئەســکەر، جە سەما تەیــار
گــولله و مەتەرلــۆس* مەرێــزیا وەوار
زات شێخ مەحمود، شی نەفکـر و هۆش
غیــرەت ئیســـــلامی ئاورد وەجـۆش
واتـــش یاکەریـــم کانی کـۆی کەرەم
پادشای شـــاهـــان راحیم و ئەرحەم
بێ دەلـیل ئـــامام پـەی داوای عێراق
وێـــتی ئاگادار فــــەرد تەنـــهای تاق

هەروا درێژەی هەیە و دەڵێت:

ســـابا شێخ مەحمود چەنی، چەن نەفەر
بـــمانۆ نـــەی جـــا نەوێـــنۆ زەرەر
بشـــین وەسەروەخــــت باقی داسـتان
جـــە نـــام قـــەریـە بـــاقی دلـێران
چێـش ئاما وەسەر وە دەست دوشـــمن
تەیـــارەی ئینـــگریز قەحـــپەی پڕ فەن

جـــەی تـەرەف سیا چەنی ئەهـــالـــی

ئـەو قــەریە و قەلـعە نەکردەن خالـی

بەمبو و مەترەلـۆس مەڕێــزۆ وەوار

چـون تاب و تەرزە جە فـەصڵی بەهار

کەس جورئەت نەکرد جە ترس مەلعون

سەرکێـشۆ وە بەر جە خـانەی بگون

وەوێنەی واشە، سـەوگـەنـد* و کەلام

کـوورەیـــان مەگیـلاۆ وەشـــوێن زەلام

بەمبـۆ مەترەیلـۆس وەهــەرجـا مەدا

مەکـردن ئەو جا شین و واوەیـــلا

جـە نرکـە و ناڵە کەڕمەکردوە گـــۆش

جە خەوف و دەهشەت عەیالان بێهۆش

هەروەها دێژەی پێ دەدا و دەڵێت:

دوو سـوپا وەیەك جـــۆش ئاورد وەجۆش

تریـقەی مەترەلـــۆس کەڕ، مەرد گـۆش

نە هــەردوو تەرەف بی، یە قـال و قــیل

مەواچـــی ژەنـیا، ســـور ئیـســـرافـــیل

دەنـــگ مەدا بۆمبا، لە دەوری دونـیا
چەن خانە و چەن کۆشـك کرد وەتوتـــیا
هەی بکوژ بکوژ، جـــە مەیـدان کـــار
گولله مەواری چـــوون تەرزەی بەهـــار
هەشـت سەعات جە رۆژ، تەیاران وەقین
مەواران جەســـەر بەمـــبۆی سەهمگین
تەیـــارە زانـــاش وەختیٚ شــــەو ئاوا
مـــۆفـەق مەیــۆ شێـخ جەو دومـــا
سیٚ بۆمبەی عەزیم، خست وەڕووی زەمـین
دنیا بی تاریــــك، عالەم بـــی غەمگـین
جە تۆز و غـــوبار، کـەس کەس نەئەدی
واتـەن ڕۆز نەمەن، تا وە ئـەبـــــەدی
تومەز وەحیلە کەرد، تـۆز و غـــــوبـار
شـــەب ئاورد وەسەر، ئی عالەم هـەژار
جەو تـــۆز و غـــوبار، هجـوم ئـاوەردەن
سیٚ حەوشـەی خاڵی، وەبێکەس گـرتەن
ســیٚ ســـواری ئەسکەر بـۆری ئەژدەری
سەرخـۆش و سەرشێت، ئەقڵ سەرسەری
ئـەمر هجوم دا، پەرێـی رەزمە گـــاھ

داخڵ بیـــن وەناو، تیـــپ کیــنە خواه
ســێ حەوشە گرتەن، چۆڵ کەردن وەزۆر
پەنــهان جە بەین، ســـوپاهــان بـــــەور
دەست وەپای تفەنــگ، نە هەردوو سوپا
گـــــوللەباران بی، نەڕووی رەزمە گــا*
یەك زەنـــی فەقیــر، جە هـــەوەڵ گیان
رەمکەرد جەو مەکان، پەی جاگەی پەنهان
یەك سوارەی ئەسکەر، نیشت وەپای تفەنگ
یەك دەســت ئەو ژەن، نەوجا کەردەن لەنگ

لەکۆتاییدا دەڵێت:

تا ئـــاخـورلئەمر، ئەعجاز پـــاکـــــان
وەزیکر و تەوحید، گــشت شەرەف پاکان
شکست ئاوەردەن، بەڵــێ کام شکـــست
قەتڵ عـام کریا، تایفەی پـول پەرســـت
هەی سوار، هەی سوار، کوردان بی پەیا
ســواربن عەشـــــرەتان، دوژمنان شکیا
چرپەی پیــادە و خـرمەی پای ســـواران

تاودا بـــێ لێـشان، چـــون باد و بـاران

سـەدای هەی بکـــوژ، جە مەیدانی کار

دەنـــگی سـەڵاوات، لاڵەی زامـــــدار

وەشکـست بــەردەن، تاقـمی فەیـسەڵ

ئەو نیـــــــازەی بویان، بردیانە ژێرگـڵ

کــشانـــە دواوە، عەســـکەری وەتـــاو

کـــــەوتنــە شـــوێنـیان، وەك بەرازەڕاو

مەیاوان پێشان، کــــوردان جەڕووی قار

ئەلبیـــــسە و تفەنگ، ئاوەردەن وەبـــار

جەی تەرەف شێخ، نەو باغچە و گوڵـزار

هوجـووم ئاوەردەن، کەردەن وەیەڵـــغار*

هیچ خەوف و دەهــشەت* ناوەردەن وەیاد

ســـوپای عەسکەری، یەك سەردان، وەباد

دەنگ سەڵاوات، قاو و هەی بگیـــــر

بی وەبەشارەت، چـوون یەوملبەشیـــر

وەوێــنەی پڵنگ، لە قەلبی لەشــــکر

فەتح کردشــــان، هیچ نەدیـن زەرەر

شـەب ئاما وەسەر، تاریـك بی جیهان

فایق و شســت، هیـچ نەبـێ بەیـــان

وەهــــەرجا مەشی، ناڵەی زامــــداران

مـــەلالانەوە، مەواتەن ئەلـــئەمـــان

یەکێ پا شکاو، یەکێ جان مەغــدوور

یەکێ بێــزار جەگیان، مەگـــریا زەروور

جەو شــــەب تاریك، لاشــەی زامداران

دڕیا و پێچـــیا، چـــوون گـوســـفەندان*

بەیداغ تەســـلیم، کــــردشـــان وەپـا

تا ســوبح رەوشــەن، نیشتەن نە ئەو جا

نەی تەرەف شێخ، چەنــی سوپای وێــش

داخل قەریە بی، بێ خەوف و ئەندێـش

جـبەخانەی شەڕ، بار کریا یەکـــــسەر

نەو قەڵــعە و قــەلا، بریا وەر وەبـــەر

ســـوار بین وەجەمع، تەمــام لەشــکـــر

** 

وەکو لەپێشدا ئاماژەمانپێدا ئەم جەنگنامەیە دوو سەد بەیتە، زۆر درێژە و نەمانتوانی لێرەدا هەموو شیعرەکە بخوێنینەوە، بەداوای لێبووردنەوە..

- یەکێکیدی لە شاعیرانی ئەو سەردەمە (شێخ موحەمەدی خالیسی کوڕی شێخ رەزای تاڵەبانی)یە کە سەردەمێك قایمقامی شاری کفری بووە، لە شیعرێکی درێژدا کە بۆ شێخی نەمری گوتووە و لە بەشێکی ئەو شیعرەدا دەڵێت:

لەسەر ئەم مەسرەعە لادەم بچم بۆ مەسرەعی سانی*
بڵێم ئەی پاســـــەوانی میللەت و رێگەی موسوڵمانی
وجوودت فەخرە بۆ من، چونکە لای من فەخری کوردانی
نەوەی کاك ئەحمەد و نوتفەی حوسێن و شێری یەزدانی
(ئیلا ئەی کوشتە پەیکان، هجرانت دڵ ئەخوان
ئیلا ئەی خـــــەستەی هیجران، رۆیت پیر کەنعانی)
(توبا یاران همان کردی، باید کرد دشمن
تو با دوشمن چناز کـــردی، کە وی را، رانجحە تنوانی)
هەتیو چیت وت، زمانت وەرگەڕێ، غەڵەتێکی گەورەت کرد
لەلای خۆت شـــاعیری، هێشتا قسەی پیاوانە نازانی
خراپی چاکەیە، زامی شیفایە، حیدەتی حیلمە
جنێو فەخرە تـــالآنی عەتایە، عــــەفووە عینوانی
کەرەمکار و وەفادار و وەلیێ خولْق و عەلی کردار
تەبیعەت چـــاك و نییەت پاك و دڵ پڕ نوور و نورانی

فەلەك مل شۆڕ ئەکا، ئەمڕۆ لە ژێر پێی ئەسپی شێخ مەحمود
مەلەك مەجبوورە ئەمڕۆ بۆ ئیتاعە و حوکم و فەرمانی
ئــەوەندە باری تەعنە کەوت بەملدا (خالسی)ی ئەمڕۆ
ئەهـــــاتە خزمەتت قوربــان، وەلیٚ زامدارە سەرشانی

** 

لە چوار خشتەکییەکیتردا بۆ شێخی نەمری وتووە و دەڵێت:

سەر کە بیٚ مشکی و کلاٚو بیٚ، سەرفرازیم بۆ چییە
دڵ وەکـو شووشەی شکاو بیٚ، دڵنەوازیم بۆ چییە
پێت عەتاکردم بەڕاستی حەقی خۆم و باوکم
تـۆ کە (مەحمود)ێکی وابی، من ئەیازم بۆ چییە

** 

- شاعیرێکیترمان، حوسێنی کوڕی عەبدوڵلاٚی کوڕی شوکری عەزیز میرزایە، ناسراو بە (دەروێش حوسێن)ەو دەوروبەری ساڵی ١٨٨٤ لە شاری سنە لەدایکبووە، بەهۆی گەڕانی بەدوای خوێندن و زانستدا چەندین شار و گوند گەڕاوە، سەرئەنجام لە شاری خانەقی نیشتەجێبووە، دەروێش حوسێن پیاوێکی نیشتمانپەروەر و هاوڕێی گیانی بەگیانی شێخی نەمر بووە، ساڵی ١٩٧٨ کۆچیدواییکردووە.*

بەداخەوە بەهۆی سیاسەتی رەگەزپەرستانەی بەعسەوە بەرانبەر کوردی خانەقی زۆری نووسینەکانی دەروێش حوسێن تیاچووە، لەم شیعرەدا بەزمانێکی سکاڵاوە دەڵێت:

بۆی کزەی نەسیم، پێشخانەی شەفەق
بـــــدا لە دەماغ، کوردی کەللەشەق
بەڵکو ئــەو هۆشە، بێتەوە سەرتان
بۆتە تەفرەقە و دەردی بێ دەرمان
رۆژێ بێتـــــەوە، رۆژی ســـــــەداقــــــەت
یەك رۆح و یەك گیان، بۆ جەمعی میللەت
مردن و ژیان، لایان یـــــــەکسانبێ
مادام کە کوردن، هیچ فەرقیاننەبێ

**

لە شیعرێکیتریدا دیسان ئاگانامەیەك بەگوێی کورداندا دەدات و بە زمانێکی رەوان بانگیاندەکات و پێیاندەڵێت: تا دووبەرەکی و خۆخۆری لەناوتاندا هەبێت، هەر بەدەست تورك و عێراق و ئێرانەوە داگیرکراون و وەکو دەڵێت:

ئەی قەومی نەجیب و شەجیع و شەریف

ئـــــەی گرفتاری سیاســـــەتی ســـــەد حـــەیف

ئەی ئەمیری نیفاقی هەر سییان

گاهێ بە دەستی تورك و گاهێ بە دەست عێراق و ئێران

ئەمڕۆ ڕۆژی جەژنە و مەوسمی ئازادی

من دڵم وا لە گـــــریـــــانە بۆ میللەتم وا نیمە شادی

باعیسی ئەم قەومە چییە، وا دەربەدەر و تەفریقەن

دەســــــــتی نیفاق و مەعـــاشــــە و زۆڵی وەتەن

چۆن سەر ئەکەون، ئەی ئەسیری تورك و ئێران و عێراق

عیلمی جـــــەهـــــل و بێ ئیـــــتیفاق و نیفـــــاق

ئیتیفاق بێنە عەزیزم، نیفاق زەرەرتانە

ئەو حـــــەیاتە ســـــەرف کەن، لە ڕێگای ئەم وەتەنتانە

دەسا هەڵسن ئەی گەنجانی کوردستان

تــــاریخی عـــالەم وا دیارە، شــــاهیدە بۆ رابوردووتان

زوبانی حاڵی زەوقی هەر وریا، بێنەوە ئەی قەومەکان

فرســــــەتی پێشوو رۆی شتی، تازە هــــاتووە دیسان

**

جگە لە شیعری شاعیران کە باسمانکرد لە ناوچەی گەرمیاندا بەدەیان بەیت و بالۆرە و حیکایەتی بەرئاگردان و لایەلایەی دایکان بۆ کۆرپەلەکانیان کە بە باسەکانی ئازایەتی و لێهاتووی و خۆشەویستی شێخی نەمری لەخۆگرتبوو، سەرەڕای بەیت و گۆرانی بەداخەوە کەمتر ئاوڕ لەو هۆنراوانە دراوەتەوە و کۆنەکراوەتەوە، لێرەدا چەن بەیتێکی کەم دەهێنینەوە کە گوتراوە:

باوکم شێخ مەحمود، پشتوێن چل گەزی
ریشەی مشکییەکەی، لە سەنگاو بەزی

❊❊

هەی داد هەی بێداد، نەمــەنەن هۆشم
شێخ مەحمود یەخسیر، بۆیە رەشپۆشم

❊❊

بابۆی شێخ لەتیف، زەعیمی کوردەن
وەرانــــوەر دوژمن، وەدەســــتوبردەن

❊❊

ئاخم پەرێ شێخ، بەند و یەخسیرەن
جە شـار بەغا، دەســت وەزنجیرەن

هیوادارم بەم باسە کورتەم توانیبێتم کلاۆرۆژنەیەکم کردبێتەوە بۆ لێکۆڵینەوەی (شیعر و ئەدەبیاتی گەرمیان) لە (شۆڕشەکانی شێخ مەحمودی نەمر)دا.

•••

پەراوێزەکان

١) دیوانی مەلا حەسەنی نەوحی: کۆکردنەوەی- هەردەوێڵ کاکەیی،ساڵ و شوێنی چاپ پرۆژەی ئینستیتوی کەلەپووری کورد، ٢٠١٠، سلێمانی، لاپەڕە (١٢٨).
٢) هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٢٢٠).
٣) دایاخ، یشتوپەنا.
٤) دیوانی مینەجاف: کۆکردنــەوەوی مــستەفا نــەریمان، پێــشەکی دکتــۆر حەسەن جاف، ساڵ و شوێنی چاپ، بەغدا، چاپخانەی جاحچ، ١٩٩٠، لاپەڕە (٧٧).
٥) سەرچاوەی پێشوو لاپەڕە(٧٠)
٦) دیوانی شێخ ئەحمەدی شاکەلی: ســاخکردنەوە و پێــشکەی بــۆ نووســین- هاشم عاسی کاکەیی، ساڵ و شوێنی چــاپ ، لــە بلاۆکراوەکــانی کۆمەڵــەی

ڕووناکبیری و کۆمەڵایەتی کەرکووك، چاپی چوارەم، ٢٠٠٩، لاپەڕە (١٢٤).

٧) بەشێك لە دیوانی شێخ بابا عەلی بێدار: کۆکردنەوە و لێکۆڵینەوەی برایم باجەلاّن و پێشەکی و پیاچوونەوەی ئەحمەد **محەممەد** قادر، ساڵ و شوێنی چاپ،چاپخانەی ڕەهەند، سلێمانی، ٢٠٠٣، لاپەڕە (٥٧).

٨) چەردەیەکی مێژوویی دەڤەری گەرمیان: کۆکردنەوە و ئامادەکردنی، ساڵح هەلاج، ساڵ و شوێنی چاپ، چاپخانەی گەنج، ٢٠١١، سلێمانی، لاپەڕە، (٢١٨).

٩) مەتەرلۆس: ڕەشاش، دۆشکە، جۆرێکی چەکە.

١٠) سەوگەند: سوێندخواردن.

١١) ڕەزمەگا- شەڕگا، مەیدانی جەنگ

١٢) یەڵغار: غاردان بە ئەسپ.

١٣) دهشت: بێ ترس.

١٤) ئاژەڵی شیردار، مەڕ+ بزن.

١٥) سەرچاوە شێخ مەحمود  لە شیعری کوردیدا / لەتیف بەرزنجی، بەرگی یەکەم لاپەرە/ ٥٦

١٦) گوڵبژێرێك لە شیعر و شاعیرانی گەرمیان: ساڵح هەلاج، ساڵ و شوێنی چاپ (٢٠٠٨) کەرکووك، لاپەڕە (١٢١).




## کفری، دڵدارە هەمیشەییەکەم

## نیشتمان جەمیل گەرمیانی

دڵدارە خنجیلەکەم..
عیشقیکی پەنهان بوونم ئەتەنێ و
روحم ئەکاتە چرایەك لە چراکانی
"محە کۆم تەپی" بۆ کۆلانە تاریکەکانی دەدە و عەجەمەکان،
شارە بینازەکەم کفری..
لە شەوێکی درێژی زستاندا بەنێو بیرەوەرییەکانی ژیانی
"مستەفا نەریمان"دا پیاسەدەکەم،
یەکبەیەك محەلەکانی عەجەم و دەدە و ئیمام محەممەد ئەگەڕێم،
بەشوێن پێکانی منالی باوکما
ئەگەڕێمەوە بۆ سالانی سییەکان و ئەبمە شۆڕەژنیکی سەلار و بە
بووکێنی،
لە قزلەرقەلعەوە دیمەخوارێ
شوڕەسوارێکی جوامێر دەستمدەگرێ،
بەژێر تەقالتییەکەدا ئەمهێنیتە ناوشارەوە

بۆئەوەی نۆبەرەکەم شۆڕەسوارێکی وەکو "برایم خان"
دوژمنبەزین بێ،

هەناسەکەم کفری..
لە چەمەکەی قوشەچاپانەوە بە هەنگاوەکانی حەمەداماو
پیاسەیەکی ساڵانی شەستەکان ئەنووسمەوە،
هەڵمەت و شاکەلی لەبەرەبەیانیکدا دێنەوە
بۆ شاری وەزیران،
پەیامی گروپی شیعری کفرییان پێیە..
کۆپلەیەك لە دیوانی "خوا و شارە بچکۆلەکەمان"
لە ریزەکانی بەیانیانی قوتابخانەی رووناکیدا
مامۆستایەکی کوردپەروەر
بە قوتابیانی ئەڵێتەوە
کفری پڕدەکەن لە ئاوازی خۆڕاگری،

شارەکەم..
ئەگەر کەسێ شاهیدی خۆڕاگری تۆ نەبێ
ئاسکی کفریت هەرگیز خیانەتت لێناکات،
باوەشاسوارت بەوشێوەیە باوەش بۆ شەهیدانت والاناکا،

لە خوێنی"حوسە شێتی سەربڕاو"ەوە
زوڵم بووە میوانیكی ناوەختی تۆ،

شارەكەم..
شنایی بیناییم
ئەی سەبووری دڵی شەیدام
ئەزانم چەن نیگەرانی
تێئەگەم لە رەنگزەردی پاركی شار
لە كزی گڵۆپی سەرشەقامەكان
لە سووتماكی چاوی باخەكان
لە داماویی باوەشاسوار
لە وشكبوونی دلی قوشەچاپان
بڕوابكە لەمانە هەموو تێدەگەم ئازیزەكەم،
بەس ئازیز گیان دڵتەنگمەبە،
چاوەڕوانبە..
خالید گەرمیانی ئێوارانێ
بەئیختیفا دێتەوە شار كوڕە قائیمقامێكی ریسوا دەستگیردەكا
مەهابادیش لە دەفتەرە بچووكەكەی یادەوەرییەكانیا
ئەم چالاكییە تۆماردەكا،

بێباکیشە گەرساڵێکیتریش لەژێر ئەشکەنجەی دوژمنا

جەلاد جگەرە لەسەر سنگی خامۆشبکا،

دڵدارەکەم..

شاری وەزیرانە وێرانەکەم،

خۆ هەرکەسێ لە ملەی ناساڵح سەرکەوت

هەرگیز تۆ ناناسیتەوە،

جارێکیدی بەمردوویش بۆ باوەشت نایەتەوە

بۆ خزمەتێ، بۆ هیمەتێ

هەرگیز هەنگاوێ هەڵناگرێ..

چاوەڕوانبە رۆژێ نەکی ئاوە سوێرەکەت دەیانگرێ

نیشتمانە رەنگزەردەکەی

دڵە بێوەرەکەم،

لە گڕەی هەناسەتا رەنجبێوەریت سەردەکاتە گشت کوچە و کۆلانێکتا،

گەردەلوولی توڕەبوونت خۆڵ دەکاتە چاوی مێژوو،

نەفرەت لە "مەدینە وزەرا"ش کە کرا بە دەروازەی دۆزەخ

باوەشاسوار پەست و تووڕە زیندوویەك لەباوەشیا

جێناکاتەوە..

شەهیدانی داستانی قاتەکەش هیندە پەستن،
ئیدی نە دێنە خەونی شار و نە لەبەرپێی برایم خانیشدا
هەڵدەسن.
مەخابن کفرییەکەم مەخابن..
تۆ بۆ هەندێ دۆزەخیت لە دوورەوەش بیرەتدەکەن
بۆ هەندێکیش باوەشێکی دایکانەیت و کەچی نەفرەتت لێدەکەن
من تێناگەم؟
سیابەختیت بە بەدبەختی کام بێوەژن پێوراوە؟
ئاوارەیت لە ژینی کام ژنی بێدەرەتان هەڵکێشراوە؟
کە ئێواران عەلی مەردان بەگوێماندا ئەچریکێنی
" هەستن با بڕۆین، بکەین تەماشا
لە باخچە و مێرگوزاری پاشا"
کە بەدەم پیاسەوە دێین تیرتێر بکەین تەماشا
کەچی بووە بە زبڵدان باخچەکەی پاشا!!!

•••

بەشداربووانی خۆشەویست،

خوشك و برایانی بەڕێز..

دوو رۆژ لە دیداری یادی پڕشکۆی شێخی نەمردا بووین کە ٩٠ ساڵ پێش ئێستا هاتبووە کفری و کۆنگرەی بەستبوو و تیایدا کۆمەڵێك بڕیاری گرنگی دابوو.

لەم فیستیڤاڵەشدا کۆمەڵێك بابەت و توێژینەوە خرایەڕوو، قسە و گفتوگۆیان لەسەرکرا کە بوونە مایەی دەوڵەمەندکردنی فیستیڤاڵەکەمان.. لەمەشەوە کۆمەڵێك سەرنج کۆبوونەوە، ئێمەی لیژنەی باڵا وەکو راسپاردە دەیخەینە بەردەستی ئێوەی بەڕێز بەو ئومێدەی بەدواداچوونیان لەسەربکرێ و بەرهەمێکی لێبکەوێتەوە بۆ خزمەتکردنی ئەم شارە کە چەند رابردوویەکی پرشنگداری هەبووە، کەچی سەرەڕای ئەوەی بۆی کراوە و بۆی دەکرێ هێشتا وەکو شارێکی خامۆش دیارە.

سەرنجەکان:

- لەوانەیە دوو رۆژ بۆ باسکردنی یادی هاتنی شێخی نەمر بۆ کفری و بەستنی کۆنگرە لەوکاتانەدا کە رووداوی سیاسی گرنگ بوون، کەمبووبێت، لەگەڵ ئەوەشدا تاڕادەیەك کاتێکی باشبوو بۆ وورووژاندن و قسەکردن لەسەر ئەو رووداوە.

- فیستیڤاڵەکە سەرەڕای کەموکوڕی لەئاستێکی باشدا بەڕێوەچوو، لێکۆڵینەوەکان لە بایەخدان بەو رووداوە لەڕووە مێژوویی و سیاسییەکەوە لەجێی خۆیاندا بوون.

- وەکو باوە لەکوردستاندا ئاستی ئامادەبوون بۆ ئەمجۆرە بۆنانە وەکو پێویست نییە، بەڵاّم ئەمە کارناکاتەسەر ئامانجی کارەکە.

پێشنیارەکان:

- ئەم بۆنەیە دەقۆزینەوە تا بەرپرسان و لایەنە پەیوەندیدارەکان بڕیار لەسەر ئەوە بدەن رۆژی ۲۲/۹ وەکو رۆژی کفری دەستنیشانبکرێ، هەموو ساڵێك لەمرۆژەدا قسە لەسەر بابەت و بۆنە گرنگەکان بکرێ.

- کفری شارێکی کەلەپووری و شوێنەوارییە، داوا لە جکومەتی هەرێمی کوردستان دەکەین بودجەی تەواو بۆ کڕین و بایەخدان و مشتەماڵکردنی ئەو شوێنەوارانە تەرخانبکات و تیمەکانی شوێنەوارناسی و توێژەران زۆرتر لێکۆڵینەوەی لەسەربکەن تا لە رابردووی خۆمان باشتر ئاگاداربین و لەڕووی ئابووریشەوە خەڵکی بۆ گەشتوگوزار روویتێبکەن و ببێتە داهاتێك بۆ شارەکە.

- کڕینەوەی کەرەسە کۆنەکان وەك کتێب، دەستنووس، بەڵگەنامە، وێنە کە پەیوەندی بە شاری کفرییەوە هەیە.

- کۆکردنەوەی هەموو ئەو بەیت و شیعرە فۆلکلۆرییانەی ناوچەی گەرمیان و بلاّوکردنەوەی لەکتێبێکدا.

- دروستکردنی مۆزەخانەیەك بۆ شتە فۆلکلۆری و ئەتنۆگرافی و وێنەییەکانی گەرمیان و کفری.

بڕیارەکان:

- بۆ گرنگیدان بە ناوەڕۆکی فیستیڤاڵەکە هەموو بابەت و لێکۆڵینەوەکان لە کتێبێکدا چاپ و بلاّودەکەینەوە.

بە ئومێدی ئەوەین سەردەمانی ئایندە لە کەشێکی رازاوەتردا بەیەکبگەینەوە.

هەر شادبن..

**لیژنەی بالاّی فیستیڤاڵ**

**کفری**

٢٠١٢/٩/٢٣

- ئەم راسپاردانە لەلایەن م. عەلی پەرلەمانەوە خوێندرایەوە.

## سوپاس و پێزانین

سوپاس و پێزانینی بێپایانمان بۆ بەڕێز (هیرۆ خان) خانمی یەکەمی عێراق کە بودجەی غیستیڤاڵەکە و چاپکردنی ئەم کتێبەی بۆ دابینکردین.

لیژنەی باڵای فیستیڤاڵ

## لیژنەی باڵای فیستیڤاڵ

- د. بەهرۆز جاف
- شێرکۆ حسێن حامید
- م. عەلی پەرلەمان
- تالیب عەبدوڵڵا ئاعا
- شکور حەمەی هەیەر
- مەلا تەحسین گەرمیانی
- شەماڵ خورشید
- ساڵح هەلاج
- سامان کەریم
- مەلا نەجم



**تۆفیق وەهبی - شێخی نەمر**



**شێخی نەمر و کۆمەڵێك کەسایەتی گەورەی کورد**



**شێخی نەمر ، شێخ رەئوف ، فەتاح بەگی ئەمین عەتار ، ئەفسەرێکی ئەڵمانی**



**گوندی داریکەلی**




**مۆری حکومەتی کوردستان**



رشید زكي (سليمانيه)
مرخص كردستان جنوبي
Rachid Zaki Soulaimanieh
Délégué du Kurdustan Occidental

**کارتی نوێنەرایەتی حکومەتی کوردستان**

